کێرنۆت ڤیلهێلم

# شارستانییەت و مێژووی خوورییەکان

(یەکێک لە نەتەوەکانی کوردستانی کۆن)

وەرگێڕان لە عەرەبییەوە بۆ کوردی
ئارام جەلال حەسەن هەمەوەندی

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● **شارستانییەت و مێژووی خوورییەکان** (یەکێك لەنەتەوەکانی کوردستانی کۆن)

● نووسینی: گێرنۆت ڤیلهێلم

● وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە بۆ عەرەبی: د. فاروق ئیسماعیل

● وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی: ئارام جەلال حەسەن هەمەوەندی

● بابەت: مێژووی کۆن، شوێنەوارناسی

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● بەرگ: محەمەد ماشم

● چاپ: یەکەم ۲۰۰۹

● ژمارەی سپاردن: ٥٠٦

● نرخ: ۳۰۰۰

● تیراژ: ۱۰۰۰

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (۳٥٦)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# نـــاوەرۆك

# پێشەکی وەرگێڕ

خوریەکان بەیەکێك لە نەتەوە دێرینەکانی رۆژهەڵاتی کۆن دادەنرێت. کە خاوەنی شارستانییەتێکی مەزن بوونە لە ناوچەکەدا، بوونی پاشماوەی خووریەکان لەسەر خاکی کوردستان بەڵگەیە لەسەر ئەم راستییە، بۆ نموونە پاشماوەی هەریەکە لە شارەکانی نوزی یان گاسوور کە دەکەوێتە نزیك کەرکوکی ئێستا، واشوکانی کە ئێستا ناوچەی سەروکانی پێدەڵێن، دەکەوێتە خاکی کوردستانی سوریا.

ئەم کتێبە بە یەکێك لە نایابترین کتێبەکان دادەنرێت کە زۆر بەشێوەیەکی زانستیانە باسی لە خووریەکان کردووە، ئەو زانیارییانەی کە لەناو ئەم کتێبەدا هەیە شتێکی لەخۆوە نییە، بەڵکو گشت زانیاریەکان لەرێگەی هەڵکۆڵینە شوێنەوارییەکان و تێکستە مێخییەکانەوە بەدەست هاتوون.

لەماوەی هەزارەی سێهەمی پێش زاینی خووریەکان خاوەنی چەندین دەولەتۆکەی بچووك بوونە وەك نووزی و نارابخا لە کوردستانی عێراق، قەتنا و ئالالاخ و ئۆغاریت لە کوردستانی سوریا. بەڵام دواتر لەناوەراستی هەزارەی دووەمی پێش زاین خوورییەکان توانیان ئیمبراتۆریەتێکی گەورە پێکبهێنن کە بە مەملەکەتی میتانی ناوبانگی دەرکردبوو، سنووری ئەم مەملەکەتەش لە دەریاچەی وان تاکو ناوەڕاستی فورات و لەچیای زاگرۆس تاکو کەناراوەکانی دەریای ناوەراست لە سووریا گرتبۆوە.

گێرنووت ڤیلهیلم ئەم کتێبەی بە زمانی ئینگلیزی نووسیوە و دواتر لەلایەن فارووق اسماعیل وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی. منیش لە زمانی عەرەبییەوە وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. وەرگێڕانم بۆ ئەو کتێبە زیاتر بۆ ئەو مەبەستە بووە کە ئێمەی کورد پێویستە بە پوختی شارەزای شارستانییەتی باوباپیرانی خۆمان بین لەلایەك، هەروەك ئەمە وەڵامێکە بۆ ئەو

کەسانەی کە بە ئارەزووی خۆیان شت دەنووسن دەربارەی مێژوو و شارستانییەتی نەتەوەکانی کوردستان بەگشتی بەبێ ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەکی زانستی بخەنەڕوو. بەڵکو بەداخەوە ئەمانە شارستانییەتی کوردستانیان شێواندووە.بۆیە هیوادارم ئەوەی دەربارەی مێژوو و شارستانییەتی نەتەوەکانی کوردستان شت دەنوسێت با بەبەڵگەی زانستییەوە بینووسێت.

سەرەتای ئەم کتێبە بە دەروازەیەك دەست پێ دەکات دەربارەی چۆنیەتی ئاشنابوونی زانایان بەنەتەوەی خووریەکان، پاشان باسی مێژووی سیاسی و شارستانیەتی خووریەکان دەکرێت و لایەنێکی ژیانی و ئەدەب و هونەری شێوەکاری لای خووریەکان دەخەینە روو. لە کۆتایی ئەم کتێبە من خۆم چەندین وێنە و نەخشەی دیۆکیومێنتم بۆ ئەم کتێبە داناوە کە خۆی لەبنەرەتدا لەگەڵی دا نەبووە، بەجۆرێك کە وێنەکان پەیوەندی بە بابەتەکە خۆیەوە هەیە و زیاتر لە نرخی زانستی کتێبەکەیان بەرز کردۆتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە خوێنەر زیاتر شارەزای شارستانییەت و مێژووی خووریەکانی ببێت.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم کتێبە ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی رۆڵەکانی کورد زیاتر شارەزای نەتەوەی خوریەکان بن و بزانن کە خاکی کوردستان چ شارستانییەتێکی لەسەر بووە و باوباپیرانی کورد چ رۆڵێکییان هەبووە لە دروستکردنی شارستانییەت و مێژوو دا.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە سوپاسی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی بکەم کە یارمەتیان دام لە بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە، هەروەها سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە هانیان دام بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە و یارمەتیان دام لە تەواوکردنی ئەم ئەرکە پیرۆزە، هیوادارم بتوانم پاداشتیان بدەمەوە.

**ئارام جەلال حەسەن هەمەوەندی**

# پێشەکی نووسەر

خوورییەکان بەیەکێك لە گرنگترین نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن دادەنرێن. بەڵام بەهۆی کەمی سەرچاوەکان زانیاریمان دەربارەی زمان و مێژوو وشارستانییەتی خوورییەکان کەمە بە بەراورد لەگەڵ ئەو زانیاریانەی کە دەربارەی نەتەوەکانی تری وەك سۆمەری و ئەکەدی و بابلی وئاشووری و حیسی وکەنعانییەکاندا هەیە. کەمی زانیاری دەربارەی خورییەکان لەگەڵ ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە نەتەوەی خورییەکان هەیانە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆندا، بۆتە هۆی سەرهەڵدانی بیرورای جۆراوجۆر لە نێوان توێژەرەکان.

بۆیە پێویستە چاوێکی ڕەخنەگرانە بخشێنین بە سەر ئەو ئەنجامانەی کە لە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە خورییەکان بەدەست هاتوون، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار کە ئەمانەن:

١- زۆربەی ئەم توێژینەوانە دەربارەی چەندین لایەنی تایبەتمەندی جۆراوجۆری خورییەکان ئەنجامدراون، کە بۆتە هۆی ئەوەی هەندێك لایەنی تری گرنگ فەرامۆش بکرێت، کە ئەمەش بۆتە هۆی چاوپۆشین یان ون بوونی پەیوەندییە بەیەك بەستراوەکانی نێوان بابەتەکان خۆی.

٢- سەرەڕای ئەوەی کەلێکۆڵینەوە زانستییەکانی تایبەت بە خورییەکان ژمارەیان کەمە، ئەوا لەهەمان کاتیشدا ئەم لێکۆڵینەوانە بۆ ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا دەگەڕێتەوە. ئەم لێکۆڵینەوانە لەسەر بنەمای چارەسەرکردنی هەندێك بابەتی سەرەکی ئەنجام دراون، وە لەبەر ڕۆشنایی ئەم لێکۆڵینەوانە چۆنییەتی هەڵبژاردنی سەرچاوەکان و هەڵسەنگاندنیان دیاریکراوە. سەرەرای ئەوەی کە ئەم لێکۆڵینەوانە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆکەدا نرخە زانستیەکەی خۆیان لە دەست داوە، ئەمەش بەهۆی هەڵکۆڵینە شوێنەوارییەکان کە زانیاری نوێی تیادا بەدەست هێنراوە و زۆرێك لە بیروباوەرەکانی پێشووی بەهەڵە خستۆتەوە.

ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ پێشکەشکردنی وەسفێکی تەواوی لایەنی مێژووی سیاسی خورییەکان و کورتەیەك دەربارەی ژیانی ئایینیان. ئەمە سەرەرای ئەوەی کە لایەنەکانی تری شارستانییەتی خوریەکان بەشێوەیەکی خێرا ئاماژەی پێکراوە، هۆی ئەمەش لە برگەی تایبەت بەخۆی لەم کتێبە ئاماژەی پێکراوە.

لەم رێبازەی پێشکەش کردن و وەسفکردنەی تایبەت بە خوریەکان زیاتر مەبەستمان بریتییە لە روونکردنەوەی هێلە سەرەکییەکانی گەشەسەندنی مێژووی خورییەکان، ئەمە سەرەرای بەدەرخستنی جیاکەرەوەکانی شارستانییەتی خووریەکان. هەرچەندە ئێمە نەمانتوانیوە هەموو جارێك گونجاندنێك لەنێوان گشت گریمانەکان بکەین بۆ شیکردنەوەی سەرچاوەکانی تایبەت بە خوریەکان، بەڵام برێکی باشیان تەئکید کراوەتەوە و بووە بە حەقیقەت.

پێویستە لێرەدا ئاماژەیەك بە سەرچاوە پشت پێبەستووەکان بکەین. ئێمە لێرەدا زیاتر بەشێوەیەکی تایبەتی گرنگیمان داوە بە لێکۆلینەوە نوێکان، وە زۆر جار لێکۆلینەوە کۆنەکان بەشێوەیەکی ئاسان لەنێوانیان بەدەردەکەون. لەم رێبازەی هەڵبژاردنی سەرچاوەکان پێویستە تێگەیشتنێك هەبێت لە لیستی سەرچاوەکان، بەگشتی وەك تۆمارێکی دۆکیومێنتی تەواو وایە دەربارەی شارستانییەتی خووریەکان.

تاکو ئێستا نەتوانراوە بەشێوەیەکی تەواو زنجیرەی مێژوویی (کرۆنۆلۆجیا) لە قۆناغە زووەکانی مێژووی رۆژهەلاتی کۆندا یەك بخرێت. هەربۆیەش ئێمە لەم کتێبەدا مێژووی پەیوەست بەو ماوەیەی کە دەکەوێتە نێوان هەردوو سەدەی (١٥ ــ ١٣ پ.ز) کورتمان کردۆتەوە. بەڵام مێژووی پێش سەدەی (١٥ پ.ز) ئەوا لەگەڵ زنجیرەی مێژوویی کورت گونجاوە. هەروەها مێژووی پێش سەردەمی گووتییەکان (نیوەیەی یەکەمی سەدەی ٢١ پ.ز) بەنزیکەی (٦٠ ساڵ) کورت کراوەتەوە. ئەم کارەش بەپێی پێشنیاری (و.و.هالۆ ــ Hallo) بووە. لەکۆتاییی ئەم کتێبەدا جەدوەلێکی مێژووی هەیە کە ماوەی فەرمان رەوایکردنی مەلیکە ناوبراوەکانی ناو ئەم کتێبەی تێدا ریزبەند کراوە. گشت ژمارەکانی پەیوەست بە مێژووی رۆژهەلاتی کۆن ئاماژە بە سەردەمی پێش زاین دەکەن کە بە کورتکراوەی (پ. ز) دەربردراوە.

ناوی خوورییەکان بەشێوازە زاراوەییەکەی نووسراوە. بەڵام هەندێك لە توێژەرەکان سووربوون لەسەر وەسفکردنی دەنگەکانی ناو زمانی خووری بەدوو شێوەی دەنگدار و بێدەنگ (بزوێن و نەبزوێن) و هەوڵیاندا بۆ دەربرینی ئەم جیاوازییە دەنگییە بەشێوەیەکی نووسراو. بەڵام ئێمە پێمان وایە کە ناتوانین لەم کاتەدا بەشێوەیەکی تەواو گونجاو لەمە بکۆڵینەوە. ئەو سیستەمەی

نووسین و زاراوەیی کە لەم کتێبەدا بەکارهاتووە زیاتر تەئکید لەسەر پلەی بەهێزی وخاوی دەنگەکان دەکاتەوە، بۆ نموونە بەکارهێنانی ناوەکانی وەك : (خیپات ــ Khepat) نەك (خیبات ــ Khebat)، (کوشوخ ــ Kushukh) نەك (کوژوغ ــ Kuzukg) هتد....، ئەمە بێجگە لە دەربڕینی پیتی (ز)لە جیاتی (س) و پیتی (و) لەجیاتی (ڤ).

ژمارەیەك لە هاوڕێکانم دەربارەی ژمارەیەك لە کێشەکان ئامۆژگاریان کردم، هەروەك هەندێکیان بەشێك یان گشت کتێبەکەیان بەشێوەیەکی ڕەخنەگرانە خوێندووتەوە و هەڵەکانیان تیایدا راستکردۆتەوە.

هەربۆیەش لێرەدا بەپێویستی دەزانم سوپاس و ستایشی هەریەك لەم بەڕێزانەی خوارەوە بکەم : ی. بۆزە ــ J. Boese، ف. هاس ــ V. Hass، هـ. هۆفنر ــ H. Hoffner، هـ.م. هومل ــ Jr. H. M. Hummel، م. مایرهۆفر ــ M. Mayrhofer، و. ل. موران ــ W. L. Moran، و. ئۆرتمان ــ W. Orthmann، هـ. ئوتتن ــ H. Otten، ك. زکاگنینی ــ C. zaccagnini.

من پەیوەستم بە لێژنەی زانستی لە بەرلین هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە، کە لە بواری (کۆمەڵەی گشتی شوێنەوارەکانی زمانەوانی تایبەت بەزمانی خوریەکان) کاردەکەین. هەربۆیەش کۆبوونەوەکانی لیژنە و گفتوگۆکانیان سەبارەت بە خوریەکان سوودی زۆری هەبوو لەکاتی دانانی ئەم کتێبەدا و لە نرخی زانستی ئەم کتێبەی بەرز کردۆتەوە. هەربۆیەش لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە سووپاسی هاوکارانم بکەم لە لیژنەی زانستی لە بەرلین بۆ هەریەکە لە : ف. هاس ــ F. Hass، ی. رینجەر ــ J. Renger، م. سالڤینی ــ M. Salvini، ی. ڤۆن. شولر E. Von Schuler، ی. ڤێگنر ــ I. Wegner بکەم.

بەڕێز دکتۆر (ج ـ ر. بوین ــ G. R. Puin) تایبەتمەند لە لێکۆلینەوەکانی ڕۆژهەڵات لە (زانکۆی سارلاند) هەستا بە وردبینی لە ناوی شوێنەکانی ئەمڕۆ کە کاتی خۆی ناوی شارو مەملەکەتەکانی خوریەکان بوون. هەروەها بەڕێز (م. لایشن ــ M. Leicht) لەشاری ساربرۆککن هەڵستا بەدانانی نەخشەی جوگرافییەکانی هاوپێچ بۆ ئەم کتێبە، هەربۆیە من لێرەدا سوپاسی هەردووکیان دەکەم.

هەروەها سوپاسی هەریەکە لە بەڕێزان : خاتوو ( ی. م. مۆنیککە ــ E. M. Monecke و بەڕێز) (م. کلاین ــ M. Klein )لە شاری ساربرۆککن و بەڕێز (هـ. گراف ــ H. Graaf) لە هامبۆرگ دەکەم کە زۆر یارمەتیان دام لە کاروباری چاپەمەنیدا.

زانستی لێکۆڵینەوەی خوریەکان (خوریۆلۆجی ــ Hurritologie) زانستێکی سەربەخۆیە، ئەم زانستە لەناکاو لە ئەنجامی ئاشکراکردنی شوێنەوارێکی گرنگ سەری هەڵنەداوە، هەروەك ئەوەی سەبارەت بە سەرهەڵدانی زانستی لێکۆڵینەوە حیسییەکان روویدا، ئەویش لەکاتی دۆزینەوەی بەڵگەنامەکانی ناوچەی خاتووشا لە ساڵی ١٩٠٦ زاینی. بەڵکو سەرەتای سەرهەڵدانی لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە خوریەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٨١ زایینی هەروەك لە دەروازەی ئەم کتێبە ئاماژەی پێکراوە. هەربۆیەش دەتوانین ئەم کتێبە بکەین بە دیارییەك بۆ ئاهەنگی یادی سەد ساڵەی سەرهەڵدانی زانستی لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە خووریی‌یەکان.

گێرنوت ڤیلهێلم
نیسانی ساڵی ١٩٨١

# دەروازەیەك دەربارەی خوورییەكان

خوورییەكان[1] یەكێك لە نەتەوەكانی ڕۆژهەڵاتی كۆنن، بەڵام لێكۆڵینەوە مێژووییەكان بەشێوەیەكی كەم باسیان لەگرنگی ئەم نەتەوەیە كردووە. لە سەرەتادا شوێنەوارناسەكان گرنگی ئەم نەتەوەیەیان نەدەزانی. بەڵام لەدوای سەدەی ١٩ی زایینی گرنگی ئەم نەتەوەیە بۆ شوێنەوارناسان و هەڵكۆڵەرەكان دەركەوت، ئەویش بەهۆی دۆزینەوەی شوێنەوارو پاشماوەكانی تایبەت بەم نەتەوەیە.

ناوی خوریەكان لە كتێبی تەورات بەشێوەی (حوريم)[2]هاتووە. بەڵام ئەم ناوە بە مفهومی مێژوویی و زمانەوانیدا دەلالەت لەسەر نەتەوەی خوری ناكات. ئەم ناوە تاكو ئێستا ماناكەی بە تەواوەتی نازانرێت. هەرچەندە جەندین تەفسیرات و شیكردنەوەی بۆدانراوە، بەڵام ئەم تەفسیرات و شیكردنەوانە جێی پێ پشت بەستن نییە، جونكە هیچ كامێكیان بەڵگەی تەواو قەناعەت پێكراوی لەگەڵدا نییە.

یەكێك لەم تەفسیراتانە ناوی(حوريم) پەیوەست دەكات بە وشەی (خورادی)(khuradi)كە بەمانای (سەربازی وشیار)(الجندي اليقظ)دێت. ئەگەر سەلماندمان كە ووشەی خورادی (ئەم وشەیە زۆرلە تێكستە نووسراوەكانی خووری و ئۆرارتییەكان هاتووە، هەروەها لە سەردەمی ئەكەدی كۆتایی (اكدی متأخر) بەتایبەتی لەدیالێكتی ئاشوورییەكان[3] (اللهجة الآشورية)هەروەها لە تێكستە ئۆغاریتییەكانیش بەكارهاتووە) لە ئەصلا خوریە. لەم حالەتەدا پێویستە برگەی(دی) پەیوەست بكرێ بە وشەكە خۆیەوە، (برگەی ـــ دی ـــ لە زمانی خوریدا لە دوای ناوی كەسەكان دێت بۆ دەلالەت كردن لەسەر وەصفكردنیان). هەروەك ڕەگی وشەكە (خور) دەلالەت لەسەر هەندێك مانا دەكات كە پەیوەندی بەلایەنی جەنگەوە هەیە. ئەمەش زۆر گونجاو ومەقبولە بۆ ئەوەی خودی

---

(١) شێوازی راستەقینەی ناوەكە (خوری، Khur - ri)ە نەك (خووری) بەڵام ئێمە ناوی (خووری)مان بەكارهێناوە چونكە لە لێكۆڵینەوە زانستیەكان زیاتر بەكاردێت.

(٢) هەردوو پیتی (ی، م)لە زمانی عبری هێمای كۆیە.

(٣) زمانی ئەكەدی هەر لەسەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زاین دوو دیالێكتی سەرەكی لەخۆ دەگرت ئەوانیش : دیالێكتی ئاشووری لە باكووری وڵاتی دوو رووبار، دیالێكتی بابلی لە ناوەڕاست و باشووری وڵاتی دوو رووبار. جیاوازی نێوان ئەم دوو دیالێكتە لە راناوەكان ودەربڕینی دەنگەكان و مانای ووشەكان و ژمارەیەك لە بەكارهێنانە زمانەوانییەكان دەردەكەوێت.

نەتەوەیەك یان جنسەكی بەشەری پێ وەصفبكرێت و بناسرێت. شایانی باسە پێویستە ئیشارەت بەوەش بكەین كە هاوەڵی خوداوەندی (كەش)ی[٤] (الطقس) خوریەكان ناسراو بوو بە خوڕڕی، هەروەها شارەكی بە ناوبانگی خوریەكان بە (خوڕڕا)[٥] ناسـرابوو.

لە لیستی وشە هاوواتاكانی ئەكەدی توانرا هەندێك وشەی زمانی خووری بناسرێتەوە وەك (نەمەل (namall)واتە سەرپڕ(نوێن)(خەوگە)، فتق pit واتە (منداڵ). ئەمەش پێش ئەوەی ناوی خوریەكان بزانرێت بەو جۆرەی كە لە تێكستە مێخیەكان (مسماریەكان) دا هاتبوو، هەروەها لە پاڵ ئەم وشانە ناوی سوبیر (su-bir4 ki)[٦] هاتبوو، كە ئەم ناوەش دەلالەت لە وڵاتێك دەكات كە لە تێكستە ئەكەدییەكان زۆر باسی لێوە كراوە.

دوای ئەمە بە ماوەیەكی كەم نامەیەكی (٤٩٤)دێڕی لە گردی عەمارنە (تل عمارنة) لە ناوەراستی (میسر) دۆزرایەوە، ئەم نامەیە لە نێوان بەڵگەنامە ڕەسمییەكانی بەشی ئەرشیفی دیبلۆماسی تایبەت بە هەردوو فیرعەونی (میسر)ی ئەمینۆفیسی سێهەم و ئەمینۆفیسی چوارەم (ئەخناتون) دۆزرایەوە. لە ئەنجامی دراسەت كردنی ئەم نامەیە دەركەوت كە نامەكە بەزمانەكی نەناسراو نوسراوەتەوە. بێجگە لە پێشەكییەكەی نەبێت كە بەزمانی ئەكەدی نووسرابوو كە ئەویش بابەتی سڵاوكردنی لە خۆگرتبوو. هەر بۆیەش ئەم زمانە نەناسراوەی كە نامەكەی پێ نوسرابوو لە سەرەتا بە(زمانی میتانی) ناونرا وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو وڵاتەی كە نامەكەی لێوە هاتووە. چونكە نامەكە لە وڵاتی میتانییەكانەوە ڕەوانەی (میسر) كرابوو. بەڵام دواتر توێژینەوە لە خودی ئەم زمانە زۆر قۆناغی پێشكەوتووی بەخۆیەوە بینی، ئەویش بەهۆی ڕوون كردنەوەی ئەمانەی خوارەوە:

١- هەندێك لەو ووشانەی كە تایبەت بوون بە ناوی وڵاتی سوبیر كە لە لیستی وشە هاوواتاكانی زمانی ئەكەدیدا هاتبوون بەهەمان شێوە لەو نامەیەشدا بەكارهاتبوون.

٢- ئەو باسانەی كە بەزمانێكی تری نامۆ نووسراونەتەوە بەنیسبەت ئەو نامانەی كە بەزمانی

---

(٤) خوداوەندی كەش لەلایەن خوورییەكان بە خوداوەند (تیشووب) ناسرابوو،كە لەبەشی ژیانی ئایینی خوورییەكان زیاتر باس لەم خوداوەندە دەكەین.

(٥) لەتێكستەكانی شاری ماری و مەلیكەكانی سەردەمی ئاشوری ناوەڕاست زۆر باسی ناوی شاری خوورڕا هاتووە، كە تیایدا بۆمان دەردەكەوێت كە ئەم شارە دەكەوێتە ناوچەی (ئیدا مەرەص)، ئەم ناوچەیەش دەكەوێتە بەشی باكوری ڕۆژئاوای ناوچەكانی سێگۆشەی خابوور.

(٦) ناوی سوبیر یان سوبارتۆ لەتێكستە مێخییەكانی كۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایین بە ناوچەكانی و نیشتەجێ بوونی خوورییەكان لە ڕۆژهەڵاتی سەرووی ڕووباری دیجلە و ڕۆژئاوای ڕووبارەكە دەگوترا.

ئەکەدی نووسراون لە نامەکانی گردی عەمارنە، ئەوا ئەم باسانە (نامەکان) لە شاری (تونیب)[٧]ەوە هاتووە کە دەکەوێتە کوردستانی سوریا (ناوەڕاستی سوریا)، کە لەگەڵ نامەی ناسراو بە میتانی هاوشێوەیە لە ڕووی زمانەوانییەوە.

٣- زۆر لە ناوی ئەو کەسانەی کە لە تێکستەکانی سەردەمی بابلی کۆن و ناوەڕاستدا هاتووە پەیوەندیان هەیە بە زمانی ئەم نامەیە(نامەی میتانی).

لە ساڵی ١٩٠٦ زایینی هەڵکۆڵینی شوێنەواری (التنقیبات الاثریة) لە پایتەختی حیسییەکان لە خاتوشا[٨] (ئێستا پێی دەڵێن: بۆغازکۆی، بۆغازکالە) دەستیپێکرد، کە تیایدا ژمارەیەك تێکست دۆزرایەوە. ئەم تێکستانە بەزمانێکی نەزانراو نوسرابوو. هەروەك هەندێك تێکستی تریش دۆزرایەوە کە ناوەڕۆکەکەیان بریتی بوو لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی کە بەزمانی ئەکەدی نوسرابوون. لە ناوەڕۆکی ئەم پەیماننامانە بۆمان دەردەکەوێت کە وڵاتەك هەیە بە ناوی (خووری) و دانیشتوانەکەشی بە خوورییەکان ناسراون. ئەم ناوەش سەرەتا بە (خەرری) خوێندرایەوە، چونکە ئەو هێما مسمارییەی کە پێی دەنوسرێت (خر) هەردوو ڕوو وەردەگرێت. واتە بەدوو شێواز دەخوێندرێتەوە (خەر، خور). بەڵام لە دواتر بۆمان دەرکەوت کە شێوەی ڕاستی خوێندنەوەکە (خوڕ)ە. چونکە ناوەکە لە تێکستێکی مێخی تردا بەدوو بڕگە نوسرابوو بەم جۆرە (KHU-UR).هەرچەندە هەندێك لە زاناکان پێشنیاری ئەم جۆرە خوێندنەوە ڕاستەیان کردبوو پێش سەلماندنی بە بەڵگەی گونجاو.

ڤینگلەر لە سالی (١٩٠٧ز) پێشنیاری بوونی پەیوەندی نێوان هەردوو ناوی (خووری) و (ئاری) کرد. هەروەها زمانی خووری بە زمانی ئارییی کۆن (هیندۆئێرانی) لە قەڵەم دا. بۆ پاڵپشتی کردنی ئەم دەربڕینەشی ڤینگلەر پشتی بەناوی ئەو خواوەندانە بەستا کە سوێندی پێخورابوو لەو پەیماننامە نێودەوڵەتییەی کە کاتی خۆی لە نێوان مەلیکی حیسی (شوبیلۆلیۆمای یەکەم) و مەلیکی میتانی

---

(٧) تونیب شاریك بوو کە مەلبەندی نیمارەتێکی بچووك بووە لە سوریا لە سەردەمی ململانێی نێوان (حیسییەکان) و(میسریەکان) لەسەر خاکی سووریا. تاکو ئێستا نەتوانراوە شوێنەکە و سنووره جوگرافییەکەی دیاریبکرێت.بەڵام بەپێی بەڵگە نووسراوەکان (تێکستە مێخییەکان) ڕەنگە ئەم شارە بکەوێتە ڕۆژئاواو باکووری ڕۆژئاوای شاری حەمات.

(٨) شوێنەوار ناسی ئەڵمانی هـ. ڤینکلر ـ H. Winckler توانی پایتەختی حیسییەکان (خاتووشا) بدۆزێتەوە.کە دەکەوێتە دووری ١٥ کم لە ڕۆژهەڵاتی شاری ئەنقەرە.

(شەتتی وازا) بەسترابوو، ئەم خوداوەندانەش بە هەمان شێوەش لەزمانی هیندیدا هەنە.

ئەم تیۆرە (نظرية) راست نەبوو بە تایبەتی دوای ئەوەی تێکستەکی نوسراو لە خاتوشا دۆزرایەوە کە بەزمانی حیسی وەسفی ئەو زمانەی کردبوو کە تێکستەکەی پێی نوسرابوو. کە بە خورلیلی(khurlili) ناوی هێنابوو. ئەم وشەیەش (خورلیلی) لە وشەی خورلا (khurla)وە هاتووە. کە ئەمەش وشەیەکی حیسییە و بە مانای خووریەکان دێت. زمانی ئەم تێکستەش هاوشێوەیەش لەگەڵ زمانی ئەو نامەیەی کە بە میتانی ناسراوە (ئەوەی کە لە میسر دۆزرایەوە).

سەرەرای ئەوەی کە ناوی (خورلیلی ــ hurlili) تەمسیلی وەسفەکی زمانەوانی دەکات کە گونجاوە لەگەڵ ئەو ناوەی کە لە نامەی میتانیدا هاتووە بەشێوەی خوروخ (khurowkhe) یان خوڕڕوخ (khurrowkhe)کە بامانای (زمانی خووری)دێت. ئەمەشیان پشت بە وەسفەکی خۆیی(ذاتی) دەبەستێت. بەڵام هەندێك لە توێژەرەوەکان پێشنیاری (أ. ئونجناد) یان بەچاکتر زانی بۆ ئەوەی ئەم زمانە بە(زمانی سوبارتی) ناوبنرێت. ئەمەش بەنسبەت وڵاتی سوبارتۆ[9] بەناوبانگ لەلای وڵاتی بابل، کەلە تێکستەکانی وڵاتی بابل زۆر ئاماژەی پێکراوە.

سەرەڕای بوونی بەڵگەی کۆنتر لەم بەڵگانەی سەرەوە لە سەر زمانی سۆبارتی. کە بریتییە لە ناوی کۆمەڵە کەسانێك کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم[10] بگرە کۆنتریش لەم سەردەمە. بەڵام کۆنترین بەڵـگە هەبێت لە سەر ناوی خوریەکان بۆ

سەردەمی حیسی کۆن[11] دەگەڕێتەوە. هەربۆیەش ئەنجناد وای بینی کە پێویستە لە تێکستەکانی بۆغازکۆی وشەی ناوی خووری بکرێتە سۆبارتی. هەرچەندە ئەنجناد لە لێکۆڵینەوەیەکی خۆی ئیشارەتی بەوەدابوو کە هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان وشەی (خووری) (بەپێی بەڵگەکانی سەرەوە) لەگەڵ وشەی (سۆبارتی) کە نامەی ناسراو بە(میتانی) پیّ نووسرابوو.

---

(٩) سۆبارتۆ ناوی کۆنی خاکی کوردستانی ئەمڕۆکەیە. سۆمەریەکان لە ناوەڕاستی هەزارەی سێەم بە خاکی کوردستانیان دەگوت (سوبیر ــ SUBER4)، دواتر لە سەردەمی ئەکەدیەکان و بابلییەکان ناوەکەی بوو بە (سوبارتۆ ــ SUBARTU)، بەڵام لە دوای هەزارەی دووەمی پێش زاین وڵاتی سوبارتۆ لە لایەن ئاشووریەکان داگیر کراو، دواتر ئیمبراتۆریەتی ئاشووری لەسەر دامەزرێنرا.(وەرگێڕ)

(١٠) سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێهەم لە وڵاتی نێوان دوو رووبار (٢١١١ - ٢٠٠٣) پ.ز دەگرێتەوە.

(١١) سەردەمی حیسی کۆن ماوەی (١٦٥٠- ١٥٠٠ پ.ز) دەگرێتەوە.

بەڵام دوای ئەوەی سپایزەر لە چەندین لێکۆڵینەوەیدا، کە لە ساڵانی (١٩٢٦،١٩٣٠،١٩٣٣) زایینی دەریکردبوو پشتگیری لە ناوی (خووری) کرد لە شوێنی ناوی سۆبارتیی. هەربۆیە ئەمە بووە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی کە ناوی(خووری) وەك ناوێکی ڕەسمی لە لێکۆڵینەوە نوێکاندا بەکاربهێنریت و پشتی پێ ببەسترێت. بەڵگەکانی تایبەت بە زمانی خورییەکان بە شێوەیەکی بەردەوام لە زیاد بووندا بوو. ئەمەش لە ئەنجامی هەڵکۆڵینەکانی شوێنەوارناسان لە هەریەك لەناوچەکانی خاتوشا و ماری(گردی مەسکەنە)(کە هەموویان سەر بە خاکی کوردستانی گەورەن)کە لە ئەنجامدا چەندین تێکستی خووری نوێ دۆزرانەوە کە لە نێوانیاندا تێکستی زۆر گرنگ هەبوو لە ڕووی فەرهەنگی یەوە(معجم).

هەروەك ژمارەی ناوی کەسە خورییەکان زیادی کردوو گەیشتە هەزاران ناو. ئەمەش بەهۆی ئەو بەڵگەنامە زۆرانەی کە لە نوزی (یورغان تەپە) نزیك شاری کەرکوك و کورڕوخەننی (تل فخار) لە باشووری ڕۆژئاوای نوزی و ئالالاخ (تل عطشانة)و ئۆغاریت و چەندان ناوچەی تر دۆزرابوونەتەوە.

زانستی دراساتی خووری(خووریۆلیۆجی - Hurritology)، بریتییە لەو زانستەی کە هەموو ئەو لێکۆڵینەوە و دراساتانەی تایبەت بە زمان و شارستانییەت و مێژووی خورییەکان دەگرێتەوە. بەڵام تاکو ئێستا ئەم زانستە نەبۆتە لقێکی سەربەخۆ لە نێوان زانستەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆندا (Altoriantalistik) وەك زانستی دراساتی سۆمەری و ئەکەدی و حیسی. هەربۆیەش تاوەکو ئێستا پسپۆڕانی خووریۆلۆجی هەوڵ دەدەن لایەنە جیاوازەکان و کێشەکانی ئەم زانستە چارەسەربکەن.

تاکو ئێستا پسپۆڕانی دراساتی ئەکەدی بە قووڵای لە دراساتی حیسی ناکۆڵنەوە بە جۆرێك کە یارمەتیدەربێت بۆ گەڕان بە دوای سەرچاوەکان و بەراوردکردنیان. بەپێچەوانەوەش پسپۆڕانی دراساتی حیسی لە دراساتی ئەکەدی ناکۆڵنەوە. هەر بۆیەش بەدەرخستنی ڕاستییەکانی پەیوەست بەتوێژینەوە لەم بابەتانەی کە پسپۆڕان گرنگی پێدەدەن لە نێوانیاندا لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە زمانی خووری بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەبێت.[١٢]

گرنگترین ئەو کێشانەی یان ئەو پرسگەلانەی کە ناکۆکیان لەسەرە لە توێژینەوەکانی پەیوەست بە خوریەکان ئەمانەی خوارەوەن:

---

(١٢) مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە لە توێژینەوەی زانستی تایبەت بە دراساتی خووری پێوستە سوود لە زانستی دراساتی ئەکەدیی و حیسی وەربگیرێت.

١- زانستی زمانی خووری و پۆلێن کردنی.

٢- کێشەی بوونی پەیوەندی نێوان خووریيەکان و سۆبارتییەکان.

٣- کێشەی بوونی پەیوەندی نێوان خووریيەکان و ئارییەکان.

٤- جیاوازی ڕاو بۆچوون لەو توێژینەوانەی کە پەیوەستن بە دۆزراوەکانی نوزی(پایتەختی خوریەکان).

٥- مەسەلەی مێژووی ئایینی خوریەکان و پەیوەندی بەبیرو باوەڕی (معتقداتی) دانیشتوانی ئاسیای بچووك. بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەستن بە تێکستەکانی ناوچەی بۆغازکۆی سەر بە خوریەکان و مەراسیمە ئایینییەکانی ناوچەی کیززۆ فەتنا.[١٣]

لە سالی ١٩٨٠زایینی هەولێکی زۆر درا بۆ پۆلێنکردنی زمانی خوریەکان بە پێی پێوانەی زانستی زمانەوانی. ئەم پۆلێن کردنەش لەلایەن (یانسن — Jensen) و (برۆنۆف Brunnow) و (سایس- Sayce) و (میسرشمیدت Messerschmidt) و (بۆرك Bork) لەسەر نامەکەی ناسراو بە(نامەی میتانی) ئەنجامدرا. کە توانیان کۆمەڵە مۆرفیمەك و مانای چەند وشەیەك دیاریبکەن. ئەمەش بە یارمەتی چەند نامەیەك کە بەزمانی ئەکەدی نووسرابوون (لە ئەرشیفی تل عمارنە) کە لەلایەن هەمان ئەو کەسە ڕەوانە کرابوو کە خاوەنی نامەی میتانی بوو. لەم نامانە هەندێك دەستەواژەی هاوشێوەی دەستەواژەکانی ناو (نامەی میتانی) بەکارهێنرابوو. هەروەها لە ناوەڕۆکی ئەم نامانە ناوی چەند کەل و پەلێکی دیاریکراو هێنرابوو.

توێژینەوەکانی تایبەت بە زمانی خوریەکان پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی لە سالآنی سیەکانی سەدەی بیستەم. ئەمەش بەهۆی دۆزینەوەی چەند تێکستێکی مێخی (مسماری) لە شارەکانی وەك: نوزی و ئۆغاریت و ماری. هەروەك پەلەکردن لە بلاوکردنەوەی ئەو تێکستە خوریانەی کە لە خاتوشا دۆزرابوونەوە ڕۆڵی خۆی هەبوو لەم پێشکەوتنەدا. کە بەهۆیەوە توانرا لەلایەنی تەسریفکردنەوە بنەمای مۆرفیمە دەنگدارەکان و بێ دەنگەکان (الصائتة و الصامتة) دیاریبکەن. هەروەها لەلایەنی ڕێزماندا توێژەرەوەکان توانیان بەشێوەیەکی تەواو بەش بەشی بکەن و کاری هەموو مۆرفیمەکان دیاری بکەن. هەروەك توانیان شێوازی کاری کەسی نادیار (صیغ الفعل مبنی للمجهول) دیاریبکەن. بەم جۆرە توانیان بەشێوەیەکی دروست و تەواو وەسفی زمانی خووری

(١٣) کیززۆفەتنا ناوی شوێنێکە دەکەوێتە باکووری کەنداوی ئەسکندرۆنە کە هەردوو ڕووباری جەیحون و سەیحون بەلایدا تێدەپەرێت..

بکەن. بەوەی کە بریتییە لەو زمانەی کە توانای شیکردنەوەی هەیە و لەسەر کاری بکەر(Ergativ) وەستاوە. بەڵام لە لایەنی فەرهەنگی زمانەوانیدا توانرا مانای زۆرێك لە وشەکان بزانن و دیاریبکەن. بۆ ئەم مەبەستانەش بەشێوەیەکی تایبەتی سوودیان لە تێکستەکانی خاتوشا وەرگرت.

ئەم کارە گەورەیەش بەپلەی یەکەم لەلایەن هەریەك لە : (فریدریچ Fridrich)، (گۆتزە Goetze)، (سپایزرSpeiser)، (تۆرۆ- دانگن- Thureau-Dongin)، (ڤۆن براندن شتاین Von Brandenstin) ئەنجامدرا. هەموو ئەو ئەنجام و بەرهەمانەی کە لەم قۆناغەی توێژینەوەی سەبارەت بە زمانی خووری بەدەست هاتبوو لە لایەن سپایزەر لە کتێبێکدا بە ناوی (دەروازەیەك بۆ زمانی خووری) لە ساڵی١٩٤١ زایینی بڵاوکرایەوە. تاکو ئێستاش ئەم کتێبە جێگای پشت پێ بەستنە لەم بوارەدا.

لەدوای جەنگی جیهانی دووەم چەندین بیروڕای نوێ لە بواری دراسەت کردنی زمانی خوریەکان سەری هەڵدا. بەتایبەتی دوای دۆزینەوەی تێکستە نوسراوەکانی ئۆغاریت. هەروەك توێژینەوە لە نامەکەی ناسراو بە(نامەی میتانی) زانیاری نوێی بەدەست دا.

هەندێك لە توێژەرەکان(باحثین) پێشتر تێبینی بوونی پەیوەندییەکی خزمایەتیان کردبوو لە نێوان زمانی خووری و زمانی ئۆرارتی. بە تایبەتی ئەو زمانە ئۆرارتییەی کە هەندێك تێکستی پێ نووسرابوو کە مێژووەکەیان بۆ سەدەکانی(٩ — ٦) پێش زاین دەگەڕێتەوە. (فریدریچ) لە ژمارەیەك لە دراسەتەکانی تەئکیدی لەسەر بوونی ئەم پەیوەندییە خزمایەتییە کردبووەوە، بەتایبەتی لە مەجالی فەرهەنگی. هەروەها لێکۆلینەوەکانی توێژەری ڕووسی (دیاکۆنۆف-Diakonoff) و چەندین توێژەری تریش قۆناغی گرنگیان بڕی لەم مەسەلەیەدا. بەجۆرێك کە توانرا بە رادەیەکی زۆر ورد پلەی خزمایەتی نێوان ئەم دوو زمانە دیاریبکەن. بەم جۆرە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئەنجامانە و بە پشت بەستن بەو پێشکەوتنانەی کە سەبارەت بە زمانی خووری و زارەکانی بەدەست هێنراوە، دەتوانین بەشێوەیەکی تەئکید بلێین زمانی ئۆرارتی لەزمانی خوری گەشەی نەسەندووە. بەڵکو هەردوو زمان دوو لقی سەربەخۆن لەزمانی دایك (زمانی خووری - ئۆرارتی سەرەتا) و هەریەکەیان لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زاین لەوەکەی تر جیابۆتەوە.

ئەو گریمانەی کە دیاکۆنوف پێشنیاری کردبوو سەبارەت بە بوونی پەیوەندی خزمایەتی هەردوو زمانی خووری و ئۆرارتی لەگەڵ زمانەکانی ناوچەی قەفقاس جێگەی سەرنج بوو. بۆ ئەم مەبەستەش دیاکۆنۆف پشتی بە کۆکردنەوەی وشە وێکچووەکانی هەردوو زمانی (خووری و ئۆرارتی) لە

زمانەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی قەفقاس بەست. بەتایبەتی لە زمانی ویناخی و زمانی لەزجی.[14]

لە دوای کتێبی سپایزەر (کە پێشتر ئیشارەتمان بۆ کرد) چەندین کتێب و توێژینەوەی نوێ لەسەر ڕێزمانی خووری نوسراون. کە هەریەکەیان لەڕووی پێکهاتە و شێوازەوە جیاوازن. گرینگترینیان ئەمانەن :

- ف. بۆش: ڕێزمانی خووری (نامەکەیە پێشکەش بە زانکۆی براندیس کراوە لە ساڵی ١٩٦٤).

- ی. م. دیاکۆنوف: خوریەکان و ئۆرارتییەکان (بەزمانی ئەڵمانییە) لەساڵی ١٩٧١ز.

- ی. فریدریچ : زمانی خوریەکان : (توێژینەوەیەکە لە فەرهەنگی لێکۆلینەوەی ڕۆژهەڵاتییەکان بڵاو کراوەتەوە) لە ساڵی ١٩٦٩ز.

- ه. ی. تیل: پێکهاتەی سەرفی و ڕێزمانی (نحو) خووری، لە ساڵی ١٩٧٥ز.

هەروەها توێژەری فەرەنسی (ی. لاروش) هەڵستا بە دانانی یەکەم فەرهەنگی خووری کە ڕێژەیەیەکی زۆری وشەی ناو تێکستەکانی لە خۆگرتبوو، کە لە ساڵی ١٩٨٠زاینی بڵاوکرایەوە.[15] لێکۆلینەوە لە مێژووی خوریەکان پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینی. ئەویش لە ئەنجامی ئەو هەموو هەوڵدانەی کە درا بۆ تێگەیشتن لە گرنگی مێژووی خوریەکان لە چوارچێوەی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی کۆن. کتێبەکەی (ئەنجاد) کە بە ناونیشانی(سوبارتۆ. بەشداری کردنی لە شارستانییەت

---

(١٤) زمانی وێناخی سەر بە کۆمەڵە زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی قەفقاسە. ئەم زمانە بە سەر سێ زار دابەش دەکرێت کە ئەمانەن :

- زاری شیشانی و ئەنگۆشی: ژمارەی ئەو کەسانەی کە گفتوگۆ بەم زارە دەکەن لە وڵاتی دایك نزیکەی یەك ملیۆن کەسە، بەڵام نزیکەی پەنجا هەزارکەس لە وڵاتەکانی (تورکیا، سوریا، ئەردەن) گفتوگۆ بەم زارە دەکەن.

- زاری باتی : ئەوانەی بەم زارە گفتوگۆ دەکەن لە وڵاتی جۆرجیا نیشتەجێن، ژمارەیان نزیکەی ٢٥٠٠کەسە بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٣٩زاینی.

- زاری لەزگی : ئەمەشیان زمانی کۆمەڵێکە کە بە (لەزگی تشال) ناسراون.ئەم زمانە لەگەڵ هەندێك زاری تر لقی ساموریانی خواروو پێك دەهێنێت لە نێوان کۆمەڵە زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی قەفقاس، کە ئەمەشیان سێ زار لەخۆ دەگرێت کە ئەمانەن: کینووری، ئەکهیتتۆ، کوبا. زاری یەکەمیان بەزمانی نووسین دادەنرێت لە نێوانیاندا. نزیکەی ٣٨٣ هەزار کەس بەم زارە گفتوگۆدەکەن.

(١٥) ئەم فەرهەنگە سەرەتا لە گۆڤارێکی ساڵانەی فەرەنسی بەناوی (سەرچاوە حیسی و ئاسیاییەکان) لە هەردوو.ژمارەی ٣٤ی ساڵی ١٩٧٨ و ٣٥ی ساڵی ١٩٧٧ زاینی لە پاریس بڵاوکرایەوە.

و مێژووی نەتەوەکانی باشووری رۆژئاوای ئاسیا) پێگەیەکی تایبەتی هەبوو لەنێوان لێکۆڵینەوەکانی تردا. ئەم کتێبە لەبەرلین و لایبزیچ لەساڵی ١٩٣٦ زایینی بلاوکرایەوە. (ئەنجناد) لەم کتێبەیدا خوریەکانی یە کۆنترین کۆبوونەوەی ڕەگەزی دادەنێت لە وڵاتی دوو رووبار(وادي الرافدين)، هەر لە سەردەمی بەردینی نوێوە خوریەکان بە توخمێکی شارستانی (عنصر حضاري) دادەنێن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجناد نەیتوانی ئەم بۆچوونەی خۆی پشت ڕاست بکاتەوە بە پشت بەستن بە سەرچاوە مێژوویی و زمانەوانی و شوێنەوارییەکان. ئەمەش بەهۆی پەیرەوکردنی مەنهەجی نەگونجاو لە نێوان ڕوخساری ڕەگەزایەتی و دیاردە زمانەوانی و شارستانییەتەکان.

سەرەڕای ئەوەی کە سپایزەر هەر لە زووەوە (لەساڵی ١٩٢٦) دژی ئەو بۆ چوونەی ئەنجناد وەستا کەدەڵێت سۆبارتییەکان شوێنگە و گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە لە وڵاتی دوو رووبار. بەڵام دواتر سپایزەر ئەو هەڵوێستەی کە لە کتێبەکەی بەناوی (بنەرەتی وڵاتی دوو رووبار. نەتەوە سەرەکییەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن، فلادلفیا ساڵی ١٩٣٠زاینی) گرتەبەر زۆرجیاواز نەبوو لەوەی کە ئەنجناد بۆی چووبوو، کە دەیگوت ئەسلی خوریەکان لە باکووری وڵاتی دوو رووبارە(کوردستانی عیراق).

بەڵام دواتر چاوی بەو هەڵوێستەی خۆی داخشاندەوە و لە ساڵی ١٩٣٢زایینی هەمواریکرد. لەو کاتەی کە هەڵکۆڵینی شوێنەواری لە گاسور /نوزی دەریخست کە ئەم شارە لە دەوروبەری ١٤٠٠ پ.ز خوریەکانی تێدا نیشتەجێ بووە. کەچی لە سەردەمی ئەکەدی (٢٣٤٠-٢١٩٥ ق. م) هیچ شوێنەوارێکی خووری تێدا بەدەر نەکەوتووە.

بەڵام توێژەری ئەمریکی گیلب Gelb لەساڵی ١٩٤٤ز ڕایەکی نوێی پێشنیارکرد.کە ئاماژەی کرد بەوەی کە دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان خوریەکان و سۆبارتییەکان. بەو پێیەی کە سۆبارتییەکان (لەرووی زمان و ڕەچەڵەکەوە) بریتین لە نەتەوەی بنەرەتی لەباکووری وڵاتی دوو رووبار (کوردستانی عێراق) هەر لە کۆنترین چاخەکانەوە. هەرچی خوورییەکان ئەوا نەوەی سۆبارتییەکانن و لە دوای ئەواندا سەریان هەڵداوە. ئەم بیروڕایەی (گیلب) لە بیروڕا هەموارکراوەکەی (تعدیل) سپایزەر دەچێت بەڵام لە دوایدا لە ساڵی ١٩٥٦ز (گیلب) ناچاربوو ئەم ڕایەی خۆی هەمووارکبات (تەعدیل). ئەمەش دوای بڵاوکردنەوەی نەخشێکی مەلەکی نووسراو بە زمانی خووری کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی هەزارەی سێهەمی پێش زاین. بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێشنیاری یەکەمی هەر مایەوە.

لەلایەکی ترەوە سپایزەر لەساڵی ١٩٤٨زایینی ئیشارەتی بەوەکردووە کە سۆمەری و بابلیەکان

پێرستی زمانەوانی خوریەکانیان بە(سۆبارتی)لە قەڵەم داوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیشارەتی بە هەندێك وشە کردووە کە نەسامییە (زمانی ئەو نەتەوانەی کە لە دوورگەی عەرەبییەوە هاتوونە بۆ وڵاتی دوو رووبار) و نە خوریە لەنێوان ئەو پێرستە زمانەوانیانەی کە بەسۆبارتی لە قەڵەم دراوە.

ئەو هێڵە بنەڕەتیانەی کە بنیاتنراون لە ئەنجامی ئەم گفتوگۆ و مناقەشاتانەی کە سەبارەت بەڕۆڵی خوریەکان لە پێشکەوتنی شارستانییەتی ڕۆژهەلات بەسترابوو تاکو ئەمڕۆش هەر ماوە و بەردەوامە.

خوریەکان لە ناوچە چیایەکانی باکووری ڕۆژهەلاتی وڵاتی دوو رووبار (کوردستان عێراق) لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایین سەریان هەڵداوە. پاشان کەوتنە ژێر کاریگەری شارستانییەتی سۆمەری و ئەکەدییەکان. هەروەها خوریەکان لەناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایینی دەورێکی گرنگیان گێڕا لە گواستنەوەی شارستانییەتی وڵاتی دوو رووبار بۆ سوریا و ئاسیای بچووك (واتە کوردستانی سوریاو کوردستانی تورکیا).

خەملاندنی ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەی (المجموعات البشریە) کە بەزمانەکانی هیندۆئاری دەدوێن ماوەیەکی درێژی خایاند. بەتایبەتی ئەوانەی کە زنجیرەك لە ناوی ناسەکی(اسم علم) و پاشناو(لقب)یان بەدەستەوە هاتووە لەتێکستە مێخییە دۆزراوەکانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی مەملەکەتی میتانی (خووری) و ناوچەکانی تری کاریگەر بە دەسەلاتی مەملەکەتی میتانی (خوری) لە ڕووی سیاسی و شارستانییەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەی پێش زایین و سەدەکانی دواتر. ئەم مەسەلەیەش تاکو ئەمڕۆکەش جێگەی ناکۆکی توێژەرانە. بەڵام

(م. مایرهۆفر Marrhofer) هات مێژووی توێژینەوەی تایبەت بەم لایەنەی دراساتی خووری لە دوو کتێب بە شێوازێکی گێڕانەوە و شیکاری خستەڕوو، کتێبەکانیش ئەمانەن:

- هیندۆ ئاریەکان لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا. (فیسبادن ١٩٦٦ز).
- ئاریەکان لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا. ئایا ئەفسانەیە؟ (ڤییەننا ١٩٧٤ز).

لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ڕووباری دیجلە بەلای باکوورییەوە (لە نوزی) هەندێك تێکست دۆزرایەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پانزە و چواردەی پێش زایین. ئەم تێکستانە بوونە ماددەیەکی باش بۆ لایەنی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە(دراساتی ڕۆژهەڵاتی کۆن). ئەم تێکستە نووسراوانەش بە (توێژینەوەکانی نوزی) ناسراون و ناوبانگیان دەرکردووە. ئەمەش گرنگیەکی یەکجار گەورەی هەیە بۆ لایەنی لێکۆلینەوەکانی تایبەت بەزمانی ئەکەدی و زمانی خووری. بەڵام توێژەرە ئەڵمانییەکانی وەك (دیتریچ Dietrich)، (لۆرێتز Loretz)، (مایەر Mayer)، لەساڵی ١٩٧٢ زایینی مجلدێکی

زلیان دەرکرد کە هەموو سەرچاوەیەکی پەیوەست بەو تێکستانەی کە لە نوزی دۆزرابوونەوە لە خۆ گرتبوو.

خوریە نیشتەجێ بووەکانی ئەم ناوچانە (نوزی)(بەلایەنی کەم بەشێکیان) دوو زمانیان بەکاردەهێنا، بەزمانی خووری گفتوگۆیان دەکرد، بەلاّم بۆ نووسین زاری سەردەمی بابلی ناوەڕاستیان بەکاردەهێنا. ئەم بەکارهێنانەش بەڕێژەیەکی جیاواز بە پێی نووسەرەکە زاری ئاشووری لە خۆدەگرت، هەروەك کاریگەریەکی گەورەی زمانی خووری پێوە دیاربوو.

هەرچی لەڕووی ناوەڕۆکەوە ئەم بەلگەنامانە بە ماددەیەکی باش دادەنرێن بۆ زانینی بارودۆخی کۆمەلاّیەتی و ئابووری و سیاسی ناوچەکە لەو کاتدا.تێکستە مێخییەکانی نوزی زۆر بەراود دەکران لەگەلّ چیرۆکەکانی ناو تەورات، بەلاّم لەگەلّ تێپەربوونی کاتدا ئەم دراسەت و لێکۆلینەوانە گرنگی خۆیان لەدەست داو رێژەیان کەم بۆوە، دوای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر لەتوێژینەوە ئەمریکیەکان دەربارەی تێکستەکانی نوزی بلاّوبوو.

هەولّدان لەڕووی لایەنی شوێنەواریەوە بەردەوام بوو بۆ ڕوونکردنەوەی بنەچەو بنەمای خورییەکان و چۆنییەتی بلاّوبونەوەیان لە(هیلال خەصیب). ئەم بلاّوبونەوەشیان بەستایەوە بە بلاّوبوونەوەی جۆرێکی گلێنە (فخار)، بەتایبەتی ئەو جۆرەی کە بە گلێنەی (خەربەت کیرەك)[16] ناسراوە. ئەم جۆرە گلێنە لە ناوچەکانی قەفقاسەوە بەرەو ڕۆژهەلاّتی ناوچەی ئەنادۆل و باکووری سوریا(کوردستانی سوریا و تورکیا) گواستراوەتەوە و بلاّوبۆتەوە تادەگاتە فەلەستین. ئەم جۆرە گلێنەیەش بۆ خوریەکان دەگەڕێتەوە. بەلاّم ئەم جۆرە بیردۆزە لاوازە وپالّپشتی ناکرێت بەهۆی شێواوی زنجیرەی چینە مێژووییەکان(الطبقات التأریخیة) تیایدا. چونکە ئەم جۆرە گلێنەیە بە چەندین سەدە کۆنترە لەو بەلگە سەرەتاییانەی کە دەربارەی خوریەکان زانراون. لەو کاتەی کە بەلگەکانی تایبەت بە بلاّوبوونەوەی خوریەکان لە(کوردستانی سوریا) دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووەمی پێش زاین. کەچی مێژووی ئەم جۆرە گلێنەیە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زاین(٢٧٠٠پ.ز).

ب. هرودا(Hrouda) لە هەردوو لێکۆلینەوەکەیدا کە لە سالّی ١٩٥٨ز بلاّویکردووە، توانی چەندین زانیاری جۆراوجۆری نوێ سەبارەت بە شارستانییەتی ماددی لەناوچەی نیشتەجێ بووەکانی خوریەکان بخاتە بەردەست.

---

(١٦) خەربەت کیرەك ناوی شوێنێکە کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای دەریاچەی تەبەریا. مێژووی ئەم جۆرە گلێنەیەش لەم ناوچەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ ٢٧٠٠ پ.ز.

بڵاوبوونەوەی شێوە جۆربەجۆرەکانی گلێنە کێشمیەکە وەك کێشەی هاتوچۆی نەتەوەکان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر. ئەم کێشمیەش لە ئەنجامی چەند هۆکارێك درووستبووە لەوانە: گۆڕانکاری لە پێکهاتەی سیاسی، جموجۆڵە بازرگانییەکان، شێوە و مۆدیلاتەکانی گلێنەکە(الموظات)، گۆڕانی دانیشتوان (دیمۆگرافیا).

ئەم خۆ پارێزیەش بە هەمان شێوە لەسەر گلێنەی فەلەستینی دوو ڕەنگ(Bichromen)و گلێنەی ناوچەی خابوور دێتەجێ. هەرچەندە بڵاوبوونەوەی ئەم دوو جۆرە گلێنەیە هاوپێچە لەگەڵ سەرهەڵدانی چەندان بەڵگەی مێژووی تایبەت بە خوریەکان.

زاراوەی خووری (بەو شێوە فراوانەی کە ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت) بەشێوەیەکی سەرەکی دەلالەت لەسەر یەك زمان و یەك نەتەوە دەکات، ئەویش زمان و نەتەوەی خوریە. بەڵام ئێمە ماناکەمان لە چوارچێوە کاتی و شوێنییەکەی خۆی بەشێوەیەکی زۆر گەورەتر و فراوانترکردووە. مەرج نییە ئەم چوارچێوەیە گونجاوبێت لەگەڵ ئەم دەربڕینانەی کە لە تێکستەکانەوە دەرهێنراون، ئەمەش دەلالەتە لەسەر گرنگی ڕاستی مێژوویی، هەروەك چۆن هەریەکە لە وشەکانی (وڵات، هێز، مەلیك) هەمووی بە (خووری) وەسفکراون.

سەرەڕای ئەم هەموو دژیەکییە، بەڵام یەکێك لە خاڵە بەدەست هاتووەکانی ئەم کتێبە، ئەوەیە کە مەرج نییە هەموو کۆمەڵە مرۆڤێك زمانەکی دیاریکراو بەکاربهێنن بە کۆمەڵگەیەکی سەربەخۆی لەقەڵەم بدرێت. هەروەك دەلالەت ناکاتە سەر هێزە مێژووییەکەی. هەر بۆیەش ئەم کتێبە هەوڵدانێکە بۆ پێشکەش کردنی باسێکی تەواوی هەموو ئەو نەتەوانەی کەبەزمانی خووری دەدوێن لە ڕۆژهەڵاتی کۆن. ئەمەش چونکە ئەو شارستانییەتەی کە خوریەکان هەیانە پاساوە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. چونکە هەندێك داب ونەریتی تایبەتمەندی هاوبەش هەیە، هەر لە سەرەتای دروستبوون و سەرهەڵدانی کۆنترین دەوڵەت کە زمانی خووری تێدا بەکارهاتبێت تا کۆتایی هاتنی ئەو بڵاوبونەوەیەی لەناوچەکانی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی کۆن. هەر بۆیە جێی خۆیەتی ئێمەی کوردی نەوەی خوریەکان بە شانازییەوە باسی مێژووی باوباپیرانمان (خوریەکان) بکەین شان بەشانی باسکردنی مێژووی ئاشووری و حیسییەکان.

# (مێژووی سیاسی خوورییەکان)

کۆنترین سەرچاوە مێژوویییەکان لە ڕۆژهەڵاتی کۆن بە پلەی یەکەم تیشك دەخەنە سەر مێژووی شارە سۆمەرییەکان و گرنگترین بنەماڵە دەستەڵاتدارەکان لە وڵاتی سۆمەر. هەروەك ململانێ ناوەخۆییەکانی نێوان ئەم بنەماڵە سۆمەریانە بەدەردەخەن، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەرەبەیانی بنەماڵە دەسەڵات دارەکان لە وڵاتی سۆمەر. بەڵام ئەم سەرچاوە مێژووییانە هیچ زانیارییەك یان ئیشارەتێك ناکەن بە مێژووی ئەو ناوچانەی کە دەکەوێتە هەردوولای بەشی سەرووی ڕووباری دیجلە و لقەکانی ڕۆژهەڵاتیەوە. ئەم شوێنانەش بە وڵاتی یەکەمی خوورییەکان دادەنرێت لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا.

هەر بۆیەش وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دەڵێت خورییەکان لە کەیەوە لەناوچە چیایەکانی باکووری وڵاتی دوو ڕووبار و بەشەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتیەوە ژیاون؟ تاکو ئێستا ڕوون نییە و بەتەواوی نازانرێت. هەروەك مەسەلەی کۆچکردنی خوریەکان لە دەریای قەزوینەوە بۆ ئەم ناوچانەی باسکران لە چاخەکانی پێش مێژوو تەنها گریمانە، ئەمەش بە هۆی باری سەرچاوە مێژوویییەکان وەك ئاماژەمان پێکرد.

ئەو ناوچەیەی کە دواتر ناسرا بە وڵاتی ئاشوور و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی سەرووی ڕووباری دیجلە و بەشەکانی باکووری وڵاتی دوو ڕووبار. ئەوا بۆ یەکەم جار لە ڕووی سیاسییەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەکەدییەکان (٢٠٩٠- ٢٢٣٠ پ.ز). واتە بۆ یەکەم جار ئەم ناوچانە کەوتنە ژێردەسەڵاتی مەملەکەتێکی باشووری وڵاتی دوو ڕووبار کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن ئەمەی دواییەوە(مەملەکەتی ئەکەد) بەڕێوەدەبران. دامەزرێنەری مەملەکەتی ئەکەدی سەرجۆن (شەرڕوکین) یەکەم کەس بووە کە شەڕی کردووە لە دژی وڵاتی سوبارتۆ. ئەمەش بەپێی بەڵگەنامەیەکی مێژوویی کە ڕووداوەکانی بە شێوەیەکی یەك بەدوای یەکی یان ڕیزبەند تێدا نووسراوە.

ناوە جوگرافییەکەی سوبارتۆ (بە سۆمەری پێی دەڵێن : سوبیر) ئاماژە بە ناوچەیەکی دیاریکراو ناکات بە جۆرێك کە بتوانرێت بە وردی سنوورەکەی دیارییبکرێت لە باکووری وڵاتی بابل. بەڵکو لە بنەڕەتدا ئەم ناوە دەلالەتی لە سەر بەشێك لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی سەرووی ڕووباری دیجلە (باکووری دیجلە) دەکرد. بەڵام دواتر دەلالەتی ئەم وشەیە فراوانتربوو تا وای لێهات کە بە هەموو وڵاتی ئاشوورو باکووری وڵاتی دوو ڕووبار بگوترێت سوبارتۆ. ئەمەش لەم دواییەدا لە تێکستێکی سەردەمی بابلی نوێ ڕوون بۆتەوە کە تیایدا بە شێوەیەکی ئەدەبی باسی وڵاتی ئاشوور دەکات.

هەندێك زانیاریمان هەیە لە سەر ئەوەی کە سەرجۆنی ئەکەدی لە یەکێك لە ساڵەکانی

فەرمانڕەواییدا هێرشێکی سەربازی کردۆتە سەر وڵاتی سیموررۆم. هەروەك لەم دواییە توانرا بەشێوەیەکی تەنکیدکراو شوێنی شاری سیموررۆم دیاریبکرێت کە دەکەوێتە لای سەرووی رووباری زابی خوارو (یان زابی بچووك). نەقشێکی نووسراوی تایبەت بە یەکێك لە مەلیکەکانی سیموررۆم لە باکووری دەشتی رانییە (ئێستا دەریاچەی دووکانە) دۆزرایەوە. ئەم نەقشە نووسراوە بۆ کۆتایی سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم و سەرەتای سەردەمی بابلی کۆن[17] دەگەڕێتەوە. ئەم هەڵمەتەی سەرجۆنی ئەکەدی بۆ سەر وڵاتی سیموررۆم بە سەرەتای کارەکانی دادەنرێت بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلە. پاشان بۆمان دەردەکەوێت کە ناوچەکە تەنانەت وڵاتی ئاشوور و نەینەواش بوونەتە بەشێك لە مەملەکەتی ئەکەدی لە سەردەمی جێنشینەکانی سەرجۆنی ئەکەدی.

چەندین بەڵگەنامەی نووسراو دۆزراونەتەوە لە دوو ناوچەی تارادەیەك لێك دوور بەڵام هەردووکیان دەکەونە سنووری ناوچەکانی باکوور کە لەلایەن مەلیکە ئەکەدییەکان داگیرکرابوون : ئەوانیش ناوچەی گردی براکە (تل براك) کە دەکەوێتە ناوچەی سێگۆشەی خابوور[18]. ئەوی تریش ناوچەی گاسورە (نوزی) کە دەکەوێتە نزیك شاری کەرکوك لە باکووری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە. ئەم دوو ناوچەیە لە هەزارەی دووەمی پێش زایین لە نێوان ئەم ناوچانە دابوونە کە زمانی خووری تێدا باوبووە لە بەکارهێناندا. هەربۆیەش دراسەت کردنی ئەم تێکستانەی کە لەم دوو ناوچەیەدا دۆزراونەتەوە بەتایبەتی ناوی کەسەکان و وشە خورییەکان زۆر گرنگە. چونکە یارمەتیمان دەدات بۆ دیاریکردنی زەمەن و کاتی بڵاوبونەوەی خورییەکان لەم ناوچانە. بەڵگەنامەکانی گردی براك ژمارەیان کەمە و لەڕووی زانیارییەوە هەژارن بە جۆرێك کە یارمەتیدەرنییە بۆمان. بەڵام بەڵگەنامەکانی گاسور (نوزی) ژمارەیان زۆرە و زانیاری باشی پێداوین و کۆمەڵێکی باش ناوی خوری تێداهاتبوو.

لە بەڵگەنامەکانی گاسور (نوزی) هەندێك ناوی سۆمەری و ئەکەدی هەیە، هەروەها هەندێك ناوی تر هەیە کە ناتوانرێت لایەنە زمانەوانییەکەی دیاریبکرێت. هەر بۆیەش توێژەرەوەکان ئەم ناوانەیان بۆ زمانی (سۆبارتی) گەڕاندەوە. بەڵام ئەمە تاکو ئێستا ناکۆکی لەسەرە، چونکە ناتوانین بڵێین

(١٧) ئەم نەقشە نووسراوە لە لایەن د. عبدالهادی فونادی لە گۆڤاری سۆمەری عێراقی ژمارە ٣٤ی ساڵی ١٩٧٨زاینی لە لاپەڕە ١٢٢ – ١٢٩ بڵاوکراوەتەوە.

(١٨) زاراوەی سێگۆشەی خابوور لە لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە شارستانیەتە کۆنەکان بەو ناوچانە دەگوترێت کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕووباری خابوور و دیجلە.کە شێوەیەکی سێگۆشەی هەڵگەڕاوە پێکدەهێنێت.کە لاکانی ئەم سێگۆشەیە لە لای شاری حەسەکەی کوردی بەیەك دەگەن.

کە(سۆبارتی) یەکەیەکی زمانەوانی تەواوە. هەروەك سۆمەرییەکان لە سەردەمە کۆنەکاندا بەزمانی سۆبارتیان دەگوت (ئیمی — سوبیر EME- SUBER4) کە ئەمەش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاماژە بەزمانی خوریەکان دەکات.

لە تێکستەکانی ناوچەی گاسوور هەندێك ناو هەیە نەسۆمەری و نەئەکەدی و نەخورییە. ئەم ناوانەش بەزۆری لەسێ بڕگەی دەنگ پێکدێت. کە بڕگەی دووەم و سێیەمیان وەك یەکە بۆ نموونە وەك ناوەکانی (ئا ـ زو ـ زو)، (ئا ـ زی ـ زی)، (ئا ـ زا ـ زا)، (ئێ ـ دا ـ دا)......، هتد. هەندێك بەباشی نازانن کە ئەمانە بە زمانێکی دیاریکراو ببەستنەوە. چونکە ناوی یەك لە حاکمەکانی ئاشوور وەك ئەمانە بووە. هەروەك ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەم ناوانە لە وڵاتی سۆمەردا هەبووە.

ئەو ناوانەی کە لە تێکستەکانی گاسوور دۆزراوەنەتەوە پەیوەندیان هەیە بە زمانی نەتەوەکانی چیای زاگرۆس وەك لولوبییەکان[19] و گوتییەکان[20]. کە شتێکی زۆر دەربارەی ئەم نەتەوانە نازانین.

گومانی تێدا نییە کە خوریەکان گرنگترین کۆمەڵی زمانەوانی نەبوونە لەناوچەکانی

---

(١٩) لولوبییەکان نەتەوەیەك بوون کە لەدەوروبەری شاری سلێمانی ئێستادا دەژیان. لە تێکستە مێخییە نووسراوەکاندا بۆ یەکەم جار لە کۆتایی سەدەی ٢٨ پ.ز ئاماژە بەم نەتەوەیە کراوە. لولوبییەکان لە سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم (٢٠٠٤ - ٢١١٢ پ.ز) دەسەڵاتیان زۆر فراوان بوو. هەروەها لە سەردەمی بابلی کۆندا (١٩٠٠ — ١٦٠٠پ.ز) هەموو هۆزە چیاییەکان به ناوی لولوبییەکانەوە ناسرابوو. هەر لەم سەردەمەشەوە لولوبییەکان بەرەو ڕۆژئاوا بڵاوبوونەوە. هەروەها لە سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست دا (١٩٠٠- ١٦٠٠) هەموو ناوچەکانی لولوبییەکان کەوتە ژێردەسەڵاتی ئاشوورییەکان. کەچی لە سەدەی هەشتەمی پێش زاین بەشی ڕۆژئاوایناوچەکانی لولوبیەکان به (زاموا) ناوبانگی دەرکردبوو

(٢٠) وڵاتی گوتییەکان دەکەوێتە باشوورو باشووری ڕۆژئاوای وڵاتی لولوبییەکان لەو ناوچانەی کە ڕووباری دیالە و عوزێمی پێدا تێپەردەبن. گوتییەکان زۆر دژی ئەکەدیەکان شەڕیان کردووە. هەربۆیەش ناوچەکانیان تووشی چەندین هەڵمەتی سەربازی ئەکەدییەکان بۆتەوە..بەڵام لە کۆتایی سەردەمی مەملەکەتی ئەکەدییەکان گوتییەکان توانیان بەرەو لای باشوور هەڵبکشێن ومەملەکەتی ئەکەدی داگیربکەن شاری ئەکەد تەختبکەن و دەسەڵاتی خۆیان تێدا بسەپێنن و بۆ ماوەی سەدەیەك تیایدا بمێننەوە. پاشان لەلایەن مەلیکی سۆمەری ئۆتۆحیکال کە حاکمی شاری ئۆرۆك بوو لە ناوچەکە دوورخرانەوە. دەسەڵاتی گوتییەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زاین تەنها بەسەر ئەو ناوچانەبوو کە خۆیان لە بنەڕەتەوە تێیدا نیشتەجێ ببوون. کەچی دواتر کۆمەڵێك لە گوتییەکان کۆچیان کرد بۆ ناوچەکانی جەزیرە و مەملەکەتی ماری (کوردستانی سوریا) لەوێشەوە تێکەڵ بە خوورییەکان و ئامووریيەکان بوون.

ڕۆژهەڵاتی سەرووی ڕووباری دیجلە لەسەردەمی ئەکەدی و دواتر. هەروەك بوونیان لە چوارچێوەی سنووری ڕاستەقینەی مەملەکەتی ئەکەدی شتەکی ڕوون و ئاشکرانییە.

ڕاپۆرتێك لە بەردەست دایە کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی بابلی کۆن دەگەڕێتەوە. ئەم ڕاپۆرتە بەشێوەیەکی ئەدەبی نوسراوە و باس لە ڕاپەڕینەکی گشتی دژی مەلیکی ئەکەدی نەرام ـ سین (٢٢٥٩-٢٢٢٣ پ.ز) دەکات. کە تیایدا ئاماژە بە ناوی (پوتتیم - ئەتەل Puttim- atal) دەکرێت. کە ئەمەشیان یەکێکە لە مەلیکەکانی سیمورروم ناوەکەشی ناوێکی خوریە. بەڵام ئەم ڕاپۆرتە ڕەنگدانەوەی بارودۆخی نوێتری پێوەدیارە لە ڕووی مێژوویەوە. ئەمەشیان لە هەندێك زانیاری دەردەکەوێت کە لە ڕاپۆرتەکە خۆیدا هاتووە.

لە شاری نیپوور(نوففەر) کە بە مەلبەندی ئایینی سۆمەرییەکان دادەنرێت نەقشێکی نوسراو دۆزرایەوە کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی ئەکەدییەکان دەگەڕێتەوە. ئەوەی زۆر سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کە ئەم نەقشە هەندێك ناو و دیاردەی زمانەوانی زمانی خووری لە خۆگرتبوو. ناوەڕۆکی نوسینەکەش لە لیستێك بە ناوی ژمارەیەك لە جل و بەرگ پێکهاتبوو کە تەسلیمی یەکێك کرابوو بە ناوی(شێخرین ــــ ئیوری) ە. کە ئەم ناوەش بە هەمان شێوە ناوێکی خوریە. ئەوەی زۆر نامۆیە دەبینین کە ناوەڕۆکی ئەم تێکستە مێخییە هەرچەندە زۆر گرنگ نییە و پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەوە هەیە بەڵام لە سەر تاتە قوڕ نەنوسراوەتەوە، بەڵکو لە سەر ماددەیەکی بەنرخ نووسراوەتەوە ئەویش بەردی مەرمەری سپییە. هەربۆیەش هەندێ لە زاناکان ئەم تێکستەیان بە نامەیەکی ڕەسمی هاوپێچکراو لەگەڵ کۆمەڵێك دیاری لە قەڵەم دا. بەڵام تاکو ئێستا سەرچاوەی ئەم تێکستە (الرقیم) نەزانراوە. بەڵام هەندێك دەیگەڕێننەوە بۆ یەکێك لە دەوڵەتە خوریەکانی ناوچەکانی باکووری چیای زاگرۆس و ڕۆژهەڵاتی چیاکانی ئەنادۆڵ کە سەر بە سنووری مەملەکەتی ئەکەدی بووە. هەروەك لە دیاریکردنی شوێنی ئەم تێکستە مێخییە بۆ ئەم ناوچانەی باسمانکرد توێژەرەکان پشتیان بە هەندێك بارودۆخی مێژوویی نوێتر بەستاوە. بەڵام ئێمە ناتوانین بە بەڵگەی مێژوویی ئەم قسانە پشت ڕاست بکەینەوە.

ڕاستە کە ئێمە زانیاریمان دەربارەی خوریەکان زۆر کەمە لە سەردەمی ئەکەدییەکان. تەنها ئەوە نەبێت کە دەزانین لەناوچەکانی دەورو بەری شارستانییەتی وڵاتی دوو ڕووبار ژیاون. بەڵام بە تەئکیدیەوە لەدوای ئەمە(لە کۆتایی سەردەمی ئەکەدی) لێشاوێکی خوریەکان هاتوونەتە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی سەرووی ڕووباری دیجلە و تیایدا نیشتەجێ بوونە.

بەلاّم کێشەی ئاڵوگۆڕکردنی ڕۆشنبیری لە نێوان خوریەکان و نەتەوەکانی تردا ئەوا بەماوەیەکی کورت لە دوای سەردەمی ئەکەدی روویدا. ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە چەندین بنەماڵەی دەستەلاّتدار پەیدابوون کە ناوی مەلیکەکانیان خوری بووە. هەروەك ئەم مەلیکانە خۆیان لە ئاستی مەلیکەکانی ئەکەد داناوە.

مێژووی ئەم دەوڵەتە خوریانە تاکو ئێستا بە شێوەیەکی تەواو نازانرێت. بەجۆرێك کە زۆر زەحمەتە بە وردی باسێکی پەیوەست بەم دەوڵەتانە بکرێت. ئەمەش بەهۆی ناڕوونی ئەو پرسگەلانەی کە پەیوەستن بەمێژووی زەمەنی ئەم دەوڵەتە خوریانە لەلایەك و زەحمەتی دیاریکردنی شوێنی سەرهەلّدانیان لەلایەکی ترەوە. بەلاّم سەرەرای ئەمەش لە لاپەرەکانی داهاتوودا هەولێکی باشمان داوە بۆ دووبارە ڕوونکردنەوەی مێژووی ئەم دەوڵەتانە، بەجۆرێك کە ئێستاکە بووەتە ڕاستییەکی دان پێدانراو.

مەملەکەتی ئەکەدییەکان لە دوای کۆتایی هاتنی ماوەی حوکمڕانی کردنی دوایین مەلیکی ناوداریان کە ئەویش (شارکەلی شاری) (٢١١٤-٢٠٩٠ پ.ز) بوو ڕووخا. ڕووخانی مەملەکەتی ئەکەدی بەهۆی ئەو پاڵە پەستۆیە بوو کە لەلایەن گوتیەکانەوە دروستکرابوو بۆ سەر مەملەکەتەکە. نەتەوەی گوتییەکان لە ناوچەکانی چیای زاگرۆسەوە دابەزین و توانیان مەملەکەتی ئەکەدی بەیەکجارەکی لە ناوببەن.لە پاڵ هێرشی گوتییەکان، ململانێی سیاسی ناوخۆی دەسەلاّتدارانی مەملەکەتی ئەکەدی بۆ دەست گرتن بەسەر تەختی دەسەلاّت لەلایەکی ترەوە کاریگەری لاوەکی خۆی هەبوو بۆ لەناوچوونی مەملەکەتەکەیان.

گوتییەکان توانیان بەشەکانی ولاّتی بابل داگیربکەن. بەلاّم وەك مەلیکە ئەکەدییەکان دەسەلاّتیان بەسەر ناوچەکاندا نەسەپاند بۆ حوکمکردنیان. ئەمەش چونکە جۆری بیرو باوەری گوتیەکان لە حوکمکردنی ناوچەکان جیاواز بوو لەگەڵ ئەکەدییەکان. هەروەك گووتییەکان دەسەلاّتی تەواویان بەسەر هەموو ناوچەکانی مەملەکەتەکەدا نەسەپاندبوو. هەر لە بەر ئەمەش لە هەموو شوێنێك دژی گوتییەکان هەولدەدرا بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی وحوکمی زاتی. بەم جۆرە لەدوای نەمانی دەوڵەتی ئەکەدی یەکەم دەوڵەتی خووری زانراو بۆ ئێمە دروستبوو. ئەمەش دوای ئەوەی خوریەکان توانیان خۆیان لە ژێر دەسەلاّتی گوتیەکان ڕزگار بکەن.

حاکمێك کە ناوی(ئەتەل- شین) یان (تاری ـــ شین) کە ئەم ناوەش لە بنەڕەتدا ناوێکی خووری کۆنی نەسڵە. ئەم حاکمە نەقشێکی نوسراوی بەزمانی ئەکەدی لە دوای خۆیدا جێ

هێشتووه. ئەم نەقشە نووسراوە لە سەر تابلۆیەکی برۆنزی[21] نووسراوەتەوە. ئەم نووسراوەش بە بەردی بناغەی دروستکردنی پەرستگای خواوەند (نەرگال) دادەنرێت. ئەم خوداوەندەش بۆ یەکەم جار لەسەردەمی ئەکەدییەکان ناوبانگی دەرکرد. ئەم خواوەندەش (نەرگال) ڕێز و تەقدیرێکی تایبەتی هەبوو لەلای خوریەکان. هەروەك دواتر ئەم خوداوەندە پێگەیەکی گرنگی گرت لە کۆمەڵگەی ئاپینی بابلیدا. (ئەتەل- شین) لەنوسینەکەیدا خۆی ناودەبات بە(مەلیکی ئۆرکیش و نەوار) ئەم دوو شارەش لە چەند تێکستێکی نوسراوی تردا ناسراون، بەڵام تاکو ئێستا بەشێوەیەکی تەئکید نەتوانراوە شوێنی ئەم دووشارە دیاریبکرێ[22].

---

(٢١) ئەم تابلۆیە پێکهاتووە لە پەیکەری شێرێك كە دەمی کردۆتەوە، پەیکەری شێرەکەش لەسەر ئەو تابلۆ برۆنزییەی کە تێکستە مێخییەکەی (نووسینە مسمارییەکەی)لەسەر نووسراوە چەسپکراوە. ئێستاش لە مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس پارێزراوە. ئەم تابلۆیە بە شێری نورکیش یان تابلۆی عامودا ناسراوە.چونکە توێژەرەکان بە پشت بەستن بە وتەی بازرگانانی کەلوپەلی شوێنەواری دەڵێن سەرچاوەکەی شاری (عامودا) یە لە سوریا. ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی هەڵەیەکی گەورە چونکە بەپێی ئەمە توێژەرەکان دەیانگوت نورکیش دەکەوێتە گردی عامودا یان گردی شرمولا لە نزیکی شارەکە ئەم بیروبۆچوونە هەڵەیەش تا ماوەیەك باو بوو. بەڵام دواتر هەڵکۆڵینە شوێنەوارییەکان دەریان خست کە ئەم بۆ چوونە هەڵەیە و سەلماندیان کە شاری نورکیش دەوکەوێتە گردی موزان (تل موزان). هەروەك گردی عاموودا بەراوورد کرا بە شاری کولیشیناسKulishinas کە لە کۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زاین پێگەیەکی تایبەتی هەبوو.

(٢٢) ئەمەریکیەکان لە ساڵی ١٩٨٤ زایینی بە بەڕێوەبەرایەتی مارلین کیلی و جۆرجیۆ بۆتشیللاتی دەستیان کرد بە هەڵکۆڵینی شوێنەواری لە گردی موزان کە ٨ کم لەرۆژهەڵاتی عامودا دوورە تاکو ئێستاش هەڵکۆلینی تێدا بەردەوامە. لە ئەنجامی ئەم هەڵکۆلینە شوێنەوارییەدا توانرا چەندین کەل و پەلی شوێنەواری بەنرخ بدۆزرێتەوە لەنێوانیاندا مۆری لولەی کە نووسینی مێخی لە سەر نووسرابوو. کە نووسینەکانیش ئاماژە دەکەن کە ئەم ناوچەیە شاری نورکیشە کە پایتەختی خوورییەکان بووە. ئەم زانیاریەش لە کاتی نووسینی ئەم کتێبە نەزانرابوو هەربۆیەش زانیارییەکان پێویستیان بە ڕێکخستنەوە هەیە سەبارەت بەم ناوچەیە. هەرچی شاری (نەوار)ە ئەوا چەند رایەکی تری نوێ هەیە بۆ مەبەستی دیاریکردنی شوێنەکەی. کە ئەم بیرورایانەش پێچەوانەیە لەگەل بیرورای نوسەر. ئەم بیرورا نوێیانەش پشت دەبەستێت بە بەڵگەی ماددی و نووسراو کە بەم دواییە دۆزراونەتەوە. کە گرنگترینیان ئەمانەن :

- ناوی (نەوار) کە شێوازێکی زارەکییە بۆ ناوی (نەجار). و ئەسڵی هەردوو ناوەکەش وشەی (نەجوارە)Nagwar)).

ئەم شوێنەش متابقە لەگەل گردی براك (تل براك). بۆ ئەم مەبەستەش سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:

بێگومان شاری نەوار ئەو شوێنەیە کە لە سەرچاوە نووسراوەکانی ئاشوورییەکان و بابلییەکان بە (نەمار- نەمری) ئاماژەی پێکراوە. ئەم شوێنەش دەکەوێتە ناوچەکانی زاگرۆس لە نێوان هەردوو رووباری دیالە و زابی خوارووی هەروەها ووشەی(نەوار) لەناوەراستی هەزارەی دووەمی پێش زایین زۆر باوبووە لە بەکارهێناندا. کە وەك بەشێك یان برگەیەك لە پێکهێنانی ناوی کەسەکان بەکارهاتووە لەشاری نوزی کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلە.

هەرچی شاری (ئورکیشە) لەسەرەتا وایان دەزانی ئەویش بەهەمان شێوە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلە. بەڵام دواتر لە ناوچەی سێگۆشەی خابوور بەدوای داگەران.

---

J.-M. Durand: L'emploi des toponymes dans l'onomastique d'e'poque Amorrite. SEL 8(1991)81-97.

- یەك لەو پەیماننامە سیاسییانەی کە دۆزراوەتەوە لە گردی لەیلان (تل لیلان) بە ئەکەدی (شبت انلیل - شخنات) ی پێدەڵێن. ئەم پەیماننامەیەش لە نێوان مەلیکی شاری لەیلان و مەلیکی شاری کەخەت (ئێستا گردی بەرری پێدەلین)بەسترابوو. کە تیایدا باسی مەملەکەتی کەخت دەکات و دەڵێت ئەم مەملەکەتە - لە نوار درێژدەبێتەوە و تادەگاتە نوار(تێکستی ژمارە ١٣٦٢/ ساڵی ١٩٨٧) بەمەش بۆمان دەردەکەوێت دوو شوێن هەیە بە هەمان ناو، کە گومانی تێدانیە کە هەردوو ناوچەکە دەکەوێتە ناوچەی سێگۆشەی خابوور.

- (ی. ئایدم) هەڵستا بە دراسەت کردنی هەموو ئەو بەڵگانەی کە باسی شاری نەجاردەکات(ئەوانەی کە لە ناوچەکانی نیبیلا، سیپار، گردی براك، شیبت نینلیل دۆزرابوونەوە).کە تیایدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە شارەکانی نەجارو نواری باشوور(باشووری کەخت)و گردی براك هاوشێوەن(متطابق). هەرچی شاری نواری دووەمە ئەوا دەکەوێتە باکووری کەخت. لە ناوچەکانی نزیك شاری قامیشلی. کە توێژەر نواری دووەمی متابق کرد بە ناوچەی کرنواس کە لە لایەن تورکەوە هەڵکۆڵینی تێدا ئەنجامدراو لەئەنجامدا توانیان چەندین کەل وپەلی شوێنەواری جۆراوجۆر بدۆزنەوە لەنێوانیاندا هەندێك تێکستی نووسراوی مێخی(مسماری) هەبوو کە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ هەزارەی یەکەمی پێش زایین. هەروەك ئەم ناوچەیەش پاشماوەی شارێکی کۆنی تێدا دەرکەوت کە لەهەزارەی دووەمی پێش زاین بەناوی (نواڵە) یان (نواڵی) ناوبانگی دەرکردبوو. هەربۆیەش ئەم توێژەرە پێشنیار دەکات کە لە هەزارەی سێهەمی پێش زاین ناوی (نوار) گۆڕابێت بۆ (نواڵە). بۆ ئەم مەبەستەش بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوەیە :

D.Mathwes, J.Eidem: Nagqr and Tell brak.Iraq55(1993).

- (ج. بۆتشیللاتی) کە هەڵکۆلینی لە ناوچەی گردی موزان (ئورکیش) دەکرد دەڵێت لەقەبی مەلیکی خووری (ئەتەل- شین) ئاماژە بە شارە سەرەکیەکەی (ئورکیش) ناوچە چیاییەکانی بەرامبەری لەلای باکووری رۆژئاوایەوە.واتە بەشی ڕۆژئاوای کێوی عابدین (نوار).بۆ ئەم مەبەستەش سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:

G. Buccellati and M.K.Buccellati:Urkesh The First Hurrian capital.Biblical Archaeologist 60 (1997)92f…

لەکۆتاییدا (ڤان لایر) (van Liere) لە ساڵی١٩٥٧زایینی و هروودا (Hrouda)لە ساڵی ١٩٥٨ زایینی توانیان شوێنی شاری ئورکیش دیاریبکەن ئەویش گردی عامودا[٢٣] بوو کە دەکەوێتە باکووری شاری عامودا نزیك سنووری نێوان سوریا و تورکیا.

یەکێك لە گرنگترین پاڵنەرەکان بۆ ئەم بەراورد کردنە (دیاریکردنی شوێنی شاری ئورکیش) ئەو زانیاریانە بوو کە لە تێکستێکی سەردەمی بابلی کۆندا هاتبوو. کە بەشێوازی ڕۆژانە یان وەك ڕێ نیشاندەرێك(دەلیل) زانیارییەکانی تێدا نوسرابوو. کە تیایدا ئاماژەی بە ژمارەی وێستگەکانی گەشتێکی بازرگانی لە شاری سیپارەوە بۆ شاری ئیمار (تل المسکنە)ی نزیك پێچەکەی (منعطف) رووباری فورات دا کردبوو. لەم تێکستەدا باسی ئورکیش دەکات لەکاتی باسکردنی ڕێگەی گەرانەوەدا. کە ئەم شارە وێستگەی دوای شاری (ئەشنەککوم) پێکدەهێنێت (ئەمەش ڕەنگە متابق بێت لە گەڵ ناوچەی - چەگار بازار- ی ئێستا؟).

وا پێدەچێت شاری ئوورکیش لەسەردەمی بابلی کۆندا بچووك بووبێت و گرنگییەکی زۆری نەبووبێت. ئەمەش چونکە کاروانە بازرگانییەکان تیایدا نەوەستاون لەکاتی چووندا، هەروەك لەکاتی گەڕانەوەشیاندا تەنها یەك شەو تیایدا (لە ئوورکیش) ماونەتەوە. ئەمە لەو کاتەی کە چەندین ڕۆژ لە شارە گرنگەکاندا ماونەتەوە.

لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا زۆرجار ناوی چەند شارێك وەك یەك بووە. ئەگەر ئەم خاڵە بە بەرچاوەوە وەربگرین، ئەوا ڕەنگە ئەو شارەی کە بە ئورکیش ناسراوبووە لەسەردەمی بابلی کۆندا، هەمان ئەو ئورکیشە نەبێت کە بە مەڵبەندی مەملەکەتی خووری دادەنرا لە کۆتایی هەزارەی سێهەمی پێش زایین. هەروەك ئەم شارە لەهەمان کاتدا شارێکی ئایینی گرنگ بووە کە بە مەڵبەندی پەرستنی خوداوەند کوماربی دادەنرا. کە ئەمەشیان خوداوەندی سەرەکی بووە لە ئەفسانە خوریەکان.

بەم پێیەش ئەگەر ئەوە راست بێت کەدەڵێن ئورکیش دەکەوێتە ناوچەی خابوور. ئەوە دەبێت دان بنێین بە بوونی مەملەکەتێکی خووری سنوور فراوان.کە سنوورەکەی لە ناوچەی سێگۆشەی خابوور درێژدەبێتەوە و تاکو دەگاتە ناوچەکانی رووباری دیالە. کە باکووری وڵاتی (ئاشوور)یش دەگرێتە خۆ. بەڵام درێژبوونەوەی مەملەکەتی ئورکیش بەرەو لای باکوور بە وردی نازانرێت، بەڵام ڕەنگە گەیشتبێتە ناوچە چیایەکانی باشووری دەریاچەی وان. چونکە لەم ناوچەیەدا دوای تێپەربوونی پانزە سەدە زمانی خووری تیایدا هەر بەکارهاتووە.

---

(٢٣) مەبەستمان گردی شەرمولایە (تل شرمولا) کە دەکەوێتە کوردستانی سوریا.

(ئەتەل- شین) لە یەکێك لە نووسینەکانی (لەنەقشێکی نووسراوی) دا وەسفی خۆی دەکات و دەڵێت من کوڕی(شەتەر- مات)م. ئەم ناوەی دوای لە تێکستەکانی تردا ئاماژە بەم ناوە نەکراوە، بەڵام ناوەکەی ناوێکی خوورییە. ناتوانین ماوەی حوکمکردنی (ئەتل- شین) بەشێوەیەکی تەواو دیاریکەین. بەڵام وا گومان دەکرێت کە لە کۆتایی سەردەمی گوتییەکان حوکمی کردبێت (٢٠٩٠- ٢٠٨٤)پ.ز یان کەمێك دوای ئەم سەردەمە حوکمی کردووە، واتە لە دەساڵی یەکەمی سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم(٢٠٤٧- ١٩٤٠ پ. ز) حوکمی کردووە. هەروەها تێبینی دەکرێت کە شێوازی ئەو دوعا و لەعنەتانەی کە مەلیك (ئەتەل- شین) لە نووسینەکەیدا کردوویەتی وەك ئەو لەعنەتانەیە کە مەلیکی ئەکەدی (نەرام — سین) لە نووسینەکانی (لەسەر نەقشەکانی) کردوویەتی(٢١٥١- ٢١١٥).

مەلیکێکی تری خووری هەبووە کە لە کۆتایی سەردەمی ئەکەدیەکان یان لە ماوەی سەردەمی گوتییەکان حوکمی کردووە. ئەم زانیارییەش لە تێکستێکی نووسراوی تایبەت بە شەعائر و ڕێوڕەسمی ئایینی (خووری — حیسی)ەکان ئاماژەی پێکراوە. ئەم تێکستەش لە خاتووشای پایتەختی حیسەکان دۆزراوەتە. شایانی باسە ئەم تێکستە بە چەند سەدەیەك دوایی فەرمانڕەوایی کردنی ئەم مەلیکە نووسراوەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری کردووە لەداب و نەریتە بنەرەتیەکانی سەردەمی ئەکەدی. ئەم مەلیکەش ناوی (کیکلیب- ئەتەل)ە، ئەو شارەی کە تیایدا حوکمی کردووە ناوی(توکریش)ە، کە تاکو ئێستا بەوردی شوێنەکەی نازانرێت و دیاری نەکراوە. بەڵام هەواڵی ئەم شارە لە سەرچاوە نووسراوەکانی سەردەمی بابلی کۆندا هاتووە. بە پێی ئەم سەرچاوە بابلیانە ئەم شارە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی دوو ڕووبار(وادی الرافدین)[٢٤].

بەڵگەنامەکانی سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێیەم ئاماژە دەکەن بەوەی کە ناوچە چیاییەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری وڵاتی دوو ڕووبار کەسانێکی تیادا دەژیا کە خوری زمان بوون. هەر لەم سەردەمەدا (سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم)خوریەکان توانیان لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە و باکووری ڕووباری دیالەش بڵاوببنەوە. هەربۆیەش دەبینین دانیشتوانی مەملەکەتەکانی ئەم ناوچانە (هەندێك لەم مەملەکەتانە لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی ئووری سێهەم بوون)زۆرینەیان خووری بوون، هەندێکیشیان سۆمەری بوون، بەڵام ئەسڵی هەندێکیان تاکو ئێستا نەزانراوە. ئەگەر بەپێی تێکستە نووسراوەکان دیاری کردنی شوێنی هەندێك لەو شارانەی کە

---

(٢٤) هەندێك لە توێژەرەکان دەڵێن شاری توکریش دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی ئورمیا.

لەتێکستەکاندا باسکراون راست بێت. ئەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زمانی خووری گەیشتۆتە ناوچەکانی ڕۆژئاوا، بەلایەنی کەمەوە تاکو سەرچاوەکانی ڕووباری خابوور.

نازانرێت کە مەملەکەتی ئورکیش مابۆوە یان نا(بەو فراوانییەی کە وەسفکرابوو بەپێی نازناوەکەی (ئەتل - شین) لە سەردەمی مەلیك شولگی(۲۰۲۹-۱۹۸۲ ق.م) کە دووەم مەلیکی بنەماڵەی ئوری سێیەمە. مەلیك شولگی لە نیوەی دووەمی ماوەی حوکم کردنیدا هەوڵیدا ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی سەرووی ڕووباری دیجلە بخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆی، بەڵام دانیشتوانی ناوچەکە بەرگرییەکی زۆر توند و ئازایانەیان کرد دژ بە هێرشەکانی مەلیك شولگی. ئەمەش لە ئەنجامی ئەو پەلامارە زۆرانەی شولگی بۆ سەر ئەم ناوچانە دەردەکەوێت.

ساڵنامەی سەردەمی مەلیك شولگی[۲۵] ئیشارەت بە شاڵاو و پەلامارەکانی ناوبراو دەکات. کە دەتوانین لە سێ شەڕی بنەڕەتی کورتی بکەینەوە. یەکەم و دووەمیان دژی هەردوو وڵاتی (کاررەخەر و سیموررروم) بوو کە هەردووکیان دەکەونە باکووری ڕۆژهەڵاتی چیای حەمرین. بەڵام سێیەمیان شەڕێکی گشتی بوو، کەتیایدا شولگی توانی هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە ببرێت و بگاتە ناوچەی شاشروم[۲۶] و ئوربیلۆم (هەولێری ئێستا)و وڵاتی لولوبییەکان لە ناوچەکانی سلێمانی ئێستا دا.

جێنشینی شولگی کەناوی (ئەمار- سین) (۱۹۸۱- ۱۹۷۳پ.ز) بوو ئەمیش دەسەڵاتی بەسەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە سەپاند. ئەمەیان (ئەمار-سین) تەنها دوو شاڵاوی ئەنجامداوە بۆ سەر هەردوو شاری ئوربیلۆم(هەولێر)و(شاشروم). کە ئەم دووشارە لە رووی گرنگییەوە لە پێشەوەی ناوچەکانی تر دەهاتن بۆفراوان کردنی دەسەڵاتی.

---

(۲۵) لە کۆندا هەرمەلیکەك ساڵنامەی تایبەت بەخۆی هەبوو کە یەکەم رۆژی هاتنە سەردەسەڵات بەیەکەم رۆژی ئەم ساڵنامەیە دادەنرا، بە مردنی مەلیك خۆیساڵنامەکە کۆتایی پێدەهات، هەر ساڵێکیش بە ناوی رووداوەکی گرنگ یان شەڕێك یان کارێکی گرنگی مەلیك ناودەنرا.(وەرگێڕ)

(۲٦) شاری شاشروم یان شوشەڕا دەکەوێتە ناوچەی گردی شمشارە کە ئەمڕۆ بەشێکی کەوتۆتە ژێر ئاوی حەوزی دوکان لە کوردستانی عێراق، ئەم شارە کۆنە لەلایەن تیمێکی شوێنەوارناسی دانیمارکی لە کۆتایی ساڵانی پەنجاکان هەڵکۆڵینی تێدانەنجامدرا. لە گرنگترین دۆزراوەکان تیایدا بریتی بوو لە ئەرشیفێك - لە تێکستی کۆن کە بە نووسینی مێخی نووسرابوون کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ۱۸ پێش زاین. هەندێك لەم تێکستانە لە لایەن J.Laessoe بلاوکرایەوە، بەڵام دواتر گشت تێکستە ئیدارییەکان بلاوکرانەوە لە :

J. Eidem: The Shemshara Archives 2. The Administratives Texts.Copenhagen, 1992.

مەلیك شولگی لە  شەڕەکانیدا دژی خوریەکان توانی ژمارەیەکی زۆر لە خوریەکان بەدیل بگرێت و بیانگوازێتەوە بۆ وولاتی سۆمەر. کە ئەم دیلانەی وەك هێزی کار(کۆیلە) بەکاردەهێنا لەناوچەی سۆمەر. هەر بۆیەش ژمارەیەکی زۆر لە ناوی خوریەکان لە تێکستە نوسراوەکانی ئەم سەردەمەدا هاتووە. بەتایبەتی ئەو تێکستانەی کە لە باشووری نێوان دوو رووبار دۆزراونەوتەوە. بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە خوریەکان لە باشووری ولاتی دوو رووبار نشینگەی خووری سەربەخۆیان پێکهێنابێت لەرووی زمان و شارستانییەتییەوە. بەڵکو مانای ئەوە دەگەینێت کە ئەو خوریانەی کە لە سروشتی شارستانییەتی خۆیان لابردراون و گواستراونەتەوە بۆ ولاتی سۆمەر بەشێوەیەکی خێرا خۆیان لەگەڵ ئەو کۆمەڵگە نوێیە گونجاندووە. بەڵگەو شایەتیش لەسەر ئەمە هەیە. لەوانە پیاوەکی خووری کەناوی(ئوناب-شین)ە بەڵام کورەکەی ناوێکی سۆمەری هەیە، کە پێگەیەکی بەرزو بەرێزی هەبووە لە ناو کۆمەڵگەدا لە کۆن دا نووسەر پلەو پایەیەکی بەرزی هەبووە، کە پلەکەی لە ئاستی نووسەر (کاتب) بووە.

ئورکیش لەدەرەوەی ناوچەکانی ژێر دەستەلاتی مەلیکەکانی ئوور مایەوە. هەربۆیەش لە ڕاپۆرتەکانی تایبەت بەو شەڕانەی کە مەلیکەکانی بنەماڵەی ئووری سێهەم کردوویانە باسی ئەم شارە ناکرێت. هەروەها بەڵگە و دەلیلمان لە بەردەستدا هەیە لەسەر بوونی پەیوەندی دبلوماسی لە نێوان هەردوو شاری ئوور و ئورکیش.

ماوەی فەرمان ڕەوایکردنی مەلیك (شو-سین) ١٩٧٤-١٩٦٤ پ.ز دەخایەنێت. کە ئەم ماوەیەش بە پێچەك(منعطف) دادەنرێت لە مێژووی مەملەکەتی ئوردا.چونکە ئەم مەلیکە لە ناکاو خۆی بە گەمارۆدراوی و لە هەلوێستەکی بەرگریکاری بینییەوە. ئەمەش لە ئەنجامی پاڵپەستۆی هۆزە ئامورییەکان روویدا کە لە باکووری ڕۆژئاواوە دەهاتن. بەرچاوترین بەڵگەش لەسەر ئەمەش دروستکردنی شوورایەك بوو. ئەم شوورایەش تاکو باکووری شاری بەغدادی ئێستا درێژببوەوە. واتە لە رووباری فورات تاکو رووباری دیجلەو دیالە درێژببووەوە. ئامانج لە دروستکردنی ئەم شوورەیەش ڕاگرتنی هێرشە لەناکاوەکانی هۆزە رەوەندکاریە ئامورییەکان بوو بۆ سەر ناوچە شارستانییەکان.

نازانین تا چ ڕاددەیەك ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی رووباری دیجلە لەم ماوەیەدا لە ژێر دەستەلاتی بنەماڵەی ئوور ئازادیان بووە. بەڵام گومانی تێدا نییە کە دەسەلاتی ئوور لەسەر ئەم ناوچانە بە تەواوی کۆتایی هات لەسەردەمی مەلیك (ئبی- سین) (١٩٦٣ — ١٩٤٠پ.ز)کە ئەمەشیان دواهەمین

مەلیکی بنەماڵەی ئوری سێهەم بوو. لەم قۆناغەدا یەکێك لە مەلیکەکانی ئوورکیش کە ناوی (تـیش — ئەتەل) بوو توانی دەسکەوتەکانی سەردەمی مەلیك (ئەتەل- شین) بە دەست بهێنێتەوە، بـەجۆرێك کە توانی مەملەکەتی ئوورکیشی خوریەکان جارێکی تر فراوان بکاتەوە و بگاتە ناوچـەی زۆر دوور لـە رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلات.

ئەم مەلیکەش (تیش — ئەتەل) ناوی لە چەندین نەقشی نوسراودا دەردەکەوێت. بەلام ئەم نەقـشە نووسراوانە هەمووی تایبەت نییە بە یەك مەلیك بەڵکو ئەم نەقشە نووسراوانە دەگەرێنـەوە بـۆ چـەند مەلیکەك بەلام هەموویان یەك ناوی وەك یەکیان هەیە کە ئەویش (تیش — ئەتەل)ە. بەلام دواتر توانرا ماوەی فەرمانڕەوایی کردنی ئەم مەلیکە(تیش — ئەتەل) دیاریبکرێت، ئەمەش بەهۆی دوو بەڵگەنامە کە لە ئەشنونا (گردی ئەسمەر — تل أسمر- لە سەر رووباری دیالـە) دۆزرابـوەوە. لـەم دوو بەڵگەنامـە نووسراوەدا دەردەکەوێت کە (تیش — ئەتەل) نازناوی(پیاوی نەینەوا)ی بۆ خۆداناوە. ئەم مەلیکە(تیش - ئەتەل) لە بەشەکانی باکووری ولاتی ئاشوور بەتایبەتی لە شاری نەینـەوا حـوکمی کـردووە. شـاری نەینەوا بە مەڵبەندی ئایینی سەرەکی خوریەکان دادەنرا کە خوداوەندێکی گرنگی خوریەکان کـە نـاوی (شاووشکا) بوو تیایدا دەپەرسترا.

ئەم دوو نەقشە لە ساڵی سێهەمی فەمانڕەوایکردنی شوسین مەلیکی ئوور نووسراوەتەوە واتـە لـە ساڵی ١٩٧١ پ.ز. یەکێك لەم دوو نەقشە ئاماژە دەکات بەوەی کە تیش- ئەتەل لەگەڵ سەربازەکانی کە ژمارەیان زیاتر لە ١٠٠ سەرباز بووە هەڵستاوە بە لێکۆڵینەوە لە فەرمانی مامی مەلیکی ئـوور و سەرکردەی هێزەکانی کە بـە سـەرکەوتوانە هێرشـێکی سـەربازی دژی ولاتـی (سـیمانوم) بـە ئـەنجام گەیاندوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بگاتە نزیك سنووری ناوچـەکانی ژێـر دەسـەلاتی(تـیش ــ ئەتەل).

تیش ــ ئەتەل (وەك مەلیك ئەتەل ــ شین) نەقشێکی نووسـراوی لەدوادا بەجێماوە. ئەم نەقشەش بە بۆنەی دانانی بەردی بناغـەی دروستکردنی پەرستگای خوداوەند (نەرگال) نووسیوە. ئـەم نەقـشەش بەزمانی خووری نوسراوە. بەنسبەت ئێمە ئەم نەقشە بەکۆنترین تێکستی نووسراو بـە زمـانی خـووری دادەنرێت کە تاکو ئیستا لەبەردەست دابێت. لە نەقشە نووسراوەکەدا ئەمانەی خوارەوە هاتووە[٢٧]:

{تیش ئەتەل هەڵستا بەدروستکردنی — ئینـدەن ئـوورکیش- پەرسـتگایەك بـۆ خوداوەنـد (نەرگال). خۆزگـە خوداوەنـد (لوباگـادا) ئـەم پەرسـتگایە دەپـارێزێ. ئـەوەی بیـەوێت ئـەم

---

(٢٧) بگەرێوە بۆ : Andre Parrot, Jean Nougayrol :Un document de foundation hurrite. Ra42 (1948)1-20

پەرستگایە تێکبدات دەخوازم کە  خوداوەند لوباگادا لەناوی ببات و بیفەوتێنێ. دەخوازم کە خوداوەندی کەش (تیشووە) دوعا و پارانەوەکانی قەبوولّ نەکات و دەخوازم کە خوداوەندی خاتوونی شاری نەجار[٢٨] و خوداوەندی خۆر و خوداوەندی کەش............... هتد ئەوەی کە تێکی دەدات).

(تیش- ئەتەل) لەم تێکستەیدا بە "ئیندەن ئورکیش" خۆی ناو دەبات. ئەمەش نازناوێکە کە گەران بە دوای ماناکەی شتێکی زەحمەتە و نازانرێت. بەلاّم ئێستا ئێمە دەزانین کە لەم نازناوە(ئیندەن)دا پاشگری (دەن) کە زۆر بەکاردێت لە ناوە خوریەکان دەلالەت لەسەر وەزیفەیەك یان پیشەیەك دەکات. بەلاّم بۆتەفسیرکردنی برگەی "ئین" دوو رای سەرەکی هەیە کە ئەمانەن :

١- ئەم برگەیە هاوشێوەی وشەی (ئین - EN)ی سۆمەرییە کە دەلالەت لەسەر یەك لە پلەکانی دەسەلاّتی حوکمکردن دەکات. بەمانای گەورە (سید) دێت

٢- پەیوەندی بە وشەی (ئین – EN)ی خووری هەیە کە لە نووسراوە خوریەکانی هەزارەی دووهەمی پێش زاین بە مانای (خودا) دێت.

ئەگەر ئەم رایەی دووەم ڕاست بێت ئەوە ئێمە ڕاستییەکی ترمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە کە مەلیکە خوریەکان خۆیان کردووە بە خودا[٢٩] لە کۆتایی سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم. ئەمەش وەك چاولێکردنێك لە مەلیك شولگی و جێنشینەکانی بووە.

مۆرێکی لوولەیی (پادشای) هەیە کە سەرچاوەکەی نازانرێت لە کوێ دۆزراوەتەوە. ئەم مۆرە لوولەییە نووسینێك لە خۆ دەگرێت کە ئەمە دەقەکەیەتی : (تیش ـــ ئەتەل مەلیکی کاررەخەر..............) هەروەها لەپێش ناوی (تیش ـــ ئەتەل) ئەو هێمایە نووسراوە کە

(٢٨) ئەم خوداوندە (Belet Nagar) یەکێك بوو لە خوداوندە سەرکیەکان لە ناوچەی سێگۆشەی خابوور. هەروەك (خاتوونی ولاّتی نابووم) واتە ئەو خوداوەندەی کە ناوچەکانی شەخنا /شوبەت ئینلیل (گردی لەیلان) بە مەڵبەندی دادەنرا. ناوی ئەم خوداوەندە زۆر هاتووە لە بەڵگەنامەکانی گردی لەیلان و چەندین ناوچەی تریش.

(٢٩) لەم سەردەمەدا زۆر لە مەلیکەکان خۆیان دەکرد بە خوداوەند وەك مەلیکی بنەماڵەی ئووری سێهەم (شولگی) کە ئەمەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی تایبەتی ولاّتەکە لەرووی سیاسیی و ئابووری و ئاسایشەوە...هتد.هەربۆیە بەدوور نازانرێت کە مەلیکە خووریەکانیش لەم سەردەمەدا خۆیان کردبێت بەخوداوەند.

دەلالەت لە سەر خودایەتی دەکات.. یەکێك لە بەڵگەکانی تر سەبارەت بەخۆ لە قەڵەمدانی مەلیکەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە بە خوداوەند ئەوا نەقشی نووسراوی مەلیك (ئیدی ــ سین)ە مەلیکی سیمموررروم (کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد) و مۆری لوولەیی کوڕەکەی (ئیدی ــ سین) کە ناوی (زابا ــ زوونا) بوو، هەروەك ئەم دیاردەیە لەسەر مۆری لوولەیی مەلیکێکی تر لە مەلیکەکانی کاررەخەر کە ناوی (زەردا ــ موو) بووە دەردەکەوێت.

مۆرەکەی (تیش ــ ئەتەل) لە ڕووی شێوازەوە بۆ سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم یان کەمێك دواتر دەگەڕێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە هاوجووتییەك هەیە لە نێوان مەلیك (تیش ــ ئەتەل)ی شاری ئورکیش و مەلیك (تیش ــ ئەتەل)ی شاری کاررەخەر. کە لەڕووی مێژوویەوە تەواو متابقی یەکترن بەبێ بوونی هیچ جیاوازیەك.

شاری کاررەخەر لە سەرچاوە ئاشوورییەکان بە شاری (خەرخار) ناسراوە. ئەم شارەش دەکەوێتە ناوچەکانی سەرووی ڕێڕەوی ڕووباری دیالە. بەم جۆرەش ئێمە هێمایەکی گرنگمان بۆ ڕوون دەبێتەوە سەبارەت بە فراوانی سنووری مەملەکەتی ئوورکیش لە کۆتایی سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم. کە تارادەیەك وەك سنووری مەملەکەتەکەی سەردەمی مەلیك (ئەتەل ــ شین) کە لە دوای کۆتایی هاتنی سەردەمی ئەکەدی توانیبووی پێکی بهێنێت.

چارەنووسی مەملەکەتی ئورکیش دوای ئەمانە ناڕوونە و نازانرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی دەکرێت کە کەلتووری نووسینی خوریەکان تاکو کۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زایین پارێزگاری کردووە لەسەر هەندێك ناو کە مێژووەکەیان بۆ قۆناغی دامەراندنی مەملەکەتەکە دەگەڕێتەوە. لە نێوانیاندا ناوی حاکمەکانی ئەکەد (تەنانەت شارکەلی شاری) و ناوی چەندین مەلیکی تر کە لە وڵاتە چیاییەکانی ڕۆژهەڵات حوکمیان دەکرد. ڕەنگە ناوی مەلیك (ئەتەل ـ شین) لە نێوانیاندا هاتبێت.

تێکستە نووسراوەکان بۆمان دەردەخات کە مەملەکەتی ئورکیش هاوشان بووە لەگەڵ مەملەکەتی ئەکەد، هەروەك لەلایەکی ترەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە مێژووی خوریەکان تەنها لەسەر لایەنی زمانەوانی نەوەستاوە بەڵکو لە یەکەیەکی مێژوویی سەربەخۆی پێکەوە بەستراو پێکهاتووە.

ڕووخانی مەملەکەتی ئووری سێهەم بووە هۆی بەهێز بوونی دەسەڵاتە خۆمالییەکان لە باکووری وڵاتی دوو ڕووبار و ناوچەکانی سەرووی ڕووباری دیجلە(باکووری ڕووباری دیجلە). ئەمەش نەبووە هۆی سەرهەڵدانی مەملەکەتێکی سنوور فراوان لە باکوور. بەڵکو بووە هۆی

سەرهەڵدانی چەندین دەوڵەتی بچووکی سەربەخۆ، هەروەك لە نەخشەی سیاسیدا ڕوون دەبێتەوە. ئەم دەوڵەتە بچووکە سەربەخۆیانەش بەزۆری لە شارێکی سەرەکی و ناوچەکانی دەوروبەری پێکدەهاتن. لە بەرکەمی بەڵگەنامە مێژووییەکانی تایبەت بەم دەوڵەتۆکانە مێژووەکەیان تاکو ئێستا نازانرێت.

کۆنترین تێکستە نووسراوەکانی هەزارەی دووەمی پێش زایین کە زانیاریمان پێدەدەن دەربارەی بارودۆخی وڵاتی ئاشوور و باکووری سوریا (کوردستانی سوریا)و وڵاتی ئەنادۆڵ(کوردستانی تورکیا) بریتین لە بەڵگەنامە نووسراوەکانی بازرگانە ئاشوورییەکان. چونکە ئەم بازرگانە ئاشووریانە لە سەرەتای سەدەی هەژدەمی پێش زایین لە بازرگانی کردنی کانزا بەنرخەکان و تۆتیا و بەرهەمەکانی ڕستن وچنین لە نێوان وڵاتی ئاشوور و ئەم ناوچانەدا کاریان دەکرد.

کۆمەڵێك لە تۆمارە بازرگانییەکانی ئەم بازرگانە ئاشووریانە دۆزرایەوە لە ژمارەیەك لە مەڵبەندە بازرگانییەکانی وڵاتی ئەنادۆڵ. لە بەناوبانگترینیان ئەو گردەیە کە ئەمڕۆ بە (کول تەپە) ناسراوە. لەم گردەدا پاشماوە شوێنەواریەکانی شاری کانیش[٣٠] دۆزرایەوە. شاری کانیش بەیەکێك لە گرنگترین شارەکانی ئەنادۆڵی کۆن دادەنرێت. کە لەم شارەدا (کانیش) کۆمەڵێکی زۆر لە بەڵگەنامەی نووسراو (تێکستی مێخی) دۆزرایەوە.

لەم بەڵگەنامە نووسراوانەدا ناوە خوریەکان زۆر بەکەمی هاتووە. هەر بۆیەش خەملاندنی فراوانی چوارچێوەی ئەم ناوچانەی کە زمانی خووری تێدا بەکاردێت لە وڵاتی ئەنادۆڵ لە سەردەمی ئاشووری کۆندا کارێکی زەحمەت و گرانە.

لە شاری کانیش نامەیەك دۆزرایەوە کە لە لایەن میرێك بە ناوی (ئانوم- خیربی) کە لە شاری (ماما)[٣١] فەرمان ڕەوایی دەکرد بۆ حاکمی شاری کانیش ڕەوان کرابوو. ئەم شارەش (ماما)دەکەوێتە ناوچەکانی دەوروبەری شاری مەرعەشی ئێستاوە. گەر ئەمە ڕاست بێت - زۆربەی توێژەرەکانیش وای دەبینن- کە ناوی (ئانوم- خیربی) ناوێکی خووری بێت ئەوە دەتوانین بڵێین کە ناوچەکانی شاری ماما (کە لە سەدەی ١٤ی پێش زایین بە تەئکیدی زمانی

---

(٣٠) ئەم شارە دەکەوێتە نێوان شاری کیساری و ڕووباری کیزیل ئیمارق لە کوردستانی تورکیا.

(٣١) زۆربەی توێژەرەکان شاری ماما MAMA متابق دەکەن بە ناوچەی گۆکسون Goksun کە دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی کول تەپە (کانیش).

خووری تێدا بەکارهاتووە) هەر لە سەرەتای سەدەی ١٨پ.ز کەسانێکی تیایدا ژیاون کە خووری زمان بوونە. یان ناوچەکە(شاری ماما) لە لایەن بنەماڵەیەکی خووری حوکمکراوە. بەڵام ئێستا ناتوانرێت ئەم تێروانینە تەئکید بکرێتەوە.

سەرچاوە مێژوویەکان لەگەڵ کۆتایی سەدەی ١٨پ.ز زۆردەبن بەتایبەتی لە سەردەمی شمشی ئەدەدی مەلیکی ئاشوور و خامورابی(حامورابی) مەلیکی بابل. لە دیاریترین سەرچاوە مێژووییەکان بریتییە لەو بەڵگەنامانەی کە لە مەملەکەتی ماری لەسەر رووباری فورات دۆزراونەتەوە. کەئەم بەڵگەنامانە باسێکی تەواومان پێدەدەن دەربارەی دەوڵەتێکی خووری کە سنوورەکەی لە باکووری سوریا (کوردستانی سوریا)و باکووری وڵاتی دوو رووبار(کوردستانی عێراق) درێژدەبێتەوە تاکو دەگاتە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە وچیای زاگرۆس.

بەخووری لە قەڵەم دانی ئەم دەوڵەتانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەناوی مەلیکەکانیان خوریە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ئەم دەوڵەتانە بەخووری قسەیان کردووە. ئەمەش بە پشت بەستنمان بە ئامارکردنی ناوی تاکەکانی دانیشتوو لەم ناوچە فراوانەی کە دەکەوێتە باشووری زنجیرە چیا بەرزەکانی(تۆرۆس)ەوە.

لێرە دەتوانین رەخنەیەکی مەنهەجی بگرین بەوەی نابێت خۆمان لەو ڕاستییە لابدەین کە ئینتمائی زمانەوانی ناوی کەسێك نابێتە بەڵگەو دەلیل لەسەر دیاریکردنی زمانی کەسەکە. ئەگەر سەدا پەنجای ناوەکان خووری بێت ئەوە مانای ئەوە نییە کە نیوەی دانیشتوانی مەملەکەتەکە بەزمانی خووری قسەیان کردووە. لەلایەکی ترەوە پاساو هێنانەوە بە هۆی دیاردەی ناوە زۆرباوەکان(ناوە مۆدێلەکان) لەم ڕێرەوە نابێتە پاسایەکی گرنگ و بایەخدار لەلایەنی دراسەت کردنی ناوی کەسەکان لە رۆژهەڵاتی کۆندا.

بەڵام ئەگەر ئەوە لەبەر چاوبگرین کە ئەو کەسانەی ناوەکانیان خوریە، ئەوە یان بەزمانی خووری قسەیان کردووە یان سەر بە خێزانێکی خووری زمانن. بۆیە لێرەدا دەبێت دان بنێین بەبوونی پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕ لەنێوان چۆنییەتی بڵاوبونەوەی ئەم ناوە خوریانە لە ناوچەکان و قەبارەی کۆچی خوریەکان کە لە سەردەمانێکدا روویدابوو کە دەگەڕێتەوە بۆ پێش مێژووی ئەم ناوانە.

چەندین تێکستی نوسراو دۆزرانەوە لە شاری ئالالاخ کە دەکەوێتە خوارووی رووباری عاسی. ئەم ناوچەیەش بەدوورترین ناوچە دادەنرێت لە ناوچەکانی رۆژئاوا کە تیایدا تێکستی نووسراوی تایبەت بەسەردەمی بابلی کۆنی دۆزراوەتەوە. لەناو ئەم تێکستانەش ناوی چەند

کەسانێکی خووری هاتبوو.

ئەو ناوە خوریانەی کەلە تێکستەکانی چینی حەوتەم(الطبقة السابعة)دا هاتووە(چینی حەوتەم مێژووەکەی دەکەوێتە نێوان نیوەی یەکەمی سەدەی ١٧ تاکو ١٥٦٠پ.ز) نزیکەی نیوەی ناوەکانی پێکدەهێنێت و ڕێژەی ئەو تاکانەی کەناوی خوریان هەڵگرتووە دەگاتە نزیکەی ٣٧,٥٪ کۆی گشتی دانیشتوان بە شێوەیەکی گشتی.

بەڵام ئەو تێکستانەی لە چەگار بازار[٣٢] (ئەشنەککوم)ی کۆن دۆزراونەتەوە لەناوچەی سێگۆشەی خابوور. ئەوا ڕێژەی ناوە خوریەکان تیایدا بەم زۆرییە نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرنج ڕاکێش بوو. کە بەلایەنی کەمەوە دەگەیشتە ٢٠٪ کۆی گشتی ئەو ناوانەی کە لەتێکستەکاندا هاتبوون.

هەروەك لە تێکستە دۆزراوەکانی گردی رماح (تل رماح)ناوە کۆنەکەشی (کارەننا یان قەتتارا)[٣٣]یە ڕێژەیەکی زۆر ناوی خووری تیایدا هاتبوون[٣٤]. مێژووی ئەم تێکستە نووسراوانەی گردی رماح دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بابلی کۆن.گردی رماح (قەتتارا) دەکەوێتە نێوان نەینەوا (موصل)و چیای سەنجار.

---

(٣٢) هەڵکۆڵینەکانی شوێنەوارناسی ئینگلیز (مالەوان) – لەگەڵ خێزانەکەی نەجاسا کریستی کە نووسەرێکی ناسراوبوو- لە ساڵی ١٩٣٥- ١٩٣٧ زاینی لە ناوچەی چەگاربازار توانی ئەرشیفەکی بچووك لە بەڵگەنامەکانی سەردەمی بابلی کۆنی بدۆزێتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٨ پ.ز.ئەم ئەرشیفە نزیکەی حەفتا بەڵگەنامەی ئیداری و ئابووری لە خۆ گرتبوو.

(٣٣) هەڵکۆلینەکانی شوێنەوارناسی ئینگلیزی (ئۆتس) لە گردی رماح لەنێوان ساڵانی ١٩٦٤- ١٩٧١ بووە هۆی دۆزینەوەی ئەرشیفێکی لە بەڵگەنامە، کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی بابلی کۆن (سەدەی ١٨ پ.ز) وە دەگەڕێتەوە، ئەم ئەرشیفە نزیکەی ٣٤١ تابلۆی مێخی لەخۆ گرتبوو کە بەشی هەرەزۆری پەیوەندی بەلایەنی ئابوری و بەڕێوەبردن هەبوو. هەروەها ١٥١ نامە تیایدا بۆ شاژن (ئیلتانی) رەوانکرا بوو. هەروەك لە لێکۆلینەوەکان بۆمان دەرکەوت کە ناوی کۆنی ئەم شوێنە (قەتتارا)یە.

(٣٤) توێژەر ستیڤانی دیللی هەستا بە بەراووردکردنێك لە نێوان ناوە خوورییەکانی هەریەك لە تێکستەکانی گردی رماح و گردی چاگار بازار، لە ئەنجامدا بۆی دەرکەوت کە ناوەکانی گردی رماح نزیکەی ١٥,٨٪ ئەوناوانەی کە لەنامەکانی شاژن ئیلتانیدا هاتووە، پێکدەهێنێت و نزیکەی ٤٢٪ناوەکان لە تێکستەکانی تردا هاتووە، وەنزیکەی ٢٠,٦٪ی ناوەکان لە تێکستەکانی چاگار بازار داهاتووە.

ناوە خوورییەکان لە تێکستەکانی ناوچەی چەگار بازاڕ و گردی رماح بە پلەی یەکەم لەلیستی تێکستەکانی تایبەت بە دابەشکردنی خۆراك بەسەر کرێکارەکاندا دەردەکەوێت. ڕەنگە ئەمانەش وەك دیلی جەنگ یان وەکو کۆیلە کراین و هێنرابێتنە ئەم دوو شارە.

لە شاری ماری بارودۆخەکە جیاوازییەکی زۆری نییە. کە ناوە خوریەکان لە تێکستەکانی ماریدا لە لیستی هاوشێوەی لیستەکانی چەگار بازاڕو گردی (رماح) دا هاتووە. هەر بۆیەش بەدوور دەزانرێت کە رێژەیەکی خووری خاوەن پلە و پایە هەبن لەنێوان دانیشتوان لە ناوچەکەدا. هەروەك لەسروشتی کاری ئەوانەی کە ناوی خوریان هەلگرتووە لەشاری (ماری) دا دەردەکەوێت، کە ئەمانە لە چینە دونیاییەکان بوونە و لەوانەن کە ناونووس کراون بۆ خزمەت کردن لە باکووری ولاتی دوو رووبار.

لە شاری (شوشەڕا) کە دەکەوێتە سەرووی رووباری زابی خواروو هەندێك تێکستی نووسراومان بەدەست گەیشتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی فەرمانڕەوایی کردنی حاکمێکی خۆمالی(محلی) کە ناوی(کوواری) بووە. بەپێی ئەم تێکستە دۆزراوانەی شوشەڕا دەتوانین بلێین کە دانیشتوانی ئەم شارە بە خووری قسەیان کردووە، ئەمەش لەبەر بەکارهێنانی وشە و ناوە خوریەکان بە رێژەیەکی زۆر لە ناو ئەم تێکستانەدا. شاری شوشەڕا هەمان ناوچەی - شەشروم-ە کە لە تێکستەکانی بنەمالەی نووری سێهەم زۆر باسی لێوەکراوە. لە باشووری شاری شوشەڕا شاری نوزی هەبوو، کە لەشوێنی شاری گاسووری کۆن دروست ببوو. دانیشتوانی شاری نوزی لە ماوەی سەدەکانی ١٥-١٤پ.ز بە زمانی خووری قسەیان کردووە. ئەو بارودۆخەی کە وایکرد ناوێکی نوێ لەم شارە بنێت(واتە بەکارهێنانی ناوی نوزی لە جیاتی ناوی گاسوور) لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەی پێش زاین بە شێوەیەکی تەئکید نازانرێت. بەلام ڕەنگە دووبارە دروستکردنەوەی پەرستگای شارەکە کە تەرخان کرابوو بۆ خواوەند شاووشکا(عەشتار) و گۆڕینی بۆ پەرستگایەکی دوانەیی (معبد مزدوج) و دووبارە دروستکردنەوەی شارەکە ببێتە هۆی گۆڕانی ناوەکەی.

لەم پەرستگایەدا خواوەند شاووشکا دەپەرسترا (لەلایەن خوریەکان خواوەند شاوشکا هاوشێوەی خوداوەند عەشتار بوو). ئەمە سەرەڕای تیادا پەرستنی خوداوەند تیششوب (خواوەندی کەش) کە بەگەورەی خوداوەندەکانی خوریەکان دادەنرا.

دوای سەرهەلدانی شەپۆلێکی نوێی کۆچکەرە خوریەکان بۆ ناوچەکە پەرستنی خوداوەند تیششوب زۆر فراوان بوو. (خوداوەند تیششوب دواتر بووە سەرۆکی هەموو خواوەندە خوریەکان

یان لە لوتکەی کۆمەڵگەی ئایینی خوریەکان دەهات، بە جۆرێك کە نـاوی ئـەم خواوەنـدە زۆر باوبوو لە پێکهێنانی بەشێك لە ناوی کەسەکان لـە تێکـستەکـانی هـەردوو سـەدەی (١٥-١٤پ.ز). بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ناوی ئەم خوداوەندە تەنها بەشێوەیەکی سنووردار و مام ناوەند بڵاوەی کرد لە پێکهێنانی ناوی کەسە خوریەکان تاکو سـەردەمی مەملەکـەتی مـاری. تەنانەت (بۆ نموونە) نەگەیشتە رادەی بڵاوبوونەوەی ناوی (ئەتەل) لە پێکهێنانی نـاوی کەسـە خوریەکان.

ناوچە خوریەکانی دەوروبەری وڵاتی دوو رووبار ژمارەی یەکجار زۆری دانیـشتوانی بـەخۆوە بینی. ناوچەکانی باکووری وڵاتی دوو رووبار و ناوچەکانی رۆژهەڵاتی سـەرووی رووبـاری دیجلـە گرنگترینی ئەو ناوچانە بوونـە کـە کۆیلـەی لێـوە دەهێنـرا. لەسـەردەمی مـەلیك سەمـسۆ ـ دیتانـا(١٥٦١-١٥٣١پ.ز) لـە سـەردەمی بـابلی کـۆن بەڵگەنامەیـەك هەیـە کـە بـاس لـە گەشتێکی بازرگانی بازرگانێك دەکات، کە بازرگانەکە لەم گەشتەیدا کۆیلەکی کڕیوە لە وڵاتـی سوبارتۆ. لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە بەهەمان شێوە مێژووەکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی بابلی کۆن هەواڵی کڕینی کۆیلەکی ئافرەت لە ناوچەیەك کە دەکەوێتـە بـاکووری وڵاتـی نێـوان دوو رووبار دەگێڕێتەوە.(بەزمانی ئەکەدی بەم ناوچەیە دەڵێن: (مات ــ بریتی)[٣٥]. لەناوچـەی رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە هەردوو شـاری (ئەشـوخ، ئولۆبـدی)[٣٦] کـە هـەردووکیان دەکەونـە باشووری سنووری ناوچەی خوریەکان، بە بازارێکی گرنگی کڕین و فرۆشتنی کۆیلـە خوریـەکان دادەنران. بۆیە بوونی ناوی کەسانێکی خووری لە ناو جەرگەی شـاری بابـل بـە شـتێکی نـامۆ نازانرێت لەو سەردەمەدا. هەروەك چۆن ئەم دیاردەیە لە سەردەمی بنەماڵەی ئـووری سـێیەمدا هەبوو. هەروەك تێبینی دەکەین کە زۆربەی ئەو ناوە خوریانە لەو تێکستە نووسـراوانەدا دێـت کە لە شاری (دیلبەت) دۆزراونەتەوە[٣٧].

نامەکانی ماری هەواڵی راستەوخۆمان پێشکەشدەکەن سـەبارەت بـەبوونی پاڵـە پەسـتۆی دانیشتوان لە بەشەکانی رۆژهەڵات. هەروەها لەنامەکەدا هاتووە کە دانیشتوانی زاگرۆس کە بە (تورورککو – Turukku) ناویان دەبات بەهۆی برسێتییەوە هێرشیان کردووە بـۆ سـەر ناوچـە

---

(٣٤) mat biriti واتە وڵاتی ناوەراست، ناوەخۆیی.

(٣٦) ئەم دووشارە دەکەونە باشووری شاری ئارراپخا(کەرکوك) لەنزیك رووباری عوزێم

(٣٧) دیلبەت ئێستا گردی دولەیمی ناوە کە دەکەوێتە نزیك شاری کوفەی ئێستا.

نیشتەجێ بووەکانی ترو خۆراکیان تێدا بەتالان بردووە. تێبینی دەکەین کە ناوی ئەوانەی کە بە (توروککو - Turukku) ناوبراون لە نامەکەدا، بەتایبەتی ناوی سەرکردەکانیان لە بنەرەتدا ناوی خورینە.

شەمشی ئەدەد (کوڕی یەك لەو بنەماڵانەیە کەلە شاری تیرقا حوکمیان دەکردو - تل العشارە-، پاشان مەلیکەکانی ماری لەسەر دەسەڵاتیان لادا لەم شارەدا) لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەدا بە یارمەتی مەملەکەتی بابل توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر شاری ئیکاللاتومی[٣٨] ئاشووریدا بسەپێنێت. ئەم مەلیکە توانی کۆتایی بە دەسەڵاتی بنەماڵەی ئاشووری کۆن بهێنێت و تەختی ئاشوور(کۆشکی شەرگاتی ئێستا) وەربگرێت. دوای ئەمە شەمشی ئەدەد توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو ناوچەکانی نێوان ڕۆژئاواو باشووری ڕووباری فورات و ڕۆژهەڵاتی چیای زاگرۆس بسەپێنێت. دەتوانین ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی ئەم مەلیکە(شەمشی ئەدەد) بۆ سێ بەشی سەرەکی دابەشبکەین کە ئەمانەن:

١- ناوچەکانی سەرووی ڕووباری خابوور و لقەکانی(کە بە جەزیرەی سەروو ناودەبرێت)(کوردستانی سوریا). کە پایتەختەکەی ناوی شوبەت ئینلیل (تل لیلانی ئێستا)بوو. مەلیك شەمشی ئەدەد زۆر حەزی لەم پایتەختە دەکرد، هەر لەم ناوچەیەش ژیانی بەسەردەبرد.
٢- وولاتی ئاشوور. بەڕێوەبردنی ئەو شارەی تەسلیمی کورەکەی (ئیشمی ــ داگان) کردبوو، ئەم کورەی میراتگری(جێنشینی شەمشی ئەدەد بوو) تەختی دەسەڵاتی بوو.
٣- ناوچەی فوراتی ناوەڕاست کە هەموو ناوچەکانی دەوروبەری شاری ماری دەگرێتەوە. ئەم ناوچانەش لەلایەنی کوڕە بچووکەکەی شەمشی ــ ئەدەد کە ناوی (یەسمەخ- ئەدەد) بوو بەڕێوە دەبرا.

ئەم مەلیکە توانی هێرشە ترسناکەکانی ڕەوەندەکان(کۆچەرییەکان) بۆ سەر ناوچە کشتوکالییەکان رابگرێت. ئەمەش بەهۆی پەیڕەوکردنی سیستەمێکی بەڕێوەبردنی چاك و وورد، کە بە پلەی یەکەم پشتی بە دابەشکردنی ناوچەکان بۆ ولایەت و دانانی پارێزەری سەربازی لەناوچەکاندا(حامیات عسکریة) بەستبوو. هەروەها شەمشی- ئەدەد توانی دەسەڵاتی خۆی لە ناوچە نیشتەجێ بووەکانی ناو دۆڵ و نشێوەکانی ڕووبارەکان بپارێزێت.

---

(٣٨) ئەمەش گردی هەیکەل (تل هیکل) ی ئێستایە لە نزیك کۆشکی شەرگات (شاری ئاشوور).

چونکە توانی دانیشتووی ناوچەکە لە خووری و ئامووریيەکان بهێنێتە پاڵ خۆی و بەکاریان بهێنێت دژی دەسەڵاتە ناوخۆييەکانی ئەم ناوچانە.

ئەم مەملەکەتەی شەمشی - ئەدەد زۆر بەخێرایی رووخاو لەناوچوو.چونکە ئەم مەملەکەتە لەسەر لێهاتووی و دیبلۆماسی و هەیبەتی سەربازی(عسکری) شەمشی ـ ئەدەد خۆی وستابوو. هەر بۆیەش بەمردنی مەلیك شەمشی- ئەدەد ڕاستەوخۆ مەملەکەتەکەش رووخاو لەناوچوو. لەوکاتەی کە ئیشمی- داگان کە کوری شەمشی ئەدەد و میراتگری تەختی دەسەڵاتی بوو توانی پارێزگاری بکات لە دەسەڵاتی خۆی لە سەر وولاتی ئاشوور. ئەوا شاری (ماری) جارێکی تر کەوتەوە دەستی(زیمری – لیم)، ئەمەش میراتگری ئەو بنەماڵەیە کە لە کۆندا پێش شەمشی ئەدەد لە شاری (ماری) دا حوکمیان دەکرد. هەرچی ناوچەکانی باکووری ولاتی دوو رووبار بۆ چەند یەکەیەکی سیاسی بچووك دابەشبوون.

لە ئەنجامی ئەم بارودۆخەدا چەندین بنەماڵەی دەسەڵاتدار لە باکووری ولاتی دوو رووبار سەریان هەڵدا. ناوی سەرکردەکانی ئەم بنەماڵانە بە شێوەیەکی ڕوون وئاشکرا خووری بوون، وەك : مەلیك (ئەتەل – شیننی) حاکمی شاری بوورونـدوم، مەلیك(شوکروم – تیششوب) حاکمی شاری (ئیلەخوت)[٣٩]. سەرەڕای ئەمانەش ژمارەیەکی زۆرحاکمی تر هەنە کە ناوەکانیان خووری بووە و لە ناوچەکانی سەرووی ڕووباری دیجلە لە باکووری ولاتی ئاشوور حوکمیان کردووە، لەوانەش وەك : مەلیك (ئەنیب شەویر)ی حاکمی (خابووراتوم)، مەلیك (شەددو- شەرری) حاکمی شاری (ئازوخینوم)، مەلیك (تیش ئولی) حاکمی شاری (مەردەمان)[٤٠].

ئەگەر بچینە باکووری سوریا (کوردستانی سوریا) دەبینین خەلەب(حەلەب) یەکێك بووە لەو مەملەکەتانەی کە توانی بەرگری لە خۆی بکات دژی فراوانییەکەی مەملەکەتەکەی شەمشی ئەدەد، هەربۆیەش لە دوای ڕووخانی مەملەکەتی شەمشی ئەدەد ئەوا مەملەکەتی خەلەب بووە یەکێك لە بەهێزترین هێزە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن لە ناوچەکەدا.

بەشێوەیەکی سروشتی هاوپەیمانییەك لە نێوان هەردوو مەملەکەتی حەلەب و ماری

---

(٣٩) ئەم دوو شارە بەپێی بەڵگەنامە نووسراوە مێخیەکان دەکەونە سەرووی ناوچەکانی سێگۆشەی خابوور، لە لای باکووری ڕۆژئاوایەوە.

(٤٠) ئەم شارانە دەکەونە ناوچەکانی نزیك رووباری دیجلە و لقەکەی(خابوور) لە باشوورو باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری زاخۆ، هەروەك ناوی شاری یەکەم (خابووراتوم) لە ناوی رووباری خابوورەوە وەرگیراوە.

دروستبوو. ئەمەش چونکە زیمری لیم میراتگری تەختی دەسەڵاتی مەملەکەتی ماری لە مەملەکەتی حەلەب دەژیا دوای ئەوەی لەلایەن شمشی ئەدەد لە شاری ماری دەرکرابوو. بەڵام لە دوای نەمانی شەمشی ئەدەد و گەڕانەوەی زیمری لیم بۆ سەر تەختی دەسەڵات لە شاری ماری ئەم پەیوەندیەی نێوانانیان پتەوتر بوو. ئەمەش بەتایبەتی دوای ژن خواستنی زمری لیم لە بنەماڵەی دەسەڵاتداری مەملەکەتی حەلەب. هەروەها زمرلیلیم لەلایەن مەملەکەتی حەلەب یارمەتی درا بۆ گەڕانەوەی بۆ سەرتەختی دەسەڵات لە شاری ماری. ئەمانەش هەمووی بوونە هۆی درووستبوونی ئەم هاوپەیمانییەتەی نێوانیان.

ئەگەر سەرچاوە مێژووییەکانی دواتر (پاش سەدەو نیوێك)، مەملەکەتی حەلەب بە گەورەترین مەملەکەتی ناوچەکە وەسفبکەن، ئەوە بێگومان بەهۆی ئەو دەسەڵاتە زۆرە بووە کە مەملەکەتی حەلەب لە باکووری سوریا(کوردستانی سوریا) هەیبووە. بێجگە لە مەملەکەتی حەلەب چەند دەوڵەت و مەملەکەتی تر هەبوون لە ڕۆژئاوای ڕووباری فورات. ئەم دەوڵەتانە هەوڵیان دەدا جۆرە هاوپەیمانییەتێك لەگەڵ مەملەکەتی ماری ببەستن ئەمەش بۆ پارستنی خۆیان لە مەترسی هێرش کردنی مەملەکەتی حەلەب، کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ترسی بۆ سەریان زیادی دەکرد. لە گرینگترینی ئەم مەملەکەتانەش بریتی بوون لە مەملەکەتەکانی (کەرکەمیش، ئوورشوم، خەششوم).

بەم دواییانە توانرا شوێنی شاری کەرکەمیش دیاری بکرێت، کە دەکەوێتە سەر ڕووباری فورات لە شوێنی هاتنە ژوورەوەی ئەم ڕووبارە لە زەویەکانی تورکیاوە بۆ سوریا (تەرابلسی ئێستا)یە (خاکی کوردستانە)، هەرچی شاری (خەششوم) توێژەرەکان دەڵێن یان دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری حەلەب، یان ڕۆژئاوای ڕووباری فورات یان ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات. بەڵام ئێمە وای دەبینین کە ئەم شارە بکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای حەلەب، ئەمەش بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لە ڕاپۆرتەکانی تایبەت بە هەڵمەتە سەربازییەکانی مەلیکی حیسی خاتتوشیللی بۆ سەرکوردستانی سوریادا هاتووە. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسی ئەم هەڵمەتە سەربازیانەی مەلیك خاتتوشیللی دەکەین. هەرچی شاری (ئوورشوم)ە ئەوا لە نامەکانی (ماری) دا ئاماژە بە ناوی مەلیکەکەی کراوە کە ناوی(شینەم)ە. هەروەك لە نامەکانی شاری ماریدا ئاماژە بەناوی (ئانیش — خوربی) دەکات و دەڵێت مەلیکی شاری (خەششوم) بووە. وەك دیارە ناوی ئەم مەلیکانە لە بنەڕەتدا هەمووی ناوی خوریـنە، بەڵام بەڵگەیەکی تەئکیدکراوی لە سەردانییە.

بەشێوەیەکی تەواو لە سەردەمی مەملەکەتی (ماری) دا قەبارەی دانیشتوان و شارستانییەتی (بەتایبەتی لایەنی ئایینی) خوریەکان لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ڕووباری فورات

نازانین. بەڵام لە دەوروبەری ١٥٦٠پ.ز لە هەردوو شاری حەلەب و ئالالاخ تێبینی بوونی ڕێژەیەکی زۆری خوریەکان دەکرێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ناوی مەلیکەکانی ئەم دوو شارە لە بنەڕەتدا ناوی ئامووری بوون. ئەمەش تەنها لە ناسنامە زمانەوانی ناوی کەسەکان ڕەنگی نەداوەتەوە، بەڵکو لە ناسنامەی کۆمەڵگەی ئایینی و ئەو زاراوانەی کە لە ڕێوڕەسمە ئایینییەکانیش بەکاردێت ڕەنگی داوەتەوە. (لاندس بێرگەر Landsberger)لە ساڵی ١٩٥٤ زایینی باسی بوونی چوار مەملەکەتی خووری کردووە لە ڕۆژئاوای ڕووباری فورات. ئەوانیش: (حەلەب، ئوورشوم، خەششوم، کەرکەمیش). بەشێوەیەکی ڕاست و تەواو باسی بارودۆخەکەی کردووە، لەگەڵ پارێزی کردنی لە دانانی کەرکەمیش لەنێوانیاندا.

لەبەر ئەوەی پێشکەوتنەکان لە ماوەی (١٩٦٥-١٦٥٠پ.ز) لەسەدەی حەڤدەمی پ.ز بە شێوەیەکی بەردەوام بەبێ پچران بەڕێوە چوو، هەربۆیەش بارودۆخی شارەکانی حەلەب و ئالالاخ و خەششوم لە سەدەی (١٦پ.ز) وەك ئەو بارودۆخە دەخەملێنرێت کە لە سەدەی (١٧پ.ز) لەم شارانەدا هەبووە، بەڵام ئەم بیروڕایە تاکو ئێستا نەسەلمێنراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم ڕووەوە جیاوازییەکی زۆریان نییە لەگەڵ ئەوەی کە (کەممەنهۆبەر) لە ساڵی ١٩٧٧ ئاماژەی پێکردووە.(هەرچەندە ئەوی کەممەنهۆبەر پشت بە سەرچاوەی ڕوون نابەستێت). کەممەنهۆبەر وادادەنێت کە لە سەردەمی مەملەکەتی ماری خوریەکان هیچ هاتووچۆ و گواستنەوەیەکیان نەبووە لەو ناوچانەی کە دەکەوێتە نێوان ڕووباری فورات و دەریای سپی ناوەڕاست. هەرچۆنێك بێت(بەچاو پۆشین لە تێکستە نووسراوەکانی ئیبیلا) هیچ سەرچاوەیەکی نووسراوی ترمان لەبەردەستدانییە کە ئیشارەت بکات بە کاتێکی دیاری کراو بۆسەرەتای کۆچی خوریەکان بۆ باکووری سوریا(کوردستان).

گەشەسەندنی ڕووداوەکان دوای نەمانی مەملەکەتی شەمشی ئەدەد، تا ڕادەیەك هاوشێوەی ئەو ڕووداوانە بوو کە لە دوای ڕووخانی مەملەکەتی ئەکەد و بنەماڵەی ئووری سێیەم ڕوویدا. بەجۆرێك کە دەتوانین بەشێوەیەکی تەواو تەئکید لەسەر سەرهەڵدانی چەند نشینگەیەکی زۆر قەڵەباڵغ بکەینەوە. هەروەها دانیشتوانی ئەم نشینگەیە بەزمانی خووری گفتۆگۆیان کردووە.

لەڕووی لایەنی ئابووری و سیاسییەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم ڕووداوانە لە بنەڕەتدا هاوشێوەی سێ حاڵەتەکەی تر بوو کە باسمانکردن. ڕووخانی کیانێکی سیاسی وا سنوور فراوان بووە هۆی لە دەستدانی کۆنترۆلی ئیداری و سەربازی. بەم جۆرە ئەمەش بەشێوەیەکی خراپ

بەسەر لایەنی ئابووری شکایەوە. لەلایەکی تر بازرگانی دەرەکی لە کورتیدا. هەروەها دیاردە شارستانەتیەکانیش کەمبووەوە، ئەمە سەرەڕای تێکچوونی سیستەمی ئاودێری. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە زەویە کشتوکاڵییەکان سنووردارببن. بەڵام بەخێوکردنی ئاژەڵ(مەڕومالاّت) بەشێوەیەکی بەرچاو تەشەنەی سەند، ئەمەش بووە هۆی کەم بوونەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی. بەم جۆرە لە ئەنجامی نەمانی کیانی سیاسی بارودۆخی وولاّت زۆر شێواوی بەخۆیەوە بینی، بەجۆرێك کە وای لێهات دانیشتوان تەنها پشت بە کۆمەڵە کارێکی بچووك ببەستن.

ئەم گۆڕانکاریانە بەهەمان شێوە کاریگەری خۆی کردە سەر دانیشتوانی دەوروبەری ناوچە چیاییەکان. بە جۆرێك کە بووە هۆی شێواندن و تێکچوونی ژیانی ئابووریان. ئەمەش بەهۆی کاریگەری گۆرانی پیشەی شارەکان وکەم بوونەوەیان لەلایەك و شێوە جۆربەجۆرەکانی کۆچەرە چیاییەکان بۆ ئاڵوگۆڕدنە بازرگانییەکان. بەتایبەتی بازرگانییە ناوخۆییەکان لەگەڵ ناوچە شارستانییە پێشکەوتووەکان (المناطق الحضارية). ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەشێك لە دانیشتوان ناچاربن شێوازی ژیانیان بگۆڕن و بەدوای لایەنێکی تر بگەڕێن بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان لە دەشتە کشتوکاڵییەکان.

کۆچەرە نوێیەکان لە کۆتایی جێگیر بوون، جا ئەم جێگیربوونەش چ بەشێوەیەکی ئاشتی بێت یان شەڕکردن بێت. بەڵام ئەم سیستەمە سیاسیانەی کە جارێکی تر سەر لەنوێ لە شارەکان سەریان هەڵدا ئەوا مۆرکێکی داگیرکاری و شەڕخوازی هەڵگرتبوو. ئەو شار و نیشینگانەی کە پارێزگاری لە مانەوەی خۆی کردبوو بەشێوەیەکی سەربەخۆ، ئەوا لەم سەردەمەدا لە ژێردەسەلاّتی چینەکی سەربازی بوون، کە ئەم چینە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەهێزتر دەبوون، بەجۆرێك کە دواتر بوونە گەورەترین مولکداری ناوچەکە.

ئەو بەڵگەنامانەی کە لە شاری نوزی دۆزرایەوە (نوزی دەکەوێتە ولاّتی ئاڕاپخا کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاّتی ڕووباری دیجلە ــ ناوچەکانی کەرکوکی ئێستا ــ) بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئەو گۆڕانکاری و کێشانە دادەنرێت. بەڵام تاکو ئێستا دراسەت نەکراون لە ژێر ڕۆشنایی چۆنییەتی سەرهەڵدانی ئەو کۆمەڵگایەی کە باسی دەکات.

لەنێوان ئەو کۆچەرانەی کە لە ناوچە چیاییەکانی ڕۆژهەلاّتی ئەنادۆڵەوە هاتوون، کۆمەڵێك هەبوون کە بەزاری هیندۆجەرمانی قسەیان دەکرد. لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین ئەمانە بە شێوازێکی زۆر کۆنی زمانی هیندۆئارییایی قسەیان کردووە. ئەم ڕاستیەش گرنگیەکی گەورەی پێدرا لە مێژووی لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە ڕۆژهەلاّتی کۆندا. هەروەك لە نیوەی یەکەمی

سەدەی بیستەم چەندین تەفسیراتی بۆ دانرا. بەڵام ئەم تەفسیراتانە زۆر گاریگەربوون بە بیرۆکە رەگەز پەرستییەکەی نازییەکان تایبەت بە ئارییەکان کە کاتی خۆی زۆر بلاوبوەوە.

لە ئەنجامی گەرانێکی قووڵ لەو ماددە زمانەوانییە کەمەی کە لەبەر دەست دابوو توێژەرەکان (باحثەکان) لە زۆر خاڵدا کۆك بوون. هەرچەندە مناقەشاتەکان هەندێك جار شێوازێکی زۆر توندی بەخۆوە بینی. بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە هەڵسەنگاندنی مێژووی گشتی ئەوە دیاریترین مەسەلە تیایدا کە ناکۆکی لەسەر ببێت ئەمانەن : (ئایا ئەوانەی کە بە زمانی هیندۆئاری قسەدەکەن لەگەڵ خورییەکان بە یەکەوە لە قەفقاسەوە کۆچیان کردووە و بەرەو وڵاتی (هیلال الخصیب)؟ یان ئەو دیاردە زمانەوانییە هیندۆئارییەی کە لە زمانی خوریدا بەدی دەکرێت سەرەتاکەی دەگەرێتەوە بۆ بەریەککەوتنی ئەم دوو نەتەوەیە لە کاتی کۆچکردنی هیندۆ ئەوروپیەکان بۆ ئێران پاشان بۆ هیند).

زۆربەی توێژەرەکان دەڵێن رەنگە ئەم بەریککەوتنەی(احتکاك) نێوانیان لە ناوچەی قەفقاس روویدابێت. سەرەرای ئەوەی کە دەتوانین لە رووی زمانەوانییەوە بزانین کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین دانیشتوانی قەفقاس بە زمانی سەرەتایی ئۆرارتی (زمانی کۆنی ئۆرارتی) قسەیان کردووە. ئەم زمانەش (لەگەڵ زمانی خووری یەك سەرچاوەیان (نەسلیان) هەیە. بەڵام دواتر لە سەدەی بیستی پێش زایین لێك جیابوونەتەوە. رەنگە ئەم بۆچوونە ببێتە راستییەکی باوەرپێکراو ئەگەر هەندێك وشەی خووری یان ئۆرارتی سەرەتایی گەیشتبێتە هیند وەك جۆرێك لە جۆرەکانی خواستنی زمانەوانی. بەڵام ئەمە تاکو ئێستا ئەئکید نەکراوە. بەم جۆرە وا پێدەچێت کە خواستن (استعارە) تەنها بەیەك ئاراستە بووە، ئەویش لە زمانی هیندۆئاری بۆ زمانی خووری بووە.

لەبەر ئەوەی پاشماوەکانی زمانی هیندۆئاری (ئەم پاشماوانەی زمانی هیندۆئاری تەنها ناوی خواوەندەکان وکەسەکان دەگریتەوە، ئەمە سەرەرای لە خۆگرتنی کۆمەڵە زاراوەیەکی تایبەت بە هەندێك کارو پیشەی تایبەت بە بەخێوکردنی ئەسپ) بە پلەی یەکەم پەیوەندی هەیە بە بنەماڵەی میتانییەکان. بۆیە لێرەوەدا ئەوەمان دەستدەکەوێت کە ئەم زمانەی میتانییەکان لە ناوچەکانی قەوقازەوە دروستبووە بە کاریگەری هیندۆئارییە کۆچەرەکان و هەندێك داب ونەریتی تایبەت بە خۆیان لە لایەنی ناوەکانی پەیوەست بەم چینە (دەتوانین ئەویش روونبکەینەوە بە بەدوا داچوونی بنەماڵەکان یەك لە دوای یەکتری) پاشان گواسترایەوە بۆ باشووری رۆژئاوا کە زیاتر لە ٥٠٠کم بری تا گەیشتە مەملەکەتی میتانی لە باکووری نێوان

دوو رووبار.

بەڵام ئایا ئەوە مانای ئەوە نییە کە چیرۆکێکی ئەفسانەی هیندۆئارییەکان بگۆرینەوە بەیەکێکی تری خووری؟ ئێمە مەسەلەکە بەشێوەیەکی زۆر ماقوولتر دەبینین ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە هیندۆئارییەکان لە لێژاوە سەرەکیەکەی ئەو هۆزە کۆچەرانەی کە بە ئێراندا کۆچیان دەکرد بەرەو هیند جیابوونەتەوە. پاشان ئەوانە لەگەڵ خوورییەکان هاتنە ناوچەی (هیلال الخصیب).دواتر ئەم کۆمەڵەی هیندۆئاریەکان لە ناو خوریەکان توانەوە لە ژینگەی وڵاتی دوو رووبار و کوردستانی سوریادا. بەم جۆرە ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە زمانەکەیان لە کاتێکی زووەوە لە ناوبچێت.

ژمارەیەکی کەمی ناوی کەسەکان و وشە خواستراوەکانمان بەدەست گەیشتووە، کەتیایدا ئەم ووشانە ئیشارەت بەو دەورەی هیندۆئارییەکان دەکات کە لە قۆناغی پێش مێژوو لە مەملەکەتی میتانی بینویانە. هەروەها ئەم ناو و ووشە خواستراوانە یارمەتیمان دەدات بۆ زانینی گرنگی مێژوویی ئەم کۆمەڵانە.

هەموو مەلیکەکانی مەملەکەتی گەورەی خوریەکان کە لە سەدەی ١٦پ.ز سەریان هەڵدا(سەرەتا ئەم مەملەکەتە بە(مایتانی) یان (مەیتانی) ناسرابوو، پاشان دەربرینەکەی گۆڕاو بوو بە(میتانی). ناوەکانیان خووری نەبووە. گومانی تێدا نییە کەناوی هەندێکیان لە بنەرەتدا یان لە رووی پێکهاتەی زمانەوانی هیندۆئارییە. بۆ نموونە وەك ئەو ناوانەی خوارەوە:

- ئەرتەتاما (أرتتاما): لە زمانی(فیدا) [41] (رتا زامن)ە واتە: خەڵکی ناوچەی(رتا) یە.
- توشراتا: لە زمانی فیدا(تفصا رثا): واتە گالیسکە جەنگییەکەی بە خێرایی دەڕوات.
- شەتتی وازا: لە زمانی هیندۆئاری کۆندا(ساتی فایا)یە واتە: زاڵبوون (الظفر) بەسەر کەل و پەلی جەنگیدا)

هەرچی بەنیسبەت ئەو کۆمەڵە ناوەی کە بەمیتانی لە قەڵەم دەدرێت، ئەوا ئەسڵێکی زمانەوانی قەناعەت پێکراوی دەربارەی نییە. بەڵام بە ئاشکرا زۆر جیاوازن لەگەڵ ئەو ناوە

(٤١) الفیدا: (واتە: زانیاری) کۆمەڵێك لە گۆرانی و سروودی ئایینی و قسەی نەستەقی هیندی کۆن دەگرێتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٥٠٠-١٠٠٠ پ.ز.

خوریانەی کە بەڵگەیەکی زۆر دەربارەیا هەیە. هەر ئەمەشە کە بووە هۆی ئـەوەی ئەمانـە لـە کۆمەڵە زمانەکانی هیندوئارییەکان ریزبەند بکەین.

دوو دڵـی و لێکۆڵینـەوەی وردی مەنهـەجی بـە پاسـاو دادەنـێین، (کـە بـە مەبدەئـەکی پارمەتیدەر وەسفی دەکەن لە لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە زانستی زمانەوانیدا)، بەڵام بەتەئکید ئەمانـە گرنگییـەکی ئـەو تۆیـان نییـە بەرامبـەر بـە هەڵـسەنگاندنی مێـژووی ئـەم دیـاردە زمانەوانییە. ئەم جۆرە ناوانە کە تا ئێـستا ماناکانیـان جێگـای ناکۆکییـە، وەك نـاوی چـەند حاکمێك بەدەردەکەوێت کە لە سەدەی ١٤ پ.ز لە ناوچـەکانی نێـوان باشـووری سـوریا تـاکو فەلەستین حوکمیان کردووە. بەڵام ئەمە تەنها لە تێکەڵاوییەکی سیاسی وشارستانییەتی نێـوان دەوڵەتە دروست بووەکانی ئەم ناوچەیە و مەملەکەتی میتانی هیچی تر نییە.

زمانی خووری لە سەدەی ١٤پ.ز بە ناو ناوچەکانی ناوەڕاستی سوریا تاکو گەیـشتە قـەتنا و قادیش[٤٢] بڵاوبووەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بـۆ بڵاوبوونەوەیـەکی فراوانـی خوریـەکان لـە کـاتی سـەرهەڵدانی مەملەکەتی میتانی. هەروەها بەدووری نازانین کە هینـدۆ ئاریـیـەکانیش گەیـشتبنە ئەم ناوچانە. بەڵام هەندێك لە توێژەرەکان ئەمە رەت دەکەنەوە بـە پاسـاوی ئـەوەی کـە بـە هـیچ شێوەیەك بە زمانی هیندۆئاری لە رۆژهەڵاتی کۆندا قسەنەکراوە. ئەو بەڵگەنامانەی کە دەربـارەی هیندۆ ئارییەکان پێمان گەیشتوون لە چەند وشەیەك زیاتر نییە کـە ماناکەشیان نازانرێـت. ئـەم ووشانەش لە نێوان زمان و ناوی کەسە خوریەکان ماونەتەوە کە بە شـێوازی جیـاواز و جۆراوجـۆر نوسرابوون. هەر بۆیە لێرە دا پێویستە ئەوە بهێنینەوە یادمان کە توانای زمانـەوانی نووسـەرەکان لە ژینگەیەکی فرە زمان گومانی تێدانییە جۆرا و جۆر دەبێت و هەریەکەیان بە لایەنی زمانەوانی خۆی کاریگەردەبێت. هەروەك گواستنەوەی ناوە نامۆیەکان یـان نوسـینیان لەلایـەن نووسـەرەکان نەدەتوانرا بەشێوە بنەڕەتییەکەی خۆی بنوسێت، چونکە زمانەکەیان جیاوازبوو، ئەمـەش وایکـرد کە بەشێوازێکی تر دەربچێت وبنووسرێت. لە کۆتاییـدا چـەندین مەسـەلە لـەم لایەنـەوە سـەری هەڵداو دروستبوو، کە ناتوانین لەم کاتـەدا وەڵامیـان بدەینـەوە. هەربۆیـەش ئـەم بڕیارانـەی کـە پەیوەندی بەم لایەنەوە هەیە لە هەردوولایەنی سلبی و ئیجـابی دا پـشت بـە بەڵگەیـەکی تـەواو نابەستێت، هەربۆیەش موناقەشەی تێدا کۆتایی نایەت.

---

(٤٢) قەتنا ئێستا پێی دەڵێن گردی مەشرەفە کە دەکەوێتە باکووری شاری (حمص)، هەروەها قادش ئێستا بە گردی پێغەمبەر (مەند) ناسراوە کە دەکەوێتە باشووری شاری (حمص).

گرنگترین ئەو خواوەندانەی کە لە لایەن مەلیکە میتانییەکان لە کۆتایی سەدەی ١٤پ.ز پەرستراون بریتین لە (میترا، ڤاروونا، ئەندرا، ناستیا)[٤٣] یە. ئەم خوداوەندانەش لە کۆنترین چیرۆکە شعریە هیندییەکان ناسراو بە فیدا (الفیدا) دەردەکەون. ئەم خوداوەندانە تاکو ئێستا تەنها لە دوو پەیماننامەی نێو دەوڵەتی باسکراون. هەربۆیە واپێدەچێت کە پەرستنی ئەم خواوەندانە سنووردار بووبێت و لە چوارچێوەی بنەماڵەی دەسەڵاتدار دەرنەچووبێت.

لە نمونەی ناوی حاکمە میتانییەکانەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەو کۆمەڵانەی کە بەهیندۆئاری قسەیان دەکرد(وەك باسکران) دەورێکی گرنگیان هەبووە لەو گۆڕانکاریانەی کە لە باکووری وڵاتی دوو رووبار روویداوە لە ماوەی سەدەکانی ١٧- ١٦پ.ز. ئەم ناوانەش(ناوی مەلیکە میتانییەکان) پەیوەندی تەواویان هەیە بەپاشماوەی زمانەوانی هیندۆئارییەکان.چەندین بەڵگە هەیە کە ئاماژە بەم دەور گێرانەی هیندۆئارییەکان دەکات لەمانە:

١- ئەو تێکستە نووسراوانەی شاری نوزی کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی ١٤پ.ز باس لە هەندێك سیفەتی وڵاخە بەرزە (ئەسپ) دەکات، ئەمانەش لە بنەڕەتدا بە هیندۆئاری دادەنرێت.

٢- تێکستەکی حیسی هەیە کە باس لە چۆنییەتی ڕاهێنانی وڵاخە بەرزە (ئەسپ) دەکات. ئەمەش لە لایەنی کەسێکی میتانی پسپۆڕ لەم بوارەدا نوسراوە. ئەم تێکستە هەندێك زاراوەی هیندۆئاری تێدا بەکارهاتووە. بۆیە بۆمان دەردەکەوێت کە هیندۆئارییەکان شارەزاییەکی چاکیان هەبوو لە بواری بەخێوکردن و ڕاهێنانی ئەسپدا.

ئەم شارەزاییەی تایبەت بە ڕاهێنانی ئاژەڵ پەیوەستە بە بەکارهێنانی گالیسکەی دوو چەرخە (دووتایە) کە لە کردەوە سەربازییەکان زۆر بە کاردەهات. ئەم گالیسکانەش دەورێکی گرنگیان هەبووە لە هەڵمەتە سەربازییەکانی میتانییەکان بۆ سەرناوچەکان. هەروەك تێکستە نووسراوەکان ئاماژە دەکەن کە میتانییەکان تایبەتمەند بوونە لە بواری هونەری ئابلۆقەدان و بەکارهێنانی کەوان هەر لە قۆناغەکانی سەرەتایی مەملەکەتی میتانی.

لەسەرەتادا وادەزانرا کە ئەم گالیسکە دووچەرخانە یان(دووتایانە) هیندۆ ئارییەکان لەگەڵ

---

(٤٣) میثر بریتییە لە خوداوەندی خۆر و رووناکی، (ڤاروونا) خوداوەندی مانگە، (ئندرا) خوداوەندی گەردەلوول و باوبۆرانە (العاصفە)، ناستیا (تاکو ئێستا خوداوەندێکی نەناسراوە؟). ئەم خوداوەندانە لە لایەن حیسییەکانیش پەرستراون.

خۆیان بۆ ڕۆژهەلاتی کۆن هێناویانە. بەلام ئێستا دەرکەوتووە کە ئەم جۆرە گالیسکانە لە ڕۆژهەلاتی کۆندا سەری هەلداوە. ئەم گالیسکە بە ماوەیەکی زۆر کەم بە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی کۆن و میسرو ناوچەکانی دەریاچەی ئیجەدا بلاو بوونەوە.

ئەسپ وگالیسکە جەنگییەکان زۆر بەنرخ بوون هەر بۆیەش لەبەر گرانی نرخەکەی تەنها لەلایەنی چینەکی کەمی دەولەمەندەکان بەکاردەهێنرا. ئەم چینەش لە ناوچەی نارابخا(کرکوك)دەژیان. هەر تاکێکی ئەم چینەش بە(راکب - ئەرکەبتی) ناودەبران، ئەم وشەیەش بە مانای: (سوارچاکی گالیسکە سەربازییەکان دێت)، ئەم چینەش بەشێکی گرنگی لەشکرە جەنگییەکانیان پێکدەهێنا. هەروەها ئەم چینە لە کاتی جەنگدا دەورێکی بالایان هەبوو. بەلام ئەم چینە لە هەریەکە لە مەملەکەتی میتانی و سوریا و فەلەستین بە چینی(مەری ـ یەننی ـ نا) ناسرابوو، ئەمەش وشەیەکە بە وشەی(ماریا) پەیوەست کراوە. ئەم وشەیەش(ماریا) وشەیەکی هیندی کۆنە و بەمانای (کور، گەنج) دێت. هەروەها هەمان وشە لەزمانی ئاڤێستا[٤٤] بە مانای ئەندامی پیاوانی یەکگرتووی (عضو اتحاد رجالي) دێت.

لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە مێژووی مەملەکەتی میتانی ڕوویدا ئەم تیپە جەنگییە (خاوەن گالیسکەکان) لەگەل تێپەربوونی کات بوونە دەستەی خانەوادە (فئة النبلاء). هەروەها تێکستە نووسراوەکانی ئالالاخ باسی ئەمانە دەکات و دەلێت (مەری ـ یەننی ـ نا) هەموو ئەو خانەوادانە دەگرێتەوە کە گالیسکەی جەنگیان هەیە). هەروەك تێکستێکی تر نیشارەت بەم چینە دەکات و دەلێت بۆئەوەی کەسێك بچێتە ڕیزی چینی (مەری ـ یەننی ـ نا) ئەوا پێویستە مەلیك بڕیاری لەسەر بدات.سەرهەلدانی مەملەکەتی میتانی و فراوان بوونی هاوشان(معاصر) بوو بۆ یەکێك لە سەردەمە ئالۆزو تاریکەکانی مێژووی ولاتی (میسر). ئەم سەردەمە لە میسر بە سەردەمی گواستنەوەی دووەم دەناسرێت(الفترة الانتقالية

---

(٤٤) ئاڤێستا کتێبی پیرۆزی زەردەشتەکانە.کەتیایدا وتەو ڕێنماییەکانی پێغەمبەر زەردەشتی تێدا کۆکراوەتەوە. ئەم ئایینە لەسەرەتای سەرهەلدانی لەلایەن پیاوە ئایینیەکانی فارس زۆر دژایەتی کرا.بەلام لەگەل ئەوەشدا بنەماکانی ئەم ئایینە بەردەوام بوو لەگەشەکردن و بلاوبوونەوە. بەلام دواترئەم ئایینە لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زایین کرا بە ئایینی ڕەسمی ئیمبراتۆریەتی ئەخمینییەکان.ئەمەش لەگەل دەستپێکی هاتنە سەر تەختی مەلیکی ئەخمینی مەلیك دارای یەکەم (٥٢١ ـ ٤٨٦ پ.ز). هەروەها کتێبی ئاڤێستا لە سەرچاوە عەرەبییەکان بە ناوی (ئەبستاق) ناسراوە

الثانيية)[٤٥]. لەم سەردەمەدا کەسانێك فەرمان ڕەوای مسیریان کردووە کە مەلیکەکانیان لە سەرچاوە یۆنانییەکان بە هیکسۆس ناو دەبرێت[٤٦]. ئەمانەش لەنێوان ئەو بنەماڵانەی کە حوکمی میسریان کردووە بە بنەماڵەی(١٥)م ناسراون. هیکسۆسەکان شاری (ئەواریس) کردە پایتەختی خۆیان. ئەم شارە دەکەوێتە ناوچەی دەڵتای نیل. ئەم مەلیکانەی هیکسۆس لە لایەن میسریەکان بە داگیرکارو بێگانە لە قەلەم دەدران.

توێژەرەکان هەولیاندا مانای ناوی مەلیکەکانی هیکسۆس شیبکەنەوە بەپشت بەستن بەزمانی خووری بەلام ئەمە هیچ ئەنجامێکی بەدەستەوە نەدا. هەروەك ئەوانەی کاتێك باسی مەملەکەتی جیهانی هیکسۆسەکانیان دەکرد بەوەی کە هەموو بەشەکانی پێشەوەی ئاسیای گرتبوەوە، ئەوا ئەمرۆ ئەمە بەشتێکی ئەفسانە و ناڕاست لەقەلەم دەدرێت.

یەکێك لە مەسەلەکانی تر کە تاکو ئێستا کێشەی لە سەربێت، ئەوەیە کە دەڵێت هۆی هاتنی هیکسۆسەکان بۆ وڵاتی میسر دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی خوریەکان لە ناوچەکە. بەجۆرێك کە ئەم بڵاوبوونەوەیەی خوریەکان پاڵە پەستۆیەکی زۆری دروستکرد لە سەر نەتەوە سامیەکانی دانیشتووی باشووری سوریا و فەلەستین. لە ئەنجامی ئەمەشدا کۆمەڵێك لە سامییەکان ناچار بوون بچنە (میسر). ڕاستە کە ئەم بیرۆکەیە تاکو ئێستا بە بەڵگەی تەواو پاڵپشتی نەکراوە، بەڵام ڕەتکردنەوەشی بەبێ ڕەچاوکردنی زنجیرەی مێژوویی (کرۆنۆلۆجی)بە شتێکی تەواو هەڵە لە قەڵەم دەدرێت.

کۆچی دووەمی خوریەکان بۆ باکووری وڵاتی دوو رووبار لە کۆتایی ماوەی فەرمان ڕەوایکردنی شەمشی ئەدەدی یەکەم دەستی پێکرد. پێش ئەو کاتە ناوچەکانی تورعابدین و جەزیرە (کوردساتنی سوریا)خوریەکانی تێدا نیشتەجێ ببوون. بەڵام لە دوای ڕووخانی مەملەکەتی ماری خوریەکان زۆر بە خێرایی لە دەشتاییەکانی رووباری بلیخ و ناوچەکانی

(٤٥) فەترەی ئنتقالی دووەم نزیکەی ١٧٨٦ــ١٥٧٥ پ.ز دەخایەنێت.ئەم فەترەیەش دەکەوێتە نێوان هەردوو سەردەمی دەولەتی میسری ناوەراست و نوێ

(٤٦) هیکسۆس بەمانای مەلیکی شوانەکان، یان شێخی هۆزە گەڕۆکەکان دێت. بیروڕای جۆراوجۆر و جیاواز هەیە دەربارەی ئەسلیان، لە باکووری رۆژهەڵاتی میسرەوە چوونە ناو وڵاتی میسرەوەو توانیان لە سەردەمی بنەماڵەکانی (١٥،١٦،١٧)، فەرمان رەوایی بکەن، واتە لە کۆتایی سەدەی ١٨ تاکو دەوروبەری ١٥٧٥ پ.ز، واتە نزیکەی سەدە و نیوەك حوکمیان کردووە.

فوراتی ناوەڕاست و ناوچەکانی ناوەڕاستی ڕووباری (عاصی) بڵاو بوونەوە. بە پشت بەستن بە نمونەی کورتی کرۆنۆلۆجیا (التسلسل التأریخی القصیر)ئەوا ئەم ڕووداوانە لە سەدەی ١٧ پ.ز ڕوویداوە. هەربۆیەش پاساوی تەواو هەیە بۆ ئەوەی بڵێین پەیوەندییەکی هۆکاری (علاقە سببیە) هەیە لە نێوان گۆڕانی دیمۆگرافیا لە بەشی پێشەوەی ئاسیا لەگەڵ هێرش کردنی هیکسۆس بۆ سەر میسر لە دەوروبەری ١٦٥٠پ.ز.

تاکو ئێستا سەرەتاکانی مێژووی مەملەکەتی میتانییەکان ڕوون ونائاشکرانییە. بەڵام ئەگەر پشت بەزنجیرەی مێژووی کورت یان کرۆنۆلۆجیای کورت (التسلسل التأریخی القصیر) ببەستین ئەوا ڕێڕەوێکی ڕوون دەردەکەوێت. کە تیایدا شەڕی مەلیکەکانی مەملەکەتی حیسی کۆن دژ بە خورییەکان و بوونی مەملەکەتێکی خووری گەورە لە باکووری سوریا دوای ئەمە بەنزیکەی یەك سەدە دەبەستێتەوە. هەربۆیەش ئەم جەنگانەش بە بەشێك لە سەرەتای مێژووی سەرهەڵدانی مەملەکەتی میتانی دادەنرێت. بەڵام ئەگەر پشت ببەستین بەزنجیرەی مێژوویی درێژ یان کرۆنۆلۆجیای درێژ (التسلسل التأریخی الگویل) ئەوا ئەم بەیەك بەستنەوەیە شتێکی زۆر نەگونجاوە و تیایدا قەبووڵ ناکرێت.

دوای ئەوەی حیسییەکان دەسەڵاتیان جیگیربوو لەسەر ناوچە چیاییەکانی ئەنادۆل و دەشتەکانی کیلیکییە و خۆیان تیایدا قایکرد. ئینجا هەڵمەتە سەربازییەکانیان بۆ سەر شارەکانی باکووری سوریا (کوردستانی سوریا) دەستی پێکرد. بەتایبەتی ئەوانەی کە دەکەوێتە نێوان پێچەکەی ڕووباری فورات و دەریای سپی ناوەڕاست. ئەمەش چونکە ئەم ناوچانە لە ڕووی ئابوورییەوە زۆر دەوڵەمەند بوون، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم ناوچانە لە ڕووی بازرگانی دەرەکییەوە زۆر گرنگ بوون. ئەو مەملەکەتانەی کە پێشتر ناویان لە نامەکانی ماریدا هاتبوو هەر مابوون. لە بەناوبانگترینیان مەملەکەتی حەلەب و مەملەکەتی ئالالاخی هاوپەیمانی بوو کە دەکەوێتە سەر ڕووباری (عاصی). ئەمە سەرەڕای مەملەکەتەکانی تری وەك کەرکەمیش و ئورشوم وخەششوم. لە پاڵ ئەمانەش هێزەکی تری نوێ هەبوو کە لە نامەکانی ماری دا بە ڕوون و ئاشکرایی ئاماژەی پێنەکرابوو، کە ئەویش خوریەکان بوون کە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات نیشتەجێ ببوون. خوریەکان دواتر هێزێکی گەورەیان پێکهێنا کە لە مەملەکەتێکدا خۆی نواند کە دواتر پاش چەندین سەدە بە مەملەکەتی میتانی ناوبانگی دەرکرد و ناسرا.

ئامانجی سەرەکی هەڵمەتەکانی مەلیکی حیسییەکان خاتوشیلی یەکەم دەوروبەری (١٥٦٠

پ.ز) بۆ سەر بـاکووری سـوریا داگیرکردنـی بـوو، کـە دواتـر ئامانجەکـەی هاتـە دی ئـەویش بەداگیرکردن و کاولکردنی مەملەکـەتی ئـالالاخ. باسـکردنی سـەرکردەیەکی سـەربازی شـاری حەلەب بە ناوی (زوکراشی)کە ئەمەش ناوێکی خوریە بەڵگەیە و تەئکیـد لەسـەر پەیوەنـدی و رێککـەوتنی نێـوان سەرچـاوە مێژووییـەکانی هەریـەك لـە شـاری ئـالالاخ و بوغـازکۆی دەکاتەوە.چونکە لە تێکستێکی مێخـی شـاری ئـالالاخ کـە لەچینی حەوتـەمی ئـەم شـارە دۆزرابووەوە، هەروەها لە چیرۆکێکی مێـژوویی حیـسییەکان کـە لـە پایتـەختی حیـسییەکان (بوغازکۆی) دۆزرابووەوە کە باس لە سەردەمی حوکمڕانی کردنـی مـەلیك خاتوشـیلی یەکـەم دەکات. لە هـەردووکیان(واتـە لـە تێکـستەکەی چـینی حەوتـەمی شـاری ئـالالاخ و چیرۆکە مێژووییەکەی بوغازکۆی باسی ئەم سەرکردە خوریە ـــ زوکراشی ـــ کراوە) باس لـەم سـەرکردە سەربازییە (زوکراشی) دەکات. هەروەك ئەمە یارمەتیمان دەدات بۆ بـەراورد کردنێـك لـەنێوان ئەو کاولکارییەی کە خاتوشیلی باسی لێوە دەکات لەلایەك و پاشماوەی ئەو کاولکارییـەی کـە هەلکۆلینە شوێنەوارییەکان تەئکیدیان لە سەرکردۆتەوە لە چینی حەوتەم لە ئالالاخ. لەلایەکی ترەوە واپێدەچێت کە خـاتوو شـیلی سـەرکەوتنەکی گـەورەی بەدەسـت نـەهێنابێت لـە کـاتی ئابلوقەدانەکەی شاری ئورشوم کە لە دوای داگیرکردنەکەی شاری ئالالاخ پێی هەڵستابوو. هـەر ئەمەش وای لێکردووە کە باسێکی تەواوی ئەم ئابلۆقەدانەی شاری ئورشوم وەك ئـەوەی شـاری ئـالالاخ نەگێڕێتـەوە. هـەر بۆیـەش تـەنها بـاس لـە کـاولکردنی دەکـات وبـەس بـەبێ هـیچ ووردەکاریەك. ڕەنگە ئەمەش لەبەر ئەوەبێت کە نەیتوانیبێت شارەکە داگیربکـات. چیرۆکیکی مێژوویی تر هەیە کە هاوشێوەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەم بەڵگەنامەیە. ئـەم چـیرۆکەش لـە رووی بابەتەوە بە هـەواڵی کۆشـك ناسـراوە. ئـەم چـیرۆکەش بـاس لـە هەڵـەکانی گـەورە پیـاوان و دەسـەڵاتدارەکانی حیسییەکان دەکات. لەم چیرۆکەدا زانیاری زۆر ورد هاتووە، کەتیایدا ئامـاژە بە گەورە پیاوان و دەسەڵاتدارە حیسییەکان دەکات و دەڵێت ئەمانە هۆکاری سەرەکی بوونە بـۆ گەڕانەوە دواوە و سەرنەکەوتنی حیسییەکان لە کارەکانیاندا (هەڵەتەکانیان). لە تێکـستەکانی ئەم چیرۆکەدا بە نازناوی (کوڕی خوداوەندی کـەش) ئامـاژە بـە خوریـەکان کـراوە، خوریـەکان هاوپەیمانی شاری ئورشوم بوون و رۆلێکی گرنگیان هەبووە لـە خـۆراگرتنی شـارەکە. هـەروەك بەدوور نازانرێت کە ئەم هەڵمەتە سـەرنەکەوتووەی وەك هێمایـەك بـەکارهێنابێت بـۆ هانـدانی بەشە یاخی بووەکانی مەملەکەتی حیسی بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی خۆیان.

لێرەدا نابێـت ئـەوە لـە بـیر بکـەین کـە مەملەکـەتی حیـسییەکان لەسـەر چ بنەمایـەك

دامەزرابوو. ئەم مەملەکەتە لە یەکگرتنی کۆمەڵێك قەوارەی سیاسی پێکهاتبوو. کە هەریەك لەم قەوارە سیاسییانە دەسەڵات و نفوزی تایبەت بەخۆی هەبووە و لە پێکهاتنیشدا جۆراوجۆر بوونە، بەڵام لە ڕووی پلەی دەسەڵات و هێزەوە جیاواز بوونە. هەروەها بوون و مانەوەی ئەم مەملەکەتە پەیوەست بووە بە چۆنییەتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی تایبەت بە حوکمکردنی ناوچەکە لە لایەن دەسەڵاتی مەرکەزییەوە.

خاتوشیلی لە سالی دواتر ناچار بوو هەڵمەتێکی سەربازی بۆ سەر وڵاتی (تارزاوا) لە باشوری ئەنادۆل ئەنجام بدات. ئەم ناوچەیەش بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لەیاسای حیسییەکاندا هاتووە ــ کە بۆ یەکەم جار لەم سەردەمە دا یاسایان داناوە ــ بە بەشێك لە مەملەکەتی حیسییەکان دادەنرا تاکو مێژووی ئەم هەڵمەتە کە خاتووشیلی خۆی لە ڕاپۆرتەکەیدا باسی دەکات و دەڵێت : دوژمنەکان (خوریەکان) لە خانی کەلباتەوە[٤٧] هاتن بۆ وڵاتەکەم هەموو وڵاتەکەمیان لێسەندم. بەجۆرێك کە هیچ شوێنێك نەمابوو تەنها خاتووشا نەبێت. ئەم ڕاپۆرتەش هێزودەستەڵاتی نوێی خورییەکان دەردەخات کە چۆن لە سنووری خۆی دەرچووە و فراوان بووە، بەجۆرێك کە دەسەڵاتەکەیان ناوچە دوورەکانی تری باکووری سوریاشی گرتەوە (کوردستانی سوریا و ترکیا).

ئەگەر ناوی (خانی کەلبات) (کە لێرە بە شێوازی ئەکەدیەکەی دەردەکەوێت) بەڕاستی لە تێکستە ئەسلیەکەی داهاتبێت، بەجۆرێك کە زیادکراو نەبێت لە لایەن نووسەرێکی تر کە جارێکی تر تێکستەکەی نووسیبێتەوە لە زمانێکی تر، ئەوا ئەمە بە کۆنترین بەڵگەی ناوەکە دێت لە نووسراوە حیسییەکاندا. ئەم ناوەش دەلالەت لە وڵاتەك دەکات کە بۆ یەکەم جار لە سەردەمی بابلی کۆن دا باسی کراوە. دواتر ناوی (خانی کەلبات) شوێنی ناوی (میتانی) گرتەوە.

خاتوشیلی مەلیکی حیسییەکان لە ساڵەکانی دواییدا خەریکی هێنانەوەی ناوچەکانی کەبەدوکیا بوو بۆ ژێر دەسەلاتی حوکمی خۆی[٤٨]. کە هەڵستا بە سزادانێکی توندی ناوچەکانی باشووری ڕۆژئاواو پاشان باشووری ڕۆژهەلاتی مەملەکەتەکەی. دوای ئەوەی (خاتوشیلی) لە

---

(٤٧) ناوی خانی کەلبات لە بەڵگەنامەکانی سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست مەڵبەندی مەملەکەتی میتانی پێکدەهێنا.ئێستاش پێی دەڵێن سێگۆشەی خابوور (مثلث الخابور)

(٤٨) ناوچەی کەبەدۆکیا دەکەوێتە ناوەڕاستی وڵاتی ئەنادۆل لە ڕۆژهەلاتی خاتووشا.

یەکخستنەوەی مەملەکەتەکەی تەواو بوو ئینجا خۆی تەرخانکرد بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی سەربازی فراوان بۆ سەر کوردستانی سوریا.

خاتوشیلی لە سەرەتای ئەم هەڵمەتەیدا شاری (زارونا) ی نزیك ئالالاخی داگیرکرد و کاولی کرد. دوای ئەمە لە بانی ئەدەلور (هضبة أدلور) لە ئەمانۆس لەگەڵ هێزەکانی شاری خەششوو یان خەششووم کە لەلایەن فرقەیەکی سەربازی شاری حەلەب پاڵپشتی دەکرا بەیەك گەیشتن. لە تێکستێکدا کە ئاماژە بەم رووداوە دەکات و دەڵێن خوریەکانیش لە پاڵ هێزەکانی شاری خەششوو بۆ بەر پەرچ دانەوەی هێرشەکەی خاتوشیلی وەستاون. بەڵام لەکۆتاییدا خاتوشیلی ئەمانەی تێکشکاند، پاشان رووباری (بورەننا) یان (بوورونا)ی بڕی (ئەمەش رووبارێکە کە هەندێك لە توێژەرەکان دەڵێن ڕووباری (عاصی) ئێستایە، بەڵام هەندێکی تر دەڵێن نەخێر ڕووباری عەفرینە) دوای ئەوەی خاتوشیلی ئەم رووبارەی بری توانی شاری خەششۆ داگیربکات.خاتوشیلی داگیرکردنی ئەم شارەی بە یەکێك لە گرینگترین سەرکەوتنە جەنگییەکانی خۆی دادەنێت، هەروەها لە نووسراوەکانی خۆی بەدرێژی باسی چۆنییەتی تالآن کردنی ئەم شارەی کردووە.

لە ئەنجامی ئەمەشدا خانوشیلی هەستا بە گواستنەوەی خوداوەندەکانی مەملەکەتی خەششوو. (خوداوەندی کەش لە شاری ئەرمەرۆك، خوداوەندی (کەش)ی شاری حەلەب و شاری ئەللاتۆم و شاری ئەدەللور و شاری لیللوری و شاری خیپات) لەگەڵ هەموو ئەو کەل وپەلانەی کە لە مەراسیمە ئایینییەکانی تایبەت بەم خوداوەندانە بەکاردەهاتن، بۆ پەرستگای گەورەی خوداوەندی ڕۆژ لە شاری ئەریننا، و پەرستگای خوداوەند میزوللا لە شاری خاتوشا. (خوداوەندی میزوللا لە لای حیسییەکان بە کچی خوداوەندی ڕۆژ دادەنرا). لێرەدا تێبینی دەکەین کە هەندێك لەو خوداوەندانەی کە گواسترانەوە لە بنەڕەتدا خوداوەندی خوری بوونە. چونکە ئەم خوداوەندانە لە کۆمەڵەی خوداوەندی خوریەکانی بەشی رۆژئاوا (مجمع الآلهة الخورية الغربية) ناسراوبوون. گواستنەوەی ئەم خوداوەندانە لە لایەن حیسییەکانەوە بۆ پایتەختی حیسییەکان بووە هۆی گواستنەوەی پەرستن و رێورەسمی ئایینی و ئاهەنگە ئایینییەکانی تایبەت بەم خواوەندانە بۆ ناوچەی یان پایتەختی حیسییەکان، ئەمەش هەر لە کاتێکی درەنگ روویداوە. بەڵام هەندێك لە توێژەرەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە بیروباوەڕی ئایینی خوریەکان هەر لەسەرەتای سەردەمی مەملەکەتی حیسی کۆندا گەیشتۆتە خاتوشای پایتەختی حیسییەکان.

دوای داگیرکردنی شاری خەششۆ لە لایەن حیسییەکان بەڕێوەبردنی شارەکە درا بە حاکمی شاری (خورما)ی حیسی. بەڵام بارودۆخ لە شاری خەششۆ هەر بە ناجێگری مایەوە، ئەمەش

چونکە حاکمی شارەکە زۆر لە خوریەکانی شارەکە دەترسا. ئەمەش بەپێی ئەو هەواڵانەی کە لە بەڵگەنامەی ناسراو بە هەواڵی کۆشك(اخبار القصر) دا هاتووە لەو بەشەی کە باس لە ڕووداوەکانی سەردەمی خاتوشیلی یەکەم دەکات. هەربۆیەش ئەم حاکمە سزایەکی توندی درا. لە شوێنەکی تری هەمان ئەو بەڵگەنامەیە ناوی فەرمانبەرێکی تری گەورە دێت لە شاری خەششو، کەناوی (ئیوری ــ شەدوونی)[٤٩]یە، ئەم ناوەش لە دوو بەش پێکدێت کە بەشی یەکەمیان خورییە و بەشی دووەمیان ئەکەدییە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی پەیوەندی شارستانییەتی لە نێوان خوریەکان و ئەکەدییەکان لە سەردەمی داگیرکاری حیسییەکان.

سەرۆکایەتی کردن و دەست بەسەرداگرتنی حیسییەکان بۆ سەر ناوچەکانی باکووری سوریا (کوردستانی سوریاو عیراق) بەبێ داگیرکرنی شاری حەلەب کارێکی ئاسان نەبوو کە مەڵبەندێکی سەرەکی لە ناوەندەکە پێکدەهێنا. پێش ئەمە لە سەردەمی مەملەکەتی (ماری) دا حەلەب بەیەکێك لەگرنگترین مەڵبەندەکانی شارستانییەت لە ڕۆژهەڵاتی کۆن دادەنرا. هەروەك لە ڕووی بازرگانییەوە بەمیراتگری دراوسێکەی خۆی (مەملەکەتی نیبیللا)دادەنرا. لەبەرئەمەش حیسییەکان مەملەکەتی حەلەبیان بە یەکێك لە مەملەکەتە گەورەکانی ناوچەکە دادەنا، داگیرکردنیشی بە بڕیارێکی ئیلاهی (خودایی) لەقەلەم دەدا.

خاتوشیلی نەیتوانی شاری حەلەب داگیربکات. دواهەمین هەڵمەتی سەربازی سەرکەوتووی خاتووشیلی لە ناوەڕاستی ماوەی حوکمرانی کردنیدا ئەنجامی داوە کە دژ بەشاری خەخخوم بوو، ئەم شارەش دەکەوێتە قەراغی ڕووباری فورات و دوور لە شاری حەلەب. (خاتوشیلی ئەم هەڵمەتەی خۆی لە ڕاپۆرتێکی تایبەت بە کارەکانی خۆی باسکردووە). بەڵام لە سەرچاوەیەکی حیسی کۆن بۆمان دەردەکەوێت کە خاتوشیلی لە کۆتاییەکانی حوکمرانیدا هەڵمەتێکی سەربازی دژی شاری حەلەب ئەنجامداوە بەڵام لەم هەڵمەتەیدا ژیانی خۆی لەدەستدا، ئەمەش دوای ئەوەی بۆ جێنشینەکەی خۆی (مورشیلی یەکەم) وەسیەتێکی بەجێهێشت، کە لە وەسیەتەکەیدا تەئکیدی لە سەر زەرورەتی داگیرکردنی مەملەکەتی حەلەب کردبووەوە[٥٠].

---

(٤٩) وشەی یەکەم (Ewari) خوورییە، کە بەمانای(مەلیك) دێت.بەڵام دووەمیان (Shaduni) وشەیەکی ئەکەدیە بەمانای (چیای ئێمە) دێت.

(٥٠) هەندێك تێکستی نووسراو ئاماژە دەکەن بەوەی کە مەلیك خاتوشیلی لە شەرەکەی دژی مەملەکەتی حەلەب.برینداربووە، بەڵام برینداریەکەی زۆر خراپ بووە، ئینجا بە برینداری گواستراوەتەوە بۆ شاری

لە پێشەکیە مێژوویییەکەی ئەو پەیماننامە سیاسییەی کە لە نێوان مەلیك مورشـیلی دووەم و مەلیکی حەلەب بەسترابوو، ئەم پەیماننامەیەش لە دوای دوو سەدە لـە کوشـتنی خاتوشـیلی بەسترابوو، بۆمان دەردەکەوێت کە خاتوشـیلی توانیبـووی مەملەکـەتی حەلـەب دابڕێـت لـە ناوچەکانی تر، بەڵام مورشیلی یەکەم مەملەکەتی حەلەبی بەتەواوی کاول کردبوو.

داگیرکردنـی شـاری حەلـەب کاریگەریـەکی زۆری کـردە سـەر مەملەکەتـە خوریـەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات. چونکە خوریەکان هاوپەیمانی مەملەکەتی حەلـەب بـوون هـەر لـە ڕۆژانی مەلیکی حیسی خاتوشیلی، ئەم هاوپەیمانییەتەی نێوانیشیان ماوەیـەکی زۆری خایانـد. (ئیدریمی) کە یەکێکە لە نەوەی مەلیکەکانی حەلەب، لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی ١٥ پ.ز ئاماژەی بەم هاوپەیمانییەتە کردووە. مورشیلی یەکەم خوریەکانی بـە ئامـانجی دووەمـی خـۆی داناوە بۆ شەڕکردن لەگەڵیاندا دوای داگیرکرنی شاری حەلـەب. هەربۆیـەش دوای لـە نـاوبردنی مەملەکەتی حەلەب حیسییەکان گشت شوێنەکانی خوریەکانیان کاولکرد. لێرەدا روون نییە کە مەبەست لەمە هەموو ناوچە خوریەکانی دەوروبـەری حەلەبـە یـان هـەموو شـارە خوریـەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فوراتە. بەڵام هەرچـۆنێك بێـت مەبەسـت لێـرەدا هێرشـێکی کاولکـاری و فەوتێنەر نییە بۆ سەرناوچە خوریەکان (ئەمەش لە ڕووداوە مێژوویییەکانی دواتر دەردەکـەوێت) بەڵام ڕەنگە مورشیلی لە ڕووباری فوراتی پەڕیبێتەوە بـۆ دابینکردنـی کـەنارەکانی لای چـەپی ڕووبارەکە. ئەمەش وەك ڕێخۆشکەرێك بۆ کارە سەربازییە لە ناکاوەکـەی، مەبەسـتمان لێـرەدا ئەو هەڵمەتە سەربازیەیە کە بۆ سەر شاری بابل ئەنجامیدا. کە بۆ داگیرکردنی زیـاتر لـە هـەزار کیلۆمەتری بڕی و لە کۆتایدا لە سالی ١٥٣١ پ.ز شارەکەی داگیرکرد[٥١].

---

(کەششار)، هەر لەم شارەدا داوای لە گەورە پیاوان و دەسەڵاتدارانی مەملەکەتەکەی مەجلیسی سەرپەرشتی کار کرد کە بە (بانکۆ)ناسرابوو کۆببنەوە، هەر لەم کۆبوونەوەیەیدا منداڵی کوردەکەی خۆی کە ناوی (مۆرشیلی)بوو کرد بەجێنشینی خۆی. هەروەك داوای لە ڕاوێژکارانی خۆی کرد کە بەشێوەیەکی زۆر توند پەروەردەی بکەن، بەجۆرێك کە بێجگە لە نان هیچی تری نەدەنێ و لە ناو زیاتر هیچی تر نەخواتەوە، بەڵام دوای ئەوەی کە دەگاتە تەمەنی گەنجێتی نانی باشی بدەنێ و ئارەقیش بخواتەوە. هەروەك هیوای خواست کە جێگرەکەی زۆر حەزبکات لە ڕشتنی خوێن وەك بڵێی کە ئامادەی کردووە بۆ تۆڵە سەندنەوە لە دانیشتوانی مەملەکەتی حەلەب.

(٥١) بەپێ ڕێبازی مێژووی کورت، بەڵام بەپێ ی ڕێبازی مام ناوەند ئەوا نزیکەی لە دەوروبەری (١٥٩٥پ.ز) ڕوویداوە، واتە بەجیاوازی ٦٥ ساڵ.

سەرەڕای سەرکەوتنی مورشیلی یەکەم لە داگیرکردنی شاری بابل. بەڵام بەهۆی شەڕە بەردەوامەکانی خوریەکان لە دژی حیسییەکان بووە هۆی ئەوەی کە مورشیلی یەکەم نەتوانێت بۆ ماوەیەکی درێژ دەسەڵات بەسەر ڕێگای رووباری فوراتدا بگرێت.

لەدوای ئەمە مەملەکەتی حیسییەکان لە لایەنی سیاسەتی دەرەکیدا تووشی ووشکییەکی تەواو بوو. ئەمەش بەهۆی ململانێی خوێناوی ناوەخۆ لەسەر وەرگرتنی تەختی دەسەڵات. ئەمەش بووە هۆی بێهێز بوونی مەملەکەتی حیسی. لە ئەنجامی بێهێزبوونی حیسییەکان مەملەکەتی حەلەب جارێکی تر سەربەخۆیی خۆی بەدەست هێنایەوە، هەروەك ولاتی کیزۆفەتناش لە مەملەکەتی حیسییەکان جیابوویەوە. وڵاتی کیزوفەتناش ناوچەکانی کیلیکیە و جوکورفای دەوروبەری ئەدەنەی ئێستا دەگرێتەوە کە بەدرێژایی ڕێڕەوی هەردوو رووباری جەیحان و سەیحان (لە یۆنانیدا بەم دوو رووبارە دەڵێن Saros, Pramos)درێژدەبێتەوە تا دەگاتە ناوچەکانی کەبەدۆکیا. مەڵبەندی ئایینی سەرەکی مەملەکەتی کیزۆفەتنا شاری (کومەننێ) بوو، کە ئەمەش شارێکی زۆر بەناوبانگ بوو. هەروەك ئەم شارە دواتر لە سەردەمی ڕۆمانییەکان بە مەڵبەندە ئاینیەکەی و زۆری پیاوە ئاینیەکانی ناوبانگی دەرکردبوو. کە بە (چۆمانا کەبەدۆکیا) ناسرابوو.

وڵاتی کیزۆفەتنا پێگەیەکی مێژوویی و شارستانی گرنگی هەبوو. لەرێگەی ئەم وڵاتەشەوە رێوڕەسمە ئاینییەکانی خوریەکان گواسترایەوە بۆ ناوچە جیاوازەکانی حیسییەکان. بەڵام تاکو ئێستا نازانین کەی کیزۆفەتنا بووە بە دەولەتێکی سەربەخۆ و بارودۆخەکانی تیادا جێگیربووە. بەڵام ڕەنگە ئەمە ڕاستەوخۆ دوای هێرشە کاولکارییەکەی خوریەکان بۆ سەر وڵاتی حیسییەکان ڕوویدابێت، لە سەردەمی مەلیك خانتیلی کە دوای مورشیلی یەکەم هاتە سەرتەختی دەسەڵاتی مەملەکەتی حیسییەکان. کە ڕەنگە ئەمە لە دەوروبەری ١٥١٠پ.ز ڕوویدابێت[٥٢].

شتەکی ئاستەمە کە وەك ناوچەیەکی سەربەخۆ بروانینە وڵاتی کیزۆفەتنا لەو کاتەی کە مەملەکەتی حیسی کۆن لەوپەڕی بەهێزیدا بووە لە سەردەمی مەلیك خاتوشیلی یەکەم و

---

(٥٢) تێکستەکان دەگێڕنەوە کە خێزانی مەلیك مورشیلی یەکەم خۆی داوەتە دەست خزمەت کارێکی کۆشك بەناوی خانتیلی، ئەم کارەش لەوکاتەدا ڕوویداوە کە مەلیك مورشیلی خەریکی هەڵمەتە سەربازییەکانی بووە لەدەرەوەی کۆشکی تایبەتی خۆی. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە خێزانی مەلیك مورشیلی یەکەم منداڵێکی لە خانتیلی ببێت. پاشان خانتیلی مەلیکی کوشت و بەشێوەیەکی ڕەسمی شاژنی هێنا و دەسەڵاتی عەرشی وەرگرت بەڵام بەبێ ئەوەی کە نازناوی مەلیك وەربگرێت.

مورشیلی یەکەم. هەرچەندە لەم قۆناغــە زووەدا دەربــارەی بــارودۆخی سیاســی لــە کیزۆفــەتنا زانیاریمان کەمە، بێجگە لەناوی هەندێك شــوێن کــە لــە فەرمانــە نوســراوەکانی تیلیبینــۆ[٥٣] داهاتووە هیچی تر نازانرێت، کەئەمەش گرنگییەکی مێژوویی ئەوتۆی نییە. ســەرەڕای ئــەوەی کە ئیشارەت بەحەزی مەلیکە یەکەمەکانی مەملەکەتی حیسی دەکات بەوەی کە هەوڵیانــدەدا کە دەسەڵاتی مەملەکەتەکەیان بگاتە دەریای ناوەڕاست.

بەڵام هەرچۆنێك بێت باسکردنی شاری (لوخوزەندیا) (دواتر بووە شاری لاوازەنتیا) لە کاتی وەسفکردنی ئابلۆقەدانەکەی سەر شاری (ئورشۆ) لەلایــەن مــەلیك خاتوشــیلی یەکــەم، ڕەنگــە دەلالەت بکات لەسەر ئەوەی کە بەلایەنی کەمەوە ناوچەکانی باکووری کیزۆفــەتنا لــە دەســت حیسییەکان بووە.

بۆ یەکەم جار وڵاتی کیزۆفەتنا وەك قەوارەیــەکی سیاســی، لەســەردەمی مــەلیکی حیســی (زیدەنتا) لە دەوروبەری ١٤٩٠پ.ز سەری هەڵدا. ئەم مەلیکەش دووەم جێنشینی مورشیلییە. چونکە ئێمە ئەوە دەزانین کە مەلیکی کیزۆفەتنا کە ناوی (فیللییا) بوو پەیماننامەیەکی لەگــەڵ مەلیکی حیسی (زیدەنتا) بەستا. کە بەهۆی ئــەم پەیماننامەیــەش شــەڕ لــە نێــوان هــەردوولا کۆتایی پێهــات. لــەم پەیماننامەیــە و چــەندیان پەیماننامــەی تــریش دەردەکــەوێت کــە وڵاتــی کیزۆفەتنا هەرێمێك نەبووە کە سەر بــە مەملەکــەتی حیــسییەکان بێــت. بــەڵکو هــەرێمێکی سەربەخۆی گرنگ بووە، ئەمەش لە خاڵەکانی پەیماننامەکەی نێوان ئــەم دوو مەلیکــە ڕەنگــی داوەتەوە، ئەمەش چونکە بڕیارەکانی ناو پەیماننامەکە بە شێوەیەکی یەکــسان بەســەر هــەردوو لایەن سەپێنراوە.

وڵاتی ئەدەنییا (واتە ناوچەکانی ئەدەنەی ئێستا، کــە کیزوفــەتناش دەگرێتــەوە) بەشــداری کردووە لە هاوپەیمانییەك دژی مەلیکی حیسی ئامووننا(١٤٨٠پ.ز). وا دەردەکەوێت کە وڵاتی کیزۆفەتنا بەشێوەیەکی تەواو سەربەخۆبووە لە ماوەی نەوەی داهاتوودا. ئەمــەش بــە بەڵگــەی ئەوەی کە مەلیکی کیزۆفەتنا کەناوی (ئیشبوتەخشۆ) بووە لە(١٤٦٠پ.ز) نازناوی (مــەلیکی گەورە)ی هەڵگرتووە ئەمەش لە ختمێکی ئەو مەلیکە دەردەکەوێت. کە ئەم ختمەش لە شــاری تەرتوسی سەر بە کیلیکیە دۆزراوەتەوە. ئــەم مەلیکــە بەهــەمان شــێوە پەیماننامەیــەکی تــری

---

(٥٣) ئەمەش نووسراوێکە کە مەلیك تیلیبینۆ (١٥٠٠ -١٤٧٥ پ.ز) دەریکردووە، کەتیایدا باس لە ڕێکخستنی بنەماکان و چۆنیەتی وەرگرتنی تەختی دەسەلات دەکات.

بەستووە لەگەڵ مەملەکەتی حیسییەکان. هەروەها چەندین پەیماننامەی ترمان هەیە کە مێژووەکەیان نازانرێت، ئەم پەیماننامانەش لەلایەن چەند مەلیکی تری کیزۆفەتنا لەگەڵ مەلیکەکانی مەملەکەتی حیسی بەستراون، لەم مەلیکانەش: ئیخییا، بەتتەتیششۆ.

بەلایەنی کەم زمان و بیروباوەڕی ئایینی خوریەکان لە ماوەی سەدەی (١٥پ.ز) لە وڵاتی کیزۆفەتنا بڵاوبۆوە. هەرچەندە زانیارییەکانمان دەربارەی ئەم سەردەمە لەهەندێك تێکستی نووسراوی حیسی سەردەمەکانی دواتر وەرگرتووە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمی سەرچاوەی ئەسلی لە ناوچەکە خۆیدا.

لە ئەنجامی خەریك بوونی هەریەکە لە خوریەکان و حیسییەکان بە شەڕ و ململانێیەکی توندی نێوانیان بە مەبەستی سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکانی ڕووباری فوڕات و کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست. لەم کاتەدا لە میسر بنەماڵەیەکی میسری کە لە شاری(تیبە) حوکمیان دەکرد توانیان کۆتایی بە حوکمرانی هیکسۆسەکان لە میسر بهێنن و جارێکی تر وڵات یەکبخەنەوە.

مەلیکەکانی دەوڵەتی میسری نوێ[٥٤] دوای ماوەیەکی کورت لە یەکخستنی دەسەڵاتی ناوەخۆیان، دەستیان بە هەوڵدانەکانیان کرد بۆ سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچە دراوسێکانی باکووری وڵات، بەتایبەتی مەڵبەندە سەرەکیەکانی بازرگانی. مەبەستی سەرەکیشیان لەمەدا بەدەست هێنان و باش کردنی باری ئابووری وڵات بوو. ئەویش لە ڕێگەی ئەو ماڵ و مولکەی کەلەکاتی ئەنجامدانی هەڵمەتە سەربازییەکان و سەپاندنی زەریبەش بەسەر ناوچەکان بەدەستیان دەهێنا. هەر بۆیەش تحوتمسی یەکەم (١٤٩٧- ١٤٨٢ پ.ز) بێهێز بوونی دەسەڵاتی حیسییەکانی لە باکووری سوریا بە هەلزانی، بۆیەش هەڵمەتێکی سەربازی بۆ سەرناوچەکە ئەنجامدا و توانی فەلەستین داگیربکات. بەڵام لە هەڵمەتەکانی تری دا میسریەکان توشی دوژمنەك هاتن کە پێیان دەگوتن (نەهرینا)(لە تەورات بە(ئارام نەهرایم) ئاماژەی پێ کراوە) کە ئەمەش بەمانای (وولاتی رووبار)دێت. مەبەست لەم ناوەش ئەو ناوچانەیە کە دەکەوێتە لای پێچەکەی رووباری فورات(کوردستانی سوریا). هەروەها نەقشێکی نووسراو (ئاتەواوە) هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (تەحوتمسی یەکەم) کە تیایدا بۆ یەکەم جار باسی ناوی مەیتانی (دواتر بووە میتانی) دەکات. ئەمەش ئەو ناوەیە کە دانیشتوانی ناوچەی کوردستانی کۆن بە وڵاتەکەی خۆیان دەگوت.

---

(٥٤) سەردەمیَ دەوڵەتی نوێی میسری لە (١٥٧٥ — ١٠٨٧پ.ز) دەگرێتەوە.

توێژەرەکان و لێکۆڵەرەوەکان تاکو ئێستا نەیانتوانیوە ناوی میتانی شیبکەنەوە و ماناکەی دیاری بکەن. بەڵام واپێدەچێت کە بەشی سەرەکی تیایدا برگەی (مەیتا) یە کە زۆرجار وەکو ناوێکی کەسەکان دێت، بەڵام برگەی(نی) ئەوا بریتییە لە پاشگر. هەندێك لە توێژەرەکان دەڵێن ناوی(میتانی) ناوی سەرکردەیەکی سیاسی کۆن بووە. بەڵام کۆنترین بەکارهێنانی ئەم ناوە (بۆ یەکەم جار لە نەقشە میسرییە نووسراوەکە هاتووە) ئیشارەتی بە وڵاتەك کردووە نەك بە نەتەوەیەك یان چینێکی کۆمەڵایەتی. بەڵام سەرچاوە ئەکەدیەکان لە جیاتی ناوی میتانی ناوێکی تری هاوواتای ئەمیان بەکارهێناوە ئەویش(خانی کەلبات یان خاڵی کەلبات)ە، هەرچەندە کۆنترین شێوازی ئەم ناوە بە (خابین کەلبات)هاتووە.

هەردوو ناوی(میتانی، خانی کەلبات)دەلالەت لەیەك وڵات دەکەن. ئەویش ئەو وڵاتەیە کە دەکەوێتە نێوان پێچەکەی ڕووباری فورات و ڕێڕەوی سەرووی ڕووباری دیجلە مەڵبەندەکەشی ناوچەی سێگۆشەی سەرچاوەکانی ڕووباری خابوورە. بەڵام سنوورەکانی باکووری ئەم وڵاتە بەشێوەیەکی تەواو نازانرێت. هەروەها مەملەکەتی میتانی ناوچەکانی تورعابدین و دەشتەکانی دەوروبەری شاری دیاربەکری ئێستا دەگرێتەوە، بەڵام لەلای باکووریدا هاوشان بووە لەگەڵ هەردوو وڵاتی ئیشووا وڵاتی ئەڵشی. وڵاتی ئیشووا مەڵبەندە ئابوورییەکەی ناحیەی ئەلتینۆڤا بووە. کە ئێستا لایەکانی دەریای – کیبەن – ە. بەڵام وڵاتی ئەڵشی دەکەوێتە باکووری ڕووباری دیجلە، لەو بەشەی کە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات. ئەم بەشەی ڕووباری دیجلە لە سەرچاوە یۆنانییەکان بە ئەرزەنینی (Arzanene) ناوبراوە. هەردوو وڵاتی ئیشووا و ئەلشی خوریەکانی تیادا دەژیا. ئەم دوو وڵاتەش بەدرێژایی چاخەکان سەر بەناوچەکانی ژێردەسەڵاتی مەملەکەتی میتانی بووە.

سەرچاوە نووسراوەکان، بەتایبەتی سەرچاوە نووسراوەکانی حیسییەکان، زیاتر لە جارەك ئیشارەت بە خوریەکان دەکەن وەك نەتەوەیەك یان ئیشارەت بە وڵاتەکەیان (وڵاتی خووری) دەکەن. ئەمەش لەپاڵ ناوی ئەو شوێنە جوگرافیانەی پێشتر باسمان کرد. وەك (میتانی، خانی کەلبات، نەهرینا).

تێکستە میسریە نووسراوەکانی سەردەمی (بنەماڵەی ١٨)[٥٥] ئیشارەت بە خوریەکان دەکات.کە سەرەتا ئاماژە دەکەن بەوەی کە نەتەوەیەکن لە سوریا و فەلەستین نیشتەجێ

---

(٥٥) سەردەمی بنەماڵەی هەژدەمی میسر لە ساڵی(١٥٧٥ – ١٣٠٨ پ.ز) دەخایەنێت

بوونه، پاشان لەناوچـەکانی هاوشـان بـۆ سـنووری بـاکووری میـسر بەتایبـەتی ناوچـەکانی فەلەستین و فینیقیا.

بەکارهێنانی لەقەبی (مەلیکی میتانییەکان یان مەلیکی خوریەکان)لە هەنـدێك سەرچـاوە ئەکەدییەکان بەهیچ شێوەیەك نابێت وا شیبکرێتەوە وەك پالپشتی کەرانی ئەو بیردۆزە کۆنـەی کە دەیانگوت مێژووی خوریەکان لە ماوەی سەدەکانی(١٥-١٤پ.ز) بریتی بووە لـە مێـژووی دوو دەولەتی جیاوازی رکابەر.

ناوچەکانی ژێردەسەلاتی مەملەکەتی میتانی لە لای رۆژئاواوە لە دەوروبەری (١٤٧٠پ.ز) زۆر فراون بوو. بەجۆرێك کە مەملەکەتی حەلەبیش کەوتە ژێردەسەلاتی مەملەکەتی میتـانی. ئەمەش لەدوای داگیرکردنی مەملەکەتی حەلەب لەلایەن مەلیکی حیسەکان مورشـیلی یەکـەم وەك باسمانکرد لەلاپەرەکانی پێشوودا. ئەوا مەملەکەتی حەلەب توانی جارێکی تر سەربەخۆیی خۆی رابگەیەنێت. لەم ماوەیەی سەربەخۆییدا سـێ مـەلیك لـە حەلـەب فـەرمانرەواییان کـرد ئەوانیش (شەررە ــ ئیل، ئەببال ــــ نیـل، ئیلـیم ــــ ئیلیمـا) بـوون. بـەلام لـەدوای ئەمـە مەملەکەتی حەلەب کەوتە ژێردەسەلاتی مەملەکەتی میتانی. ئەمەش لـەکاتی فـروان بـوونی مەملەکەتی میتانی بەرەو رۆژئاوا رِوویدا. مەملەکەتی حەلەب پێش ئەوەی لەلای میتانییەکان داگیربکرێت دەسـەلاتەکی بەهێزی هەبوو لە سەردەمی ئەم سێ مەلیکەی باسـانکرد. کـەتوانی چەندین دەولەتۆکەی بچووك بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی لەلای رِۆژئاوا وەك دەولەتـەکانی نییـا و ئەممائو و موکیش ــ ئالالاخ ــ کە سنوورەکەی دەگەیشتە کەنارەکانی دەریای ناوەرِاست.

لەحەلەب شۆرِشێك سەری هەلدا کە لەلایەن میتانییەکان پالپشتی دەکرا لە ئـەنجامی ئـەم شۆرِشەوە (ئیدریمی) کورِی دواهەمین مەلیکی مەملەکەتی حەلەب رِایکـرد و سـالانێکی زۆری لەدەربەدەرایەتی بەسەر برد. لەم ماوەیەشدا (بارراتارنا)ی مەلیکی خوریەکان تـوانی سـنووری مەملەکەتەکەی(مەملەکەتی میتانی) فراوان بکات و بگاتە دەریای ناوەرِاست. پاشان ئیـدریمی توانی ئاشت بێتەوە لەگەل (بارراتارنا) و پەیمانێکی لەگەل ببەستێت، کە بە هۆیەوە کـردی بـە مەلیك لەسەر ئالالاخ.

ناوچەکانی ژێردەسەلاتی ئیدریمی (بێجگە لـە مـوکیش – ئـالالاخ-) ناوچـەکانی نییـا و ئەممائوی دەگرتەوە. بەلام حوکمکردنی مەلبەندی مەملەکەتی حەلـەبی پێـشوو بەیـەکێکی تـر سپێردرا. لە هەوالە حیسییەکانی دواتر بۆمان دەردەکەوێت کە حەلەب هەر بەشارێکی مەلەکی مایەوە. هەروەها ئیدریمی بەپێی پەیماننامەیەك ناچاربوو سەر بۆ سەرۆکایەتی میتانی دابنـێ و

جزیەشی پێبدات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مافی ئەنجامدانی بەستنی پەیماننامــەی نێودەوڵــەتی و سیاسەتی دەرەکی سەربەخۆی هەبوو. بەمەرجێك دەبێت لەژێر ئــەرك و فەرمانــەکانی تــەواوی مەلیکی میتانی دابێت.

ئەمەش لەو پەیماننامەیەدا دەردەکەوێت کــە ئیــدریمی بەســتوویەتی دوای ســەرکەوتنی لــە شەڕێکدا بەســەر مــەلیك فیلیــا مــەلیکی کیزۆفــەتنا ی دراوســێی لــەلای باکووریــەوە. ئــەم پەیماننامەیەش سەبارەت بە دیاریکردنی ســنووری نێوانیــان بــووە.لــەم پەیماننامەیــەش بۆمــان دەردەکەوێت کە کیزۆفەتنا وەك ئــالالاخ ســەر بەمەملەکــەتی میتــانی نــەبووە، هــەر بۆیــەش ئیدریمی بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخی ناوچەکە ئەم پەیماننامەیەی بــە شــتێکی زەروری زانیــوە. ئەمەش کارێکی پێویست نەبووە ئەگەر بێت و هەردوو دەسەڵات (ئیدریمی لە ئالالاخ و فیلیا لە کیزوفەتنا) سەر بەیەك دەسەڵات بوونایە کەئەویش مەملەکەتی میتانییە. هــەروەك پێــشتریش ئاماژەمان بەوە کرد کە چۆن مەلیکی میتانی ئیدریمی کردە مەلیك لە سەر ئالالاخ، بۆیە لێــرە دا بەڵگەیەکی روون دەردەکەوێت کە کیزۆفەتنا لە سەردەمی فیلیا سەر بە مەملەکەتی میتانی یان خووری نــەبووە. بۆیــە ئــەم پەیماننامەیــە بەســتراوە، ئەگــەرنا هــەردوو دەوڵــەت ســەر بــە مەملەکەتی میتانی بوایە ئەوا پێویستی بەم پەیماننامەیە نــەدەکرد لەوکاتــەی هــەردوو لایــەن سەر بەیەك دەسەڵاتن.

خوریەکان و هاوپەیمانەکانی بەتەواوەتی دەستیان بەسەر جموجــۆلی بازرگانیــدا گرتبــوو لــە ناوچــەکەدا. بــەڵام هەنــدێك جــار ئەمــە لــەژێر دەســتیان نــەدەما ئــەویش بــەهۆی هەڵمەتــە سەربازییەکانی میسریەکان بۆ سەر سوریا. بەڵام دوای ئــەوەی فیرعــەونی میــسری تەحوتمــسی سێهەم توانی بارودۆخی ناوەخۆی وڵاتەکەی جێگیربکات، ئینجا لە ساڵی (١٤٥٨ پ.ز) یەکــەم هەڵمەتی سەربازی بۆ سەر وڵاتی سوریا بــە بەشــەکەی کوردستانیــشەوە ئەنجامــدا.کــە تــوانی شەڕێکی سەرکەوتوانە ئەنجامبدات لە نزیك شــاری (میجیــدۆ)[٥٦]، دژی یــەککگرتنێکی ســوری بەسەرکردایەتی مەلیکی قادش[٥٧].

(٥٦) ئەم شوێنە ئەمڕۆ بە گردی مۆتەسەللم ناسراوە کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی توولکەرەم لە فەلەستین.

(٥٧) ئەمەش ئەمڕۆ گردی پێغەمبەر (مەند)ە کە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای دەریاچەی قەتینە (حمص).

هیچ شتێك دەربارەی پەیوەندی دەوڵەتەكانی سوریای ناوەڕاست و باشور و مەملەكەتی میتانی (لە كوردستانی سوریا و عیراق) نازانین لەو سەردەمەدا. بەڵام لەرێگەی هەندێك تێكستی مێخی (مسماری) نوێتر لە ڕووی مێژووییەوە بۆمان دەردەكەوێت كە خوریەكان بەشێكی سەرەكی دانیشتوانی ئەم دەولەتانەیان پێكدەهێنا، زۆربەی چینە كۆمەڵاتییە بەرزەكان و چینە دەسەڵاتدارەكان لەم دەولەتانە لە سوریا لەو كاتدا لە خوریەكان پێكهاتبوو. ئەمەش وەك لە تێكستە نووسراوەكان ئاماژەی پێكراوە.

هەربۆیەش لێرەدا بۆمان دەردەكەوێت كە بوونی پەیوەندی شارستانییەتی لە نێوانیاندا لە ئەنجامی پەیوەندی هاوشێوەی سیاسی بوو. هەروەك ئەم یەگرتنەی مەملەكەتەكانی سوریا دژی فرعەونی میسری تحوتمس لەلایەن مەملەكەتی میتانییەوە پاڵپشتی دەكرا.

پەلهاوێشتنی میسریەكان بۆ لایەكانی باشوری ڕۆژئاوای سنووری مەملەكەتی میتانی هەلێكی باش بوو بۆ وڵاتی ئاشوور كە ئەو كات هێزێكی سیاسی لاوازی پێكدەهێنا لە سەر سنورەكانی باشوری رۆژهەلاتی مەملەكەتی میتانی، بۆ ئەوەی دژی بلاوبوونەوەی خوریەكان لەناوچەكانیدا بوەستێت. هەر بۆیەش دوای تەواوبوونی شەڕی مەجیدۆ لەبەرژەوەندی فرعەونی میسری حاكمەكانی ئاشوور دیاری بەنرخیان بۆ فرعەونی میسری نارد. دوای ئەمەش بە ماوەیەكی كەم حاكمی شاری ئاشوور كەناوی (ئاشوور ـــ نادن ـــ ئەخی) بوو لە ساڵی ١٤٣٠پ.ز زێڕی بۆ ڕەوانەكرا لەلایەن فیرعەونەكانی میسرییەوە.

دوای ئەوەی تحوتمسی سێیەم، لە هەڵمەتێكی توانی قەڵای قادش داگیربكات. ئینجا لە هەڵمەتەكانی تریدا بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ ڕووی كردە ئەو ناوچانەی مەملەكەتی میتانی كە دەكەوێتە ڕۆژئاوای ڕووباری فورات. لەساڵی (١٤٤٧پ.ز) گەیشتە ناوچەكانی كەركەمیش. پاشان لە ڕووباری فورات پەڕیەوە بۆ لای چەپی بەبێ ئەوەی لەلایەن میتانییەكان هیچ بەرهەڵستییەكی بكرێت.

لەپاڵ ئاشوورییەكان دراوسێیەكی تری مەملەكەتی میتانی دەستیكرد بە جموجۆل كە ئەوانیش حیسییەكان بوون، كە ئەمانەش پێش ئەمە لە مەوقفەكی دیفاعیدا بوون. مەلیكی حیسییەكان توتخالیای یەكەم (یان دووەم) دەستیكرد بە پەیوەندی لەگەڵ فرعەونی میسری كە تیایدا ئارەزووی خۆی دەربری بۆ بەستنی هاوپەیمانییەك لەگەڵیدا، هەروەها دیارییەكی زۆریشی بۆ ڕەوانە كرد.

دروستبوونی ئەم بارودۆخە سیاسی و سەربازییە نوێیە بەشێوەیەكی تەواو گونجاوە لەگەڵ داگیركردنی لە ناكاوی حەلەب لەلایەن حیسییەكان. هەروەك پەیماننامەیەكی نێودەوڵەتی

حیسییەکان ئیشارەت بە داگیرکردنی حەلەب دەکات لەلایەن مەلیکێکی حیسی کەناوی توتخالیایە. ڕەنگە ئەم داگیرکردنەش بە ڕێکەوتنێك بوو بێت لەگەڵ فیرعەونی میسری. یان ڕەنگە مەلیکی حیسییەکان بارودۆخی ناجێگیری باکووری سوریا(کوردستانی سوریای) بە هۆی هەڵمەتە سەربازییەکانی میسرییەکان هەڵقۆستبێتەوەو ئەم کارەی(داگیرکردنی حەلەبی) ئەنجام دابێت. پەیماننامەیەکی(میسری ـــ حیسی) بەستراوە کە پەیوەست بووە بەدیاری کردن و چاك کردنی سنووری نێوانیان کە بەجۆرێك لە بەرژەوەندی میسرییەکان دابێت. ئەم پەیماننامەیەش لە سەرچاوەیەکی مێژوویی دواتر ئیشارەتی پێکراوە.

تەحوتمسی سێیەم سەرەڕای سەرکەوتنە سەربازیەکانی نەیتوانی ناوچەکانی سوریا (بەکوردستانییەوە) بکاتە بەشێکی جێگر لە ئیمبراتۆریەتەکەی. دواهەمین هەڵمەتی سەربازی تحوتمس بۆ سەر سوریا لە ساڵی ١٤٣٨پ.ز بوو، کەتیایدا هەستا بە لەناوبردنی شۆرشێك کە لەلایەن میتانییەکانەوە پاڵپشتی دەکرا. ئەم شۆڕشەش لە هەردوو شاری تونیب و قادش سەری هەڵدابوو.

بەپشت بەستن بەو زانیاریانەی کە لەسەرچاوەکاندا هاتوون، ناتوانین ناوی یەکەمین حاکمەکانی مەملەکەتی میتانی کە لە تێکستە نووسراوەکان هاتووە بە ڕووداوەکانی ناوچەکە ببەستینەوە. بەڵام دەتوانین سەردەمی فەرمانڕەوایی کردنی بەناوبانگترین مەلیکی میتانی ناسراو بە(ساوشتاتار)دیاری بکەین، کە ماوەی فەرمان ڕەوایی کردنی مەلیك شاوشتاتار لە دوای کۆتایی هاتنی هەڵمەتەکانی فرعەونی میسری تەحموتمس سێیەم دەست پێدەکات.

ساوشتاتار توانی جارێکی تر سەر لە نوێ مەملەکەتی میتانی یەك بخاتەوە. هەروەك شاری ئاشووری داگیرکرد کە پێشتر هەوڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆی دەدا. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە مەلیك ساوشتاتار پەیماننامەیەکی لەگەڵ میسردا مۆرکرد، هەروەها دەسەڵاتی خۆی بەسەر وڵاتی موکیش (ئالالاخ) تاکو دەگاتە دەریای ناوەڕاست سەپاند. پاشان دەستی گرت بە سەر شاری ئۆغاریت کە لە ڕووی بازرگانییەوە بەیەکێك لە گرنگترین شارەکان دادەنرا کە دەکەوێتە باکووری کەنارەکانی دەریای ناوەراست. هەروەها دەستی گرت بەسەر مەملەکەتی کیزوفەتنا لە وڵاتی کیلیکیە. ئەم فراوان بوونەی مەملەکەتی میتانی حەلەبیشی گرتەوە. هەروەك لەلای ڕۆژهەڵات مەلیکی ئارراپخا سەر بەدەستەڵاتی مەملەکەتەکەی ساوشتاتار بوو. بەم جۆرە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ساوشتاتار لە چیای زاگرۆسەوە تاکو دەریای ناوەڕاستی درێژببووەوە. بەمەش هەموو ناوچە شارستانییە خووری نشینەکان کەوتە ژێر دەسەڵاتی و بوو بە بەشێك لە مەملکەتی میتانی. (سەیری وێنەی ژمارە ٣ بکە)

پایتەختی مەملەکەتەکەی ساوشتاتار شاری وەششوکانی بوو. دواتر پایتەختەکە لەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاست ناوەکەی بووە ئوششوکانی، دواتر لە سەردەمی ئاشووری نوێدا ناوەکەی گۆڕا بۆ سیکانی[58]. ناوی سیکانی لە تێکستە ئاشوورییەکاندا وەك شارێك باسی دەکرێت.لەتێکستەکاندا ئاماژە بەم شارە دەکات و دەڵێت دەکەوێتە سەر سەرچاوەکانی ڕووباری خابوور. ئەمەش واتە نزیك شاری(سەروکانی) (رأس العین)ی ئێستا. بەمەش دەتوانین بڵێین ڕەنگە شاری سیکانی ئێستا بکەوێتە ژێر گردی ناسراو بە گردی فخیریە یان فخاریە واتە(گردی گڵینە)، ئەمەش لەبەربوونی پاشماوەی گۆزەی کۆن تیایدا بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە.

بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن ناوی سیکانی شێوازێکی پێشکەوتووی گۆڕاوی پایتەختی میتانییەکانە (وەششوکانی، ئوششوکانی) ئەوە گومان لە بیرو بۆچوونەکانیان هەیە ئەمەش لەبەردووهۆکار کە ئەمانەن:

١- تێکستە نووسراوەکانی سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم (کۆتایی هەزارەی سێیەم پێش زاین) ئیشارەت بەبوونی شارێك بەناوی سیگان (Sigan) دەکات لە ناوچەی خابوور.

٢- شیکردنەوەکانی چالاکی تیشکی نیۆترۆن کە لەسەر ئەو تاتە قوڕانەی کە نامەکانی مەلیکی میتانی توشراتا لەسەر نووسرابوو، دەریخست کە تایبەتمەندییەکانی ئەو توخمانەی کە لەو تاتە قوڕانەدا ماونەتەوە تەواو جیاوازە لە پێکهاتەی تاتە قورە نووسراوەکانی سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست کە لە گردی گۆزە(فخاریە) دۆزرابوونەوە.

هەربۆیەش ڕەنگە شاری واششوکانی بکەوێتە ناوچەکانی دوورتر بەلای باکووریەوە، واتە دەوروبەری شاری ماردین. بەزۆری ڕەنگە بکەوێتە ڕۆژئاوای یان باکووری ڕۆژئاوای شاری ماردین[59].

---

(٥٨) لە نووسراوەکانی سەردەمی ئاشووری نوێ(٩١٢ - ٦١٢ پ.ز) ناوی سیکانی چەندین جار ئاماژەی پێکراوە. هەروەها لە نەقشێکی نووسراو لەسەر پەیکەرێکی بازلتی ناوی سیکانی نووسرابوو. ئەم پەیکەرە لە ساڵی ١٩٧٩ زاینی لە گردی فوخەیریە ی نزیك شاری سەروکانی (رأس العین) دۆزرایەوە.

(٥٩) بیروڕای زۆرجیاواز و دژیەك هەیە سەبارەت بە متابەقەکردنی هەردوو شاری واششوکانی و سیکانی. هەروەها سەبارەت بە شوێنی شاری وەششوکانی. هەربۆیەش ئەم کێشەیە تاکو ئێستا ماوەتەوە و توێژەرەکان لەسەری ڕێك نەکەوتوون.

تاكو ئێستا سەرچاوە مێژوویەكانمان لە پایتەختی مەملەكەتی میتانی یان لە هەر ناوەندێكی تری مەملەكەتەكە بەدەست نەگەیشتووە. هەر بۆیەش ناچارین پشت ببەستین بەسەر ئەو بەڵگەنامانەی كە لە چوارچێوەی ناوچەكانی ژێردەسەڵاتی مەملەكەتەكە دۆزراونەتەوە لەوانەش:

١- نامەیەكی مەلیك توشراتا كە لەشاری نوزی سەر بە هەرێمی ئارابخا دۆزرابۆوە. ئەم نامەیەش تەمغەی مۆرێكی پێوەیە كە لەسەری ناوی مەلیك بارساتاتار نووسراوە كە ئەمەش ناوی باوكی ساوشتاتارە.

٢- دوو تاتە قوڕی نووسراو كە لە ئالالاخ دۆزراونەتەوە، كە ناوەڕۆكەكەی هەندێك بڕیاری یاسایی و فەرمانی لەخۆگرتبوو. ئەم بڕیارانەش لەلایەن مەلیك ساوشتاتار پەسند كرابوون. ئەمەش بەمۆركردنی ئەم بڕیارانە لەلایەن مەلیك ساوشتاتار بە بەكارهێنانی مۆری بنەماڵەی دەسەڵاتدار. ئەمەش مۆرێكە بۆ یەكێك لە مەلیكەكانی بنەماڵەی دەسەڵاتدار دەگەڕێتەوە دواتر وەك میرات و بەڵگە لەسەر شەرعیەتی دەسەڵاتەكەی لەلایەن مەلیكەكانی دواتر بەردەوام بەكارهاتووە. ئەم جۆرە بەكارهێنانەی مۆر بەشێوەیەكی میراتگری یەك بەدوای یەكی زۆرباو بووە لە هەریەكە لە ئالالاخ و ئۆغاریت و ئامورو. ئەو مۆرەی كە تایبەتە بە بنەماڵەی دەسەڵاتداری میتانی ئەو نووسینەی لەسەر نوسرابوو (شوتتارنای كوڕی كیرتا، مەلیكی میتانییەكان) ئەمەش یارمەتیمان دەدات بۆ زانینی ناوی دوو مەلیك كە لە نووسینەكانی تر نەزانرابوو.

ناوی شوتتەرنا لە زنجیرەی ناوی مەلیكەكانی میتانی زۆر دووبارە دەبێتەوە. بەڵام مەلیك كیرتا، هەندێك لە توێژەرەكانی وەك ئۆلبرایت Albright، ئاستۆور Astour دەڵێن ئەم ناوە ناوی بنەڕەتیەكەی مەلیكی ئەفسانەی (كرت)ە. كە چیرۆكێكی ئەفسانەیی ئۆغاریتی بەناوبانگ دەربارەی ئەم مەلیكە هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەیان شتەكی تەئكیدكراو نییە. كات و ماوەی حوكمكردنی ئەم دوو مەلیكە بە تەواوەتی نازانرێت. بەڵام ڕەنگە ماوەی حوكمی ئەم دووانە بكەوێتە نێوان ماوەی حوكمی هەردوو مەلیك (بارراتارنا) و (١٤٧٠پ.ز)، بارساتاتار(١٤٤٠ پ.ز). دیاریكردنی ئەم ماوەیەش بەپێی هەڵسەنگاندنی ئەو لیستانەیە كە لە نێوان بەڵگەنامەكانی بەڕێوەبردنی كۆشك لە نوزیدا دۆزرابوونەوە. كە تیایدا ئاماژە بە مردنی مەلیكەك دەكات بە ناوی بارراتارنا، ئەمەش نزیكەی لە هەمان ئەو سەردەمەدا نووسراوە  كە نامەكەی ساوشتاتاری تێدا نووسرابوو وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێكرد.

دەقەکانی ئەم لیستە ئاماژە ناکات بەوەی کە ئەو مەلیکەی مردووە میتانییە. بەڵام لەراستیدا میتانی بووە چونکە مەلیکەکانی ئارڕابخا یان نوزی ناوی خوری یان (میتانی) هەبووە نەك ناوی هیندۆئاری. ئەم بەڵگەنامەیەش (نامەکە) بەردەوام وا تەفسیر دەکرێت بەوەی کە ئیشارەت بۆ بارراتارنا دەکات وەك گەورەی ئیدریمی. بەڵام ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەنێوان ئەم دوو بەڵگەیەدا (لیستی نوزی، بارراتارنا گەورەی ئیدریمی)ماوەیەکی زەمەنی هەبێت کە بە (٤٠-٥٠)ساڵ دەخەملێنرێت. هەر بۆیەش وادانراوە کە هەردوو مەلیك (کیرتا و شوتارنای یەکەم) لەم ماوەیەدا حوکمیان کردووە. هەروەها مەلیکێکی تر بە ناوی بارراتارنای دووەم بۆ ماوەیەکی کەم فەرمانڕەوای کردووە پێش یان پاش ساوشتاتار لە دەوروبەری (١٤٢٠پ.ز).

ململانێی نێوان مەملەکەتی میتانی ومەملەکەتی میسری بۆ سەپاندنی دەسەڵات بەسەر سوریا بەردەوام بوو تاکو سەردەمی تحوتمسی چوارەم (١٤٠٠-١٣٩٠پ.ز)، کە لەهەواڵێکدا ئیشارەت بە ئەنجامدانی هەڵمەتێکی سەربازی دەکات بۆ سەر وڵاتی نەهرینا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو زلهێزە سەرەکییە دەستپێکرد.

پەیوەندی دیبلۆماسی لە نێوان میتانییەکان و میسرییەکان لە سەردەمی (ئەمینۆفسی) دووەم (١٤٢٨-١٤٠٠پ.ز) جارێکی تر دەستپێکردەوە. کە لە نێوان ئەم دوو مەلیکەدا پەیماننامەیەکی ئاشتی بەستراو مۆرکرا. دواتر پەیوەندییەکانی نێوانیان زیاتر پەرەی پێدرا ئەویش بە ئەنجامدانی ژن و ژن خوازی لە نێوان هەردوو بنەماڵەی دەسەڵاتدار(میتانی و میسرییەکان). کە مەلیکی میتانی مەلیك ئەرتاتامای یەکەم جێگری مەلیك ساوشتاتار هەستا بە پێدانی یەکێك لە کچەکانی خۆی بە فرعەونی میسر بۆ ئەوەی ببێت بەخێزانی.

ئەم زانیارییەشمان لە نامەیەك بۆ دەردەکەوێت کە دوای دوو پشت لەم ڕووداوە نووسراوە. هەروەك لە نامەکەدا دەڵێت ئەم ژن خوازییە بە ئەنجام گەیەنرا دوای ئەوەی حەوت جار لەلایەن فرعەون داوای کچی مەلیك ئەرتاتامای یەکەم کرا، واتە دوای داواکردن و گفتوگۆیەکی زۆر. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەردوو دەوڵەت میتانی و میسری هاوسەنگن لە ڕووی دەسەڵات و هێزدا.

ڕەنگە لەگەڵ ئەم ژن و ژن خوازیەش هەردوو مەملەکەت سنووری نێوان خۆیان لە سوریا ڕێکخستبێت، ئەم سنوورەش لە ساڵەکانی داهاتوودا بە جێگیری مایەوە. سنووری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میسر ناوچە کەناراوییەکانی زیاتر دەگرتەوە وەك لەناوچەکانی بەشی ناوەوەدا، بەمەش شاری (ئۆغاریت) دەگرێتەوە، کە لەڕووی بازرگانییەوە گرنگی زۆری هەبوو. هەروەها

لە دۆڵی عاسی سنووری میسر دەگەیشتە ناوچە دەشتاییەکانی شاری (حمص). بەڵام شـارەکانی تونیب و قەتنا هـەر لەناوچـەکانی ژێردەسـەڵاتی میتانییـەکان مابوونـەوە. بـەڵام دەسـەڵاتی میسرییەکان تاکو قادش و وڵاتی نامورو درێژبیوەوە.

لەکاتی بەدەرکەوتنی دەسەڵات و ترسـی حیـسییەکان ئـەوا میتانییـەکان و میـسرییەکان پەیماننامەی ئاشتیان لەگەڵ یەکتری مۆردەکرد. قۆناغە مێژووییەکانی حیسییەکان لـە مـاوەی پێش سەردەمی مەملەکەتی گەورەی حیسی نوێ (عصر المملكة الحيثية العظمى) تـاکو ئێـستا بۆمان ڕوون و ئاشـکرانییە. تەنانـەت مێـژووی ئـەو ڕووداوانـەی کـە دەربـارەی حیـسییەکان بەدەستمان گەیشتوونە شتێکی وا بەدەسـت نـادەن. ئەمـەش وەك مێـژووی میتانییـەکان لـە سەرەتا ناڕوونییەکی تەواوی پێوە دیاربوو، هەر بۆیەش ناتوانین بڵێین کە حیسییەکان لە بیـست ساڵی یەکەمی سەدەی (١٤پ.ز) ترسێکی گەورەیان دروستکردبێت لە سەر دەسەڵاتی هـەردوو مەملەکەتی میتانی و میسرییەکان. بەڵام دەتوانین بڵێین کـە هەوڵـدان بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر بارودۆخی ناوەخۆ لە هەردوو مەملەکەتەکەدا کارێکی زۆرگران و زەحمەت بووە. بە جۆرێك کـە یارمەتی دەرنەبوو بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتی سەربازی بەشـێوەیەکی فـراوان لـە لایـەن هـەردوو مەملەکەتی میتانی و میسری بۆ مەبەستی فراوانکردنی سـنووری مەملەکەتەکەیان. هـەروەك تێبینی دەکەین کە هەردوو مەملەکەت (میتانی، میسری) دوو نـەوە دوای ئەمـە تێکـچوونی باری ناوەخۆی و باری سەربازی بـەخۆوە دیـوە. ئەمـەش کارێکـە نـاتوانین بیگەڕێنینـەوە بـۆ سەرهەڵدانی لە ناکاوی دوژمنەکی دەرەکی.

شـوتارنای دووەم و کـوڕی ئەرتـەتاما لەدەوروبـەری (١٣٨٠پ.ز) هاتـە سـەر عەرشـی دەسەڵاتی مەملەکەتی میتانی. ئەمەشیان هەستا بەناردنی یـەکێك لـە کـچەکانی کـە نـاوی (کیلو- خیپـات) بـوو بـۆ فرعـەونی میـسری(ئـەمینۆفیس سـێیەم(١٣٩٠ ـــ ١٣٥٢پ.ز). ئەمەشیان لە دەیەمین ساڵی فەرمان ڕەوایی کردنی فرعەون ئەمینوفسی سێهەم بـوو واتـە لـە ساڵی ١٣٨١- ١٣٨٠ پ.ز دابوو.

لەم ماوەیـەدا پەیوەنـدی نێـوان میتـانی و میـسرییەکان زۆر بـاش بـووە. بـاش بـوونی ئـەم پەیوەندییەش دەردەکەوێت لە ئەنجامی ناردنی پەیکەری خوداوەند عەشتار(کە لەلای خوریەکان بـە شاوشکا ناوی دەرکردبوو کە مەڵبەندی پەرستنی لە شاری نەینەوا بووە) لەلایەن مەلیك شـوتارنای دووەم بۆ لای فرعەونی میسری بۆ مەبەستی چاکبوونەوەی لە نەخۆشییەکەی. چونکە ئەم خوداوەندە ناوبانگی دەرکربوو بەوەی کە توانایەکی چاکی هەیە لە چاك کردنەوەی مرۆڤ لە نەخۆشی. مـەلیك

شوتارنا توانی وڵاتی ئیشووای چیایی کـە دەکەوێتـە ناوچـەکانی سـەرووی ڕووبـاری فـورات لـە حیسییەکان وەربگرێتەوە دوای ئەوەی کەماوەیەکی زۆر لە ژێر دەستەڵاتی حیسییەکاندا بوو.

دوای مردنی شوتارنای دووەم مەملەکەتی میتانی تووشی شڵەژاویەك و شـێواندنێك هـات ئەمەش بەهۆی ناکۆکی و ململانێی ناوەخۆییەکان لە سەر تەختی دەسەڵات. لەگەڵ ئەوەی کـە درێژەی ڕووداوەکان ناڕوونە و نازانرێت و لەلایەن چـەندەها توێـژەرو زانـا بـە چـەندین شـێوەی جیاواز شیکراوەتەوە و دەربڕاوە. بەڵام دەتوانین بڵێین ئەم بۆچوونەی خوارەوە تاڕادەیەك نزیکە لە ڕاستیدا، ئەویش بەم جۆرەیە :

کەسێك بەناوی ئوتخی کە سەر بەبنەماڵەی مەلەکی نەبوو هەستا بەکوشتنی (ئەرتا شـومارا)ی کوڕی مەلیك شوتارنا کە میراتگری عەرشی دەسەلاتی مەملەکەتی میتـانی بـوو. ئـوتخی هەسـتا بەدانانی تووشراتا کە ئەمەشیان کوڕی دووەمی مەلیك شوتارنا بوو، کە تەمەنی زۆر بچووك بـوو، کردی بە مەلیك لەسەر مەملەکەتی میتانی بۆ ئەوەی وەك یاریـەك وابێت لەدەستی خۆیدا.

پەیوەندی دیبلۆماسی میتانییەکان لەگەڵ میسردا وەستا. بەڵام دوای ئەوەی توشراتا توانی نوتخی بکوژێت و تۆڵەی براکەی خۆی (ئەرتا شومارا) بسەنێتەوە. پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانی نێوان مەملەکەتی میتانی و میسری سەری هەڵدایـەوە. بـە کوشـتنی ئـوتخی توشـراتا تـوانی جارێکی تر دەسەڵاتی شەرعی و دەستووری بۆ مەملەکەتی میتانی بگەڕێنێتەوە. ئاشکرایە کە ئەوانەی لەگـەڵ ئـوتخی وەسـتان لـەدژی ئەرتاشـومارای غـەدرلێکراو بـەرازی بـوونی هـەموو هێزەکانی وڵاتی میتانی نەبوو. هەربۆیـەش دوای دە سـاڵ مـەلیکێکی خـووری دەردەکـەوێت بەناوی (ئەرتاتامای دووەم) کە خۆی بە ئەندامێك لە بنەماڵەی دەسەڵاتدار دادەنێـت و گرتنـە دەستی عەرشی دەسەڵات بە مافی خۆی دەزانێت.

مـەلیك ئـەرتاتامای دووەم هاوپەیمانییـەکی لەگـەڵ حیـسییەکان بەسـتا. دوای ئـەوەی حیسییەکان توانیان جـارێکی تـر دەسـتبکەن بـە ئەنجامـدانی هەڵمەتـە سـەربازییەکانیان بـۆ سەروڵاتی سوریا. ئەمەش لە دوای گرتنی وڵاتـی کیزۆفـەتناو، کۆتـایی هێنـان بەسـەربەخۆی وڵاتی ئارزاوا، بڵاوکردنەوە و سـەپاندنی هێمنـی و ئاسـایش لـە بـاکووری ئـەنادۆڵ. هـەروەك مەلیکی حیسییەکان لە یەکێك لە نازناوەکانیدا ئامـاژە دەکـات بـەوەی کـەوا گـەورەی سـەر ناوچەیەکی باکووری ڕۆژهەڵاتی مەملەکەتی میتانی بووە. بەڵام توێژەرەکان دەربـارەی ڕاسـتی ئەم بانگەشەکردنە بیروڕای جیاوازیان هەیە. هەندێك لەم توێژەرانە دەڵێن ئەمە تەنها نازناوێکە حیسییەکان بەکاریان هێناوە شتێکی دوورە لە ڕاستیدا (واتە بە پڕوپاگەندەی لە قەڵەم دەدەن).

هەروەك ناتوانین تەئكید بكەینەوە لەسەر بوونی دەسەڵاتی مەلیك تووشراتا لەسەر ناوچەكانی باكووری وڵاتی ئاشوورو شاری نەینەوا، بەپشت بەستن بەوەی كە بۆ جاری دووەم هەستاوە بەناردنی پەیكەری خوداوەند شاوشكا (عەشتار) ی خوداوەندی نەینەوا بۆ فرعەونی میسری ئەمینۆفیسی سێهەم ئەمەش بەماوەیەكی كەم لە پێش مردنی. پەرستنی ئەم خواوەندە بەسەر ناوچەیەكی فراوان بڵاوببووەوە. بەڵام ڕەنگە مەبەست لەمەدا ناردنی پەیكەری خوداوەند شاووشكا (عەشتار)ی پەرستراو لە پایتەختی مەلیك توشراتتا (واششوكانی) بێت، كە بە شێوەیەكی تەئكید كراو پەیكەی ئەم خوداوەندە لەم پایتەختەدا دەپەرسترا. لە بەرامبەردا حوكمكردنی مەلیك ئەرتاتامای دووەم و كوڕەكەی شوتارنای سێیەم بە شێوەیەكی هاوبەش لەگەڵ ئاشوورییەكان ئاماژەیە بۆ سەرهەڵدانی قەوارەیەكی سیاسی سەربەخۆ لە باكووری ڕۆژهەڵات. كە ڕەنگە مەڵبەندەكەی (پایتەختەكەی) شاری تەئید بووبێت(٦٠).

بەڵگەی مێژوویی زۆرمان لەبەردەست دایە دەربارەی ماوەی فەرمانڕەوای كردنی مەلیك تووشراتا بە جۆرێك كە ئەم بەڵگەنامانە زۆر زیاترە لەوەی دەربارەی مێژووی هەموو مەملەكەتی میتانی لەبەردەست دایە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەڵگەنامانەی تایبەت بە مەلیك تووشراتا كە لە ئەرشیفی مەلەكی میسری لە ناوچەی گردی عەمارنە لە ناوەڕاستی میسر دۆزرایەوە.سەرەڕای ئەو زانیاریانەی تایبەت بە مەلیك تووشراتا هاتووە لە ڕاپۆرتەكەی كە بەشێوەیەكی دوور و درێژ باس لە كارەكانی مەلیكی حیسی مەلیك شوبیلۆلیۆمای یەكەم دەكات. بەڵام ئەوەی كە زۆر زەحمەتە لێرەدا بریتییە لە دووبارە ڕێكخستنەوە و تەرتیب كردنەوەی مێژووی ئەو ڕووداوانەیە كە تیایدا هاتووە. ئەمەش بە شێوەیەكی گشتی بەماددەیەكی سەرەكی دادەنرێت بۆ دووبارە دانانەوەی ڕێچكە مێژوویەكان.

توشراتا لەنامەی یەكەمی بۆ فرعەون تەنها باسی ئەو بارودۆخە ناكات كە لە كاتی هاتنە سەر عەرش و گرتنی دەسەڵات لە وڵاتدا هەبوو، بەڵكو لە پاڵ ئەمەدا ئاماژە بە بەرپەرچ دانەوەی هێرشی حیسییەكان بۆ سەر وڵاتەكەی دەكات. بۆسەلماندنی ئەمەش هەستاوە بەناردنی

---

(٦٠) زانكۆی (بێرن) ی سویسری لە ساڵی ١٩٨٤زاینی كاری هەڵكۆڵینی شوێنەواری ئەنجامدا بە سەركردایەتی ماركۆس فیڤلەر لە ناوچەی گردی ئەحمەدی (تل أحمدي) كە دەكەوێتە دووری ٢٠ كیلۆمەتر لە باشووری شاری قامیشلی لە كوردستانی سووریا. توێژەرەكان واگومان دەبەن كە ئەم ناوچەیە پاشماوەی شاری تەئیدی تێدا دەربكەوێت. كە بەیەكێك لە گرنگترین شارەكانی مەملەكەتی میتانی دادەنرێت.

هەندێك لەم كەل و پەلانەی كە لە شەڕەكەی دژی حیسییەكان دەستی بەسەرداگرتبوو لەگەڵ یێردراوەكانی خۆی بۆلای فیرعەون. ئەم هێرشەی حیسییەكان كە لە دەیەكی شەشەمی سەدەی (١٤پ.ز) بووە لەلایەن مەلیك شۆبیلۆلیۆما ئەنجامدراوە.

لە دیاریكردنی مێژووی ئەم كردە سەربازییە بەشێوەیەكی سەرەكی پشتمان بەو راستییە بەستاوە، كە دەڵێت كردەوە سەربازییەكانی حیسییەكان پێش هاتنی شوبیلۆلیۆمای یەكەم بۆ سەردەسەڵات بەپلەی یەكەم بۆ یەكگرتنەوەی پارچە جیاجیاكانی مەملەكەتەكەیان بوو كە خەریك بوو لەناو دەچوو بەهۆی هێرشە سەربازیەكانی كاشكییەكان[٦١]. كە لە باكووری ئەنادۆڵەوە دەهاتن.

شوبیلۆلیۆمای لە سەر داوای باوكی لە شەڕەكان و هەڵمەتە سەربازییەكان خۆی سەركردایەتی هێزەكانی دەكرد. لەوكاتەی كە باوكی مەلیك بوو شوبیلۆلیوما بەشێوەیەكی كاتی لە شاری شەموخا[٦٢] دادەنیشت، ئەمەش دوای ئەوەی كە كاشكییەكان پایتەختی حیسییەكانیان (خاتتوشا)یان ڕووخاند و كاولیان كرد.

لەلایەكی ترەوە ڕەنگە توشراتا لە باسكردنی سەركەوتنەكەی بەسەرحیسییەكان كەمێك موبالەغەی تیادا كردبێت. كە لە ڕاستیدا ڕەنگە ئەم كێشەیە تەنها ناكۆكییەكی سنووری بێت لەنێوان هەردوو مەملەكەتی میتانی و مەملەكەتی حیسی لەسەر ولاتی (ئیشووا) كە دەكەوێتە سەر سنووری نێوان هەردوو مەملەكەت لە سەرووی ڕووباری فورات. كە هەردوولا هەوڵیاندەدا ئەم شارە بخەنە ژێر ركێفی خۆیانەوە.

ڕوداوێكی تری گرنگ لە سەر سنووری مەملەكەتی حیسییەكان ڕوویدا، كە تیایدا دەردەكەوێت كە مەملەكەتی میتانی سنووری ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی مەملەكەتی

---

(٦١) كاشكییەكان لە كۆنترین هۆزەكانی وولاتی ئەنادۆڵن.كە لە هەزارەی سێهەمی پێش زاین لە ناوچەكانی سەرووی ڕووباری هالیس و باكووری سەرچاوەكانی ڕووباری فورات نیشتەجێ ببوون. تاكەكانی ئەم هۆزە بە بەخێوكردنی ئاژەڵ و مەڕومالات و چاندن و رێك كردنی ڕەزی ترێ و دروستكردنی ئارەق و شارەزاییان لە شەردا ناوبانگیان دەركردبوو. هەروەك دەرهێنانی كانزا بۆ یەكەم جار لەلایەن ئەم هۆزەوە ئەنجامدراوە.حیسیەكان زۆر بەرق وكینەوە سەیری ئەم هۆزەیان كردووە. ئەم هۆزە لەلایەن حیسییەكان بە بەخێوكەری بەراز و چنینی كەتان وەسفكراون.حیسییەكان تارادەیەك بەشێوەیەكی بەردەوام لەگەڵ كاشكییەكان لەجەنگدا بوون. هەندێك لە توێژەرەكان كاشكییەكان بەنەوەی شەركەسەكان دادەنێن.

(٦٢) شوێنەوار و پاشماوەی ئەم شارە ئێستا لە كەرشەهرە لە نزیك مەلاتییە.

حیسییەکانی بەزاندووە. هەروەك زانراوە کە مەملەکەتی کیزۆفەتنا سەر بەمەملەکەتی میتانی بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەی پێش.زایین. لەیەك لە بەڵگەنامە نووسراوەکاندا دەبینین مەلیك ساوشتاتاری میتانی بە ڕۆڵی ناوبژیوان هەڵدەستێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی یاسایی نێوان (نیقمیبا)ی مەلیکی ئالالاخ و (شونوشەڕرا)ی مەلیکی کیزۆفەتنا.

پاشان لە نیوەی یەکەمی سەدەی (١٤پ.ز) مەلیك شونوشەڕرا مەلیکی کیزۆفەتنا لە کۆتی مەملەکەتی میتانی هاتەدەرەوە و چووە پاڵ مەملەکەتی حیسییەکان و پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی لەگەڵ حیسییەکاندا بەست. دەقی ئەم پەیماننامەیەمان بە دەست گەیشتووە. بەڵام ناوی مەلیکی حیسی تێدا تێکچووە بە جۆرێك کەناتوانرێت بخوێنرێتەوە. لە سەرەتادا توێژەرەکان مێژووی ئەم پەیمانامەیان گەڕاندەوە بۆ سەردەمی مورشیلی دووەم یان مووەتەللی، ئەمەش دەمانگەینێتە ئەوەی کە شوبیلۆلیۆمای یەکەم دامەزرێنەری مەملەکەتی حیسی نوێ(مەملەکەتی حیسی گەورە) دوژمنێکی کۆنی مەلیکی کیزۆفەتنا بووە. بەڵام دیاریکردنی ئەم مێژووە بەوجۆرەیە شوێنی گومانە بە پشت بەستن بەبەڵگەی مێژوویی زمانەوانییەکان (بەپێی بیرەباوەڕی هـ. هۆفنرس H. Hoffners کە بەزارەکی ئاگاداری کردمەوە لە شیکاغۆ).

ئەگەر نەتوانین لە چوارچێوەی گشتی مێژوویی ئەوە ڕوون بکەینەوە، ئەوە ناوەڕۆکی پەیماننامەکەی شەنوشەڕرا باس لە هەندێك ڕووداوی مێژوویی ولاتی ئیشووای ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ دەکات. ئەم ڕووداوانەش بەهەمان شێوە بەکورتی ئاماژەی پێکراوە لە تێکستێکی تردا کە مێژووەکەی زانراوە. لێرەدا مەبەستمان لەم تێکستەدا ئەو پەیماننامەیەیە کە شوبیلۆلیۆما لەگەڵ مەلیکی میتانی (شەتتی ــ وازا) بەستوویەتی.

ئەگەر ناوەڕۆکی ئەم دوو پەیماننامەیە بەراورد بکەین(پەیماننامەی شەنوشوڕرا و پەیماننامەی شەتتی ــ وازا) بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ڕووداوانەی ئاماژەمان بۆ کرد(بەپێی پەیماننامەی یەکەم) لەسەردەمی ئەو مەلیکە حیسییەی کە پەیماننامەکەی بەستووە ڕوویداوە. بەڵام (بەپێی پەیماننامەی دووەم) ئەوا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیك شوبیلۆلیۆما، واتە توتخالیای دووەم(یان سێهەم) ڕوویداوە لە دەوروبەری (١٣٨٠پ.ز). بەم جۆرە دەگەینە مێژوویەکی وردترو ڕێکتر سەبارەت بە پەیماننامەکەی شەنوشەڕرا، مەبەستم لێرەدا ماوەی فەرمان ڕەوایی کردنی توتخالیای سێیەمە، کە سەرچاوەکانی تر ئاماژە بە دارمانێکی خراپی دەسەلاتی حیسییەکان دەکەن لە سەردەمی ناوبراودا. هەروەها لە پێشەکی دەقی ئەم پەیماننامەیەدا دەردەکەوێت کەحیسییەکان لەسەر سنووری ڕۆژهەلاتی مەملەکەتەکەیان

هەڵوێستێکی بەرگری کەریان هەبووە لە بەرامبەر خوریەکان. هەرچی وڵاتی کیزوفەتنایە ئەوا تاکو بەستنی ئەم پەیماننامەیە پەیوەندیەکی توند و تۆڵی هەبوو لەگەڵ مەملەکەتی میتانی. تەنانەت توانی دواتر ڕووبەڕووی مەملەکەتی حیسییەکان ببێتەوە و سەربەخۆیەکی تەواو بۆ خۆی بەدەست بهێنێت.

لێرەدا ئاماژە بە پەیماننامەیەکی کۆنتر دەکەین کە تیایدا ئاماژە بە بەستانەوەی کیزوفەتنا بە مەملەکەتی میتانی دەکات. بەڵام بەپێی ئەو پەیماننامە نوێیەی کە دواتر بەستراوە بۆمان دەردەکەوێت کە جێبەجێکردنی ئەو پەیماننامەیەی کە وڵاتی کیزۆفەتنا بە مەملەکەتی میتانی دەبەستێتەوە کۆتایی پێهاتووە. هەربۆیەش ناتوانین زانیاری ڕاست و تەواو بەدەست بهێنین ئەگەر ئەم پەیماننامە کۆنە لەگەڵ پەیماننامەیەکی تری مەلیك شەنوشەڕڕا بەراورد بکەین کەلەلایەن Mayer ساڵی ١٩٥٣ز بڵاوکرانەوە.

بۆیە وەڵامێکی تەواومان نییە سەبارەت بەوپرسیارانەی کە دەکرێن دەربارەی شەنوشەڕڕا. بەجۆرێك کە ئەوە نازانرێت ئەو شەنوشەڕڕایەی کە خاوەنی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانە هەمان ئەو شەنوشەڕڕایەیە کەسەر بەدەسەڵاتی مەلیکی میتانی ساوشتاتار بووە؟. یان ئەوانە دوو کەسی جیاوازن بەڵام هەمان ناویان هەبووە؟. بەڵام ئەگەر یەك بن ئەوا دەبێت ئەم مەلیکە ماوەیەکی درێژ فەرمانڕەوایی کردبێت.

هەمووارکردنی پەیماننامەکەی شەنوشەڕڕا بەم جۆرەی کە پێشنیارمان کرد، مێژووی وڵاتی کیزۆفەتنا ڕوونترو ئاشکراتردەکات. دەقی پەیماننامەکە باسی ئەوە دەکات کە وڵاتی کیزۆفەتنا لە سەردەمی باوەگەورە (باپیری) مەلیکی حیسی بەشێك بووە لە مەملەکەتی حیسی. بەڵام دوای ئەمە وڵاتی کیزۆفەتنا کەوتە ژێردەسەڵاتی خوریەکان (میتانییەکان). ئەم بابە گەورەیەش(باپیر) لە مەلیك توتخالیای یەکەم (یان دووەم) کە توانی شاری حەلەب داگیربکات زیاتر کەسێکی ترنییە. بە تەئکید ئەم مەلیکە توانیبووی کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر کیزۆفەتنا بسەپێنێت. بەڵام هاتنی وڵاتی کیزۆفەتنا بۆ ژێر دەسەڵاتی مەملەکەتی میتانی ئەوا گومانی تێدانییە لەسەردەمی مەلیك ساوشتاتار بووە، ئەم مەلیکە خاوەنی بەهێزترین هەڵمەتە سەربازییەکانی مەملەکەتی میتانی بووە. ئەم مەلیکە توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر وڵاتی کیزۆفەتنادا بسەپێنێت.

بەڵام دوای ئەمە بەماوەیەکی کەم لە کۆتای سەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیکی حیسی توخالیای دووەم، کیزۆفەتنا بەتەواوەتی خرایە سەر مەملەکەتی حیسییەکان.لە تێکستە

نووسراوەکانی دواتر کە باسی لە سەردەمی ئەم مەلیکە دەکەن (توخالیای دووەم) دەردەکەوێت کە کیزۆفەتنا بەشێك بووە لە مەملەکەتی خەتتی (مەملەکەتی حیسییەکان).

سەرچاوەکان ئیشارەت بەوە دەکەن کە مەلیکێکی ناسراو بە توتخالیا هەستاوە بە گواستنەوەی هێماکانی پەرستن کە ناسراون بە(خوداوەندێتی ڕەش- الألوهیةالسوداء)[٦٣] لە کیزۆفەتناوە بۆ شەموخا. ئەم کارەش ڕەنگە لەلای باوکی شوبیلۆلیۆما ئەنجامدرابێت، کە ماوەیەك لە شەموخا جێگیر بوو، ڕەنگە وەك پایتەختێك بۆ مەملەکەتەکەی خۆی هەڵیبژاردبێت.

گواستنەوەی هێماکانی خواپەرستن (وەك ئاماژەمان پێکرد) لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر عادەتەن لە دوای داگیرکردنی شوێنەکەوە ئەنجامدەدرا. ئەم شایەتیەش بەڵگەیەکی ترە لە سەر ئەوەی کە لە سەردەمی مەلیك توتخالیای دووەم(یان سێهەم)وڵاتی کیزۆفەتنا خراوەتە سەر مەملەکەتی حیسییەکان.

لە سەردەمی مەلیك ئەرنوفەنداى یەکەم جێنشینی مەلیك توتخالیای دووەم وڵاتی کیزۆفەتنا لەپاڵ پایتەختی حیسییەکان (خەتتی) بە قەوارەیەکی تایبەت دادەنرێت، بەڵام لە چوارچێوەی سنووری گشتی مەملەکەتەکە. ئەمەش لە پەیماننامەی ئیشمیریکا[٦٤] دەردەکەوێت کە بۆ هەمان سەردەم دەگەڕێتەوە.. (سەیری وێنەی ژمارە ٢ بکە)

لەئەنجامی ئەمەش بەم دواییە تێبینییەکی زۆر گرنگمان بۆ ڕوون بووەوە. کە ئاماژە دەکات بەوەی کە بۆ یەکەم جار لەسەردەمی مەلیك ئەرنۆفەندای یەکەم کاریگەریەکی بە هێزی شارستانییەتی خوریەکان لە خاتوشای پایتەختی مەملەکەتی حیسییەکان سەری هەڵداوە. ئەم شارستانییەتیەش لە ڕێگەی وڵاتی کیزۆفەتناوە گواستراوەتەوە بۆ خاتوشای پایتەختی حیسییەکان. کاریگەری ئەم شارستانییەتەش لە پەیڕەوکردنی جۆرێك لە داب و نەریت و ڕێورەسمی ئایینی خوریەکان لە لایەن حیسییەکانەوە زۆر بەڕوون و ئاشکرایی دەردەکەوێت. بەتەواوەتی نازانرێت کە مەملەکەتی کیزۆفەتنا ماوەیەك دوای ئەمە پێگە ئایینییەکەی خۆی لە دەستداوە، یان هەربەردەوام بووە تیایدا. چەندین ڕێورەسمی ئایینی خووری هەیە کە

---

(٦٣) ئەمەش دەربڕینێکی تایبەتییە کە دەلالەت لە سەرهەندێك خوداوەندی تایبەتی دەکات.کە ڕوخساری خوداوەندی خووری (شاووشکا)ی خوداوەندی خۆشەویستی و شەڕ یان هەڵگرتبوو.

(٦٤) ئەمەش ناوی شوێنێکە کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن (سیوەرەك -Siwerek) کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئورفا.

مێژووەکەی بۆ ئەم سەردەمە دەگەڕێتەوە. ئەم ڕێورەسمەش لەلایەن یەك لە مەلیکەکانی کیزۆفەتنا کەناوی (فەللیبیا)بووە ئەنجامدراوە. بەڵام ئەم ناوە ڕەنگە شێوازێکی تری ناوی فیللیا بێت کە پێشتر دوو مەلیك لە مەلیکەکانی وڵاتی کیزۆفەتنا هەمان ئەو ناوەیان هەبووە. هەروەها ئەمیرەك کەناوی تیلیبینۆ بوو وەك پیاوەکی ئایینی لە شاری کومەنی[٦٥] پایتەختی وڵاتی کیزۆفەتنا دەژیا لە سەردەمی شوبیلۆلیۆمای مەلیکی حیسی. ئەمەش بەڵگەیە لە سەرئەوەی کە مەملەکەتی کیزۆفەتنا پێش ئەمە تەواو پێگەیشتوو بووە.

ئەو ڕووداوانەی کە لە سەر سنووری باکووری ڕۆژئاوای مەملەکەتی میتانی ڕوویدا لە سەرەتادا کاریگەریەکی ئەو تۆی لەسەر مەملەکەتی میتانی نەبوو. هەروەك ئەو نامانەی کەمەلیك توشراتا بۆ هاوپەیمانە میسرییەکەی خۆی ڕەوان کردووە تاکو ئاگاداریان بکاتەوە لە سەرکەوتنەکانی بە سەرحسبیەکان تیشك ناخەنە سەر ئەم لایەنە کە بزانین بارودۆخی مەملەکەتی میتانییەکان بە شێوەیەکی جدی توشی هەڕەشەی لە ناو چوون بۆتەوە یان نا. بەڵکو بەپێچەوانەوە نامەکانی نێوان توشراتا و ئەمینۆفیسی سێهەم بە شێوەیەکی گشتی باس لە پرۆژەیەك دەکات کە هەردوولا حەزیان دەکرد ئەنجامی بدەن، ئەویش پرۆژەی ژن خواستنی فرعەونە لە یەکێك لە کچەکانی توشراتا. دیاردەی ژن و ژن خوازی داب و نەریتێکی بەردەوام بوو لە چواچێوەی سنووری پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو مەملەکەتدا، ئەم دیاردەیەش هەر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کردنی مەلیکی میتانی ئەرتاتامای یەکەم (١٤٠٠پ.ز) سەری هەڵدابوو.

گفتوگۆ لەنێوان هەردوو مەملەکەت بۆ ئەنجامدانی ئەم ژن خواستنە چەند ساڵێکی خایاند، بەشێوەیەکی تایبەتی گفتوگۆکان لەسەر دیاریکردنی بڕی مارەییەکەی بوو. دیاریترین ئەو تێکستە نووسراوانەی کە پەیوەندی بەم لایەنەوە هەبێت ئەو تێکستەیە کە بە(نامەی میتانی) ناسراوە. ئەمەش بە گرنگترین بەڵگەنامەی زمانەوانی دادەنرێت لە لایەنی لێکۆلینەوە خوریەکان(الدراسات الحورية). ئەم تێکستە لە چەندین بڕگەی درێژ پێکدێت. ئەم تێکستەش بە شێوەیەکی ساغ و تەواو بە دەستمان گەیشتووە. بە ماددەیەکی باش لێکۆلینەوەی زمانی خووری دادەنرێت، ئەمەش تاکە نامەیە لە نێوان نامەکانی توشراتا کە بەتەواوەتی بەزمانی خووری نوسرابێت، چونکە نامەکانی تر بە زمانی ئەکەدی یان ئەکەدی و خووری نووسراون. بەڵام هەموو

---

(٦٥) شاری کومەنی ئێستا دەکەوێتە سەرووی ئەو ناوچانەی کە دەکەوێتە نێوان هەدروو ڕووباری سەیحوون و جەیحوون لە باکووری کەنداوی ئەسکەندەرونە.

نامەکان لـە ڕووی بابـەت و شـێوازی نوسـینەوە لـە یـەك دەچـن. ئەمــەش یارمەتیـدەربوو لـە تێگەیشتنی ئەم نامەیە (نامەی میتانی)و پشت پێ بەستنی لە دانانی بناغەی ڕێزمانی خوریدا.

ئەم بەڵگەنامەیە(نامەکە) لەگەڵ شاژنی میتانی تاتوخیبا(تەتتو - خیپپا)[٦٦] ڕەوانـەکراوە لە کاتی سەفەرکردنی بۆ کۆشکی فرعـەون. ئەمـەی خـوارەوەش بەشێکە لـە نامەکـەدا. کـە ئەمەش سوودی هەیە بۆ زانینی چۆنییەتی شێوازی پەیوەندی دیبلۆماسی لەو سەردەمدا[٦٧].

(بۆ نیمۆریا[٦٨]. بۆ مەلیکی میسر.. بۆ برام.. بۆ ئەو زاوایەی کە خۆشم دەوێت.. ئەوەی کە منی خۆش دەوێت. پێت دەڵێم:

توشراتا مەلیکی مەملەکەتی میتانی.. خەزوورت کە تۆی زۆر خۆشدەوێت.. برات... بـەم جۆرە پێت دەڵێم:

حاڵی من باشە، هیوادارم کە حاڵی تۆش بەهەمان شێوە باش بێت. ئەی زاواکەم! هیـوادارم ئەحواڵی خێزانەکانت و کچەکانت و شێخەکانت و ئەسپەکانت و گالیـسکە سـەربازییەکانت و هێزە جەنگییەکانت و وڵاتەکەت و سەروەت و سامانەکەت باش بێت............

براکەم تەمەنای خێزانێکی (ژن)ی بۆ خۆی کردبوو......، ئێستا من پێم دا، وا بـەرەو لای براکەم بەرێکەوت..... ئێستا من ژنێکم بە براکەم دا، وا بەرەو لای براکەم هات.کاتێك دەگات براکەم دەیبینێ....و دەگات، ئەویش(ژنەکە) زۆر دڵ خۆشە بە برام و گونجاوە بۆ ئارەزووەکـانی دڵی برام. براکەم جارێکی تر مارەییەکە وەردەگرێت.....

کـاتێ خێزانـی براکـەم دەگـات و خـۆی بەبراکـەم پێـشاندەدات، ئـەو کاتـە دیارییەکـەم دەردەکەوێت. دەخوازم کە براکەم هەستێت بە کۆکردنەوەی گشت خەڵکی وڵاتەکەی و نوێنەرانی گشت وڵاتەکانی تر، دەخوازم گشت نێردراوەکـانی ئامـادەبن، ئینجـا مارەییەکـەی پێـشکەش بکات بە براکەم. دەخوازم هەموو شـتێك لـە بەرچـاوی براکـەم جێگـەی خۆشـی و شـادمانی بێت.... دەخوازم مارەییەکە جێگەی شادی بێت...، دەخوازم کە خانمیش بە هـەمان شـێوە دڵ خۆش بێت. ئێستا ئەوەتا کچی باوکم، خوشـکی مـن لەوێیـە (میـسر)، ئـەو تێکـستەی کـە

---

(٦٦) شاژن تاتوخیبا هەمان ئەو شاژنەیە کە لە مێژووی کۆنی میسر بە شاژن نەفرتیتی ناسراوە. نەفرتیتیی وشەیەکی میسری کۆنە بەمانای(سەیرکە ئەوە نافرەتە جوانەکە هات).

(٦٧) J.Friedrch :Subaraische Texte. In :Kleinasiatische Spra chdenkmaler,Kleine Texte für Vorlesungen und Ubungen No.163, ed.II Lietzmann,Berlin1932,7-35.

(٦٨) لێرەدا مەبەستی (ئیمنحۆتەبی سێهەمە)ە کە لە نووسراوە یۆنانییەکان بە ئەمینۆفسی سێهەم ناسراوە.

مارەییەکەی تێدا نووسراوە لە وێیە. ئەوەتا کچی باپیرم، خوشکی باوکم ئەویش لە وێیە(میسر)، ئەو تێکستە نووسراوەی کە مارەییەکەی تێدا نوسراوە ئەویش بەهەمان شێوە لەوێیە(میسر). هیوادارم برام داوای تێکستی نووسراوی هەردووکیان بکات، پاشان گوێ لە خوێندنەوەی ناوەڕۆکەکەی هەردوو تێکستەکە بگرێت. هیوادارم داوای تێکستە نوسراوەکەی من بکات، تێکستی نووسراو سەبارەت بەو مارەییەی کە لەلایەن منەوە پێشکەش کراوە، دەخوازم کە بزانێت ئەومارییە زۆر گەورەیە و جوانە و شایستەیە بۆ برام:

دەمەوێت شتێکی تر بە براکەم بڵێم، هیوادارم براکەم گوێی لێبێت.......... ئەو شتانەی کە ئەرتاتامای باپیرم جێبەجێ کردووە بۆ باوکت بریتییە لە..............، منیش زۆر زیاترم کردووە لەوەی کە باپیرم ناردوویەتی، کە ١٠ جار لە هی باپیرم زیاترە.

هیوادارم براکەم دەوڵەمەندم بکات لە بەرچاوی وڵاتەکەم، هیوادارم براکەم دڵم نەشکێنێ، بۆیە...... داوا لە برام دەکەم کە پەیکەرێکی کچەکەم لە زێڕ بۆ بنێرێت. من دەزانم کە براکەم لە قووڵای دڵیەوە منی زۆر زۆر خۆشدەوێت، هەروەها دەزانم کە لە وڵاتی براکەم زێڕێکی زۆر هەیە.....

لە لایەکی ترەوە، هیوادارم براکەم پەیکەرێکی دروستکراو لە عاج (شاخی فیل) پێشکەشم بکات.(هیوادارم ئەمانەم گوێ لێ بێت):" ئەو پەیکەرەی کە لە زێڕ دروستکراوە پەیکەری(تاتۆ- خیپا)یە کچی توشراتا گەورەی میتانییەکان "کە ئەم کچەشی پێشکەش کردووە بە ئەموریا گەورەی میسر. ئەموریا پەیکەرێکی لەزێڕی بۆ دروستکردووە، زۆر بە خۆشەویستییەوە پێشکەشی بە توشراتا کردووە.

لەبەر هەموو ئەمانە ئێمە یەکترمان خۆشدەوێت.......... بە شێوەیەکی زۆر زۆر گەورە، ئاشتی باڵی کێشاوە بەسەر وڵاتی هەردووکمان. هیوادارم هیچ دوژمنەك نەبێت بۆ براکەم، بەڵام ئەگەر دوژمن پەلی هاوێشت بۆ ناو وڵاتی براکەم با ئاگادارم بکاتەوە، تاکو وڵاتی خوریەکان و زرێپوشەکان و چەکەکان.......هتد لەژێر فەرمانی براکەم دابێت بۆ بەرەنگار بوونەوەی دوژمن.

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر دوژمنێکم بۆ سەرهەڵدا..... هیوادارم سەرهەڵنەدات. ئەوا برام ئاگادار دەکەمەوە، تاکو براکەم وڵاتی میسرییەکان و زرێپۆشەکان وچەکەکان.......هتد لە وانەی کە تایبەتن بە برام لە ژێر فەرمانی منی دابنێت.

ئەگەر یەکێك وشەیەکی ناشیرن و نارێك بە برام بڵێت بەناوی من یان بە ناوی وڵاتی من، ئەوا دەخوازم لە برام کە باوەر بەهیچ وشەیەك نەکات ئەگەر لەدەمی مانی و کیلییا(ئەم

دووەش نێردراوی نێوان میسری و میتانی بوونە) دەرنەبرابێت. بەڵام ئەو وشانەی کەمانی و کلیلییا دەربارەی من و وڵاتەکەم دەیڵێت، ئەوە ڕاست و دروستن. هیوادارم براکەم بڕوایان پێ بکات. لەلایەکی ترەوە ئەگەر هەرکەسێك شتێك دەربارەی براکەم یان وڵاتی براکەم بە من بڵێت ئەوا بڕوای پێ ناکەم ئەگەر مانی و کلیلییا بە من نەڵێن. بەڵام ئەوەی مانی و کلیلییا بە منی دەڵێن دەربارەی براکەم یان وڵاتی براکەم ئەوا ڕاست و دروستە گومانی تێدا نییە، منیش باوەڕیان پێ ئەکەم.

ئێستا ئەوەی براکەم داوای کردووە بۆم جێبەجێ کردووە و (١٠) ئەوەندەی جاران زیادم کردووە بۆی و پەرۆشی نەرەنجاندنی دڵی براکەم بوومە بەهەر نرخێك بوویێت و ژنێکم بە براکەم داوە بۆ ئەوەی دڵی خۆشبکات، هەڵستاوم بە ناردنی نوێنەری براکەم (مانی) هەروەك نوێنەرەکانی خۆم (کیلیا) و (ئەرتیششووب) و (ئەسەللی) (کیلیا لە گەورە پیاوەکانە، بەڵام ئەسەللی نوسەری تێکستەکانە..............) بە شێوەیەکی زۆر جوان و نەرم ونیان بۆ براکەم ناردووە هەروەك براکەم دەیان بینێت.

دەخوازم براکەم نوێنەرەکانم رانەگرێت......، دەخوازم براکەم ڕێگەیان پێبدات بە خێرایی بێنەوە.........، چونکە من دەمەوێت لە حاڵی تەندروستی باشی براکەم دڵنیا ببمەوە و زۆر دڵخۆش دەبم بە سەلامەتی براکەم.

ڕەنگە براکەم بڵێت: تۆ خۆت نوێنەری منت ڕاگرتووە، نەخێر رام نەگرتووە......... دەخوازم لە برام کە ڕێگە بەنێردراوەکانی من بدات بەخێرایی بگەڕێنەوە، پێویستە ئێستا دەرچوبن لەلای. هەروەك دەخوازم کە براکەم مانی لەگەڵیان بنێرێت و لەگەڵ نێردراوەکانم بۆلام دەربچێت. هیوادارم براکەم نێردراوێکی تر ڕەوانە نەکات بۆ لام. وە ئەگەر براکەم (مانی) ڕەوانە نەکات، بەڵکو کەسێکی تر ڕەوانەبکات، ئەوا من ئەو کەسەم ناوێت، هیوادارم براکەم بزانێت، بۆیە هیوادارم براکەم (مانی) بنێرێت. من لە دڵەوە زۆر حەز دەکەم و هەوڵدەدەم کە لەگەڵ براکەم باشبم و نەرم و نیانی نێوانمان پەرەپێدەین. هەروەك هیوادارم براکەشم ئەو دڵسۆزییەی بپارێزێت، چونکە من دەمەوێت ئێمە لەگەڵ یەکتری باش بین و لەدڵەوە حەزدەکەم کە ئێمە لە دڵەوە یەکترمان خۆش بوێت.......... هەروەك خوداوەندی (شیرری) و خوداوەندی تۆ ژیان و چارەنووسمان دیاری دەکات، خۆزگە ئەم خواوەندانە دەبوونە نوێنەریان لەلایەن هەردوو خواوەند تیششوب وخوداوەند ئەمانۆ کە گەورەی ئێمەو باوکی ئێمەنە، تاکو پارێزراوبین.......

و یـەکترمان خۆشـبوێت بـە شـێوەیەکی برایانـە. هـەروەك چـۆن مـرۆف خواوەنـدی رۆژی خۆشدەوێت..........، بەم شێوەیە دەمەوێت یەکترمان خۆشبوێت.....).

لێرەدا تێبینی دەکەین کە مەلیك توشراتا زیـاتر لـە جارێـك داوای لـە فرعـەونی میـسر کردووە بۆ ئەوەی زێڕێکی زۆری پێ بدات. ئەمەش پەیوەندی بە سـووربوونی مـەلیك توشـراتا هەیە لە سەر دروستکردنی مەزارێك (بەخووری: کەرەشك) بۆ باپیری خۆی (مەلیك ئەرتاتامای یەکەم). گرنگیدانی ئەم مەلیکە بە پێشینەی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵ و کۆششانەی کـە ئەنجامی داوە لە پێناو سەلماندنی شەرعیەتی دەسەڵاتەکەی و لابردنی هەموو شـك و گومانـەك دەربارەی شەرعیەتی حوکم کردنی.

ئەمینۆفسی سێهەم مرد دوای چەند ساڵێکی کەم لە هێنانی (تـاتۆ- خیپـا). لـە دوای مردنی ئەمیش ئەمینۆفسی چـوارەم کـە بـە ئـەخناتوون ناسـرابوو هاتـە سـەر دەسـەڵاتی عەرشی میسر.

ئەمینۆفسی چوارەم دەستیکرد بەجێ بەجێکردنی بەرنامەیەکی چاکسازی ئایینی. بەمـەش پەیوەندی دیبلۆماسییەکانی میسر لە سەردەمی ئـەم فیرعەونـە لەگـەڵ مەملەکـەتی میتـانی وەستا، ئەمەش بووە هۆی بەردەوام نەبوونی پەیوەندییە باشەکان و ڕاوەستانی ژن و ژن خـوازی نێوانیان. بەمەش ڕەوانە کردنی زێڕی میسر بـۆ مەملەکـەتی میتانییـەکان وەسـتا، هـەروەك نێردراوەکان و نوێنەرەکانی نێوان هەردوولا گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. بـەم جـۆرەش پەیوەنـدی نێوان هەردوو مەملەکەت بەتەواوی کۆتایی هات و پچرا. ڕەنگە بەکەم زانینی پەیوەندییەکانی نێوان میسرو مەملەکەتی میتانی لەلایـەن ئـەم فرعەونـە لەبەرئـەوە بێـت کـە مەملەکـەتی میتانییەکان لەوکاتەدا بەشێکی یان هەمووی لەلایەن حیـسییەکان گـەمارۆ درابـوو. بەمـەش شوێنگەی خۆی لەدەست دابوو بەوەی وەك یەکێك لە هێزە سـەرەکییەکانی ناوچـەکە(ئاسـیای پێشەوە) لە قەڵەم بدرێت لە پاڵ میسر و بابلدا.

لەم ماوەیەدا لە وڵاتی خەتتی (وڵاتی حیسییەکان) مەلیك شۆبیلۆلیۆما هاتە سەردەسەڵات و جارێکی تر دەستیکرد بـە پێکهێنانـەوەو فراوانکردنـی مەملەکـەتی حیـسی و هێنانـەوەی بەشەکانی بۆ ژێر دەسـەڵاتی خۆی. ئەمەش دوای ئەو کارەساتە بوو کـە لـە ئـەنجامی هەڵمەتـە سەربازییەکانی کاشکییەکان بۆ سەرمەملەکەتەکەی ڕوویدا بوو. بەڵام ڕاستی ئـەم بارودۆخـە و کاتی ئەم ڕووداوانەش تاکو ئێستا نەسەلمێنراوە.

نامەیەکی شۆبیلۆلیۆمای یەکەم بەدەستمان گەیشتووە کەتیایدا پیرۆزبـایی لـە فیرعـەونێك دەکـات بەبۆنەی وەرگـرتنی تـەختی دەسـەڵات. بـەڵام نـازانین کـە ئـەم نـامـەیە بـۆ ئەمینۆفسی چوارەم یـان بـۆ (تـوت ـــ عـەنخ ـــ ئـامون) بـووە. لێـرە دەردەکـەوێت کـە شوبیلۆلیۆمای یەکەم ماوەیەکی زۆر فەرمان ڕەوایی کردووە. بەڵگـەش لەسـەر درێـژی مـاوەی حوکمکردنی شۆبیلۆلیۆمای یەکەم هەواڵێکە لەلایەن نەوەکەی (کوڕی کوڕی) خاتوشیلی سێهەم هاتووە کە تیایدا دەردەکەوێت کە کارە سەربازییەکانی شۆبیلۆلیۆما بۆ مـاوەی ٢٠سـاڵ بۆتـە هۆی سەپاندنی ئاشتی لە وڵاتی ئاسیای بچووك. بـەڵام ڕەنگـە ئـەم هەواڵـە ئامـاژە بێـت بـۆ ڕاپۆرتێکی ناتەواو کە تیایدا باس لە کارەکانی شۆبیلۆلیۆما دەکات، هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد. لەراپۆرتەکەدا باسـێکی تـەواوی گـشت کـارە سـەربازییـەکانی مـەلیك شـۆبیلۆلیۆما دەردەخات لەوکاتەی کە میر بووە واتە پێش ئەوەی ببێتـە مـەلیك[٦٩]. ئـەم ڕاپۆرتـە هـەموو دەسکەوتە سەربازییەکانی شـۆبیلۆلیۆما دەردەخـات لـە مـاوەی ئـەو ٢٠ سـاڵەی کـە لـەناو ڕاپۆرتەکەدا ئاماژەی پێکراوە.

لەنێوان ئەو ڕایانـەی کـە لـەم چـەند سـاڵەی دوایـی پێـشنیارکراوە سـەبارەت بـە دووبـارە ڕیزکردنەوەی زنجیرەی پێشینەی(باوباپیرانی) مەلیك شۆبیلۆلیۆما، بیرۆکەیـەك هەیـە کـە دەڵێـت هێنانەکایـەوەی ئـەو ئاشـتییەی کـە پێـشتر ئاماژەمـان پێکـرد لەسـەر دەسـتی بـرای مـەلیك شۆبیلۆلیۆما کە ناوی مەلیك (ئەرنووەندای یەکـەم)ە بەدەسـتهاتووە. (سـەیری وێنـەی ژمـارە ٢ بکە) ئەرنۆفەندا برا گـەورەی شـۆبیلۆلیۆمایە و پـێش ئـەو حـوکمی کـردووە. ئەمـەش ڕایـەکی گونجاوە، کە تیایدا دەردەکەوێت شوبیلۆلیۆما زۆر زیـرەك نـەبووە لەوکاتـەی کـە هەوڵیـداوە بـۆ تەختی دەسەڵات. هەربۆیەش ناتوانین لێرەدا قەبووڵی ئـەو ڕایـە بکـەین کـەدەڵێت شـۆبیلۆلیۆما هاتۆتە سەر تەختی دەسەڵاتی مەملەکەتی حیسی دوای نەمانی ئەمینۆفسی چوارەم (ئەخناتوون) لە میسر. بەڵکو دەرکەوتنی دەوری ئەم مەلیکە(شۆبیلۆلیۆما) لە بارودۆخی سیاسی و سـەربازیدا لە ناوچەی (ئاسیای پێشەوەدا) لە ماوەی دەیەکی چوارەم و سێهەمی کۆتـایی سـەدەی چـواردەی پێش. زایین (١٣٤٠-١٣٣٠پ.ز). پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کـە ئـەوەی تـاکو ئێـستا

---

(٦٩) شۆبیلۆلیۆما لە سەردەمی باوکیدا میر بووە واتە هێشتا نەبووە بە مەلیك، بەڵام دوای مردنی باوکی بووەتە مەلیك، لەسەردەمی باوکیدا کاتێك کە میر بووە سەرکردایەتی هێزە سەربازییەکانی حیسییەکانی دەکرد و سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێناوە.

نووسراوە دەربارەی چۆنییەتی هاتنی شۆبیلۆلیۆما بۆ سەر تەختی دەسەلأت بۆ پێش ئەم مێژووە دەگەڕێتەوە.

لەوکاتەی توشراتا هاتە سەر تەختی دەسەلأتی مەملەکەتی میتانی، ناکۆکی و دوبەرەکی سەریهەلدا لەسەر میراتگری تەختی دەسەلأت. مەلیك شۆبیلۆلیۆما ئەو هەلەی هەلقۆستەوە و هەلستا بەئەنجامدانی هاوپەیمانییەك لەگەل ئەرتاتامای دووەم کە ئەویش خۆی بە میرات گری دەسەلأت دادەنا. ئەرتاتامای دووەم لە ناوەڕاستی سەدەی چواردەی پێش زاین توانی ئاشوورییەکانیش بێنێتە پال خۆی و یارمەتیان لێوەربگرێت. بەم جۆرەش ئەرتاتامای دووەم سەربەخۆی خۆی لەدژی توشڕاتا ڕاگەیاند. ئەرتاتامای دووەم خۆی بە هاوشانی (مەلیکی خانی کەلبات مەبەست لێرەدا مەلیك تووشڕاتایە) لە قەلەم داوە. ئاشوور ئۆبالت کە حاکمی ولأتی ئاشوور بوو بەم ناوە ناوی ئەرتاتامای دووەمی بردووە لەیەکێك لەو نامانەی کە بۆ فیرعەونی میسری ڕەوانەکردووە. ئاشوور ئۆبالت خۆشی پێش ئەمە سەربە توشراتا بووە بۆیە دواتر دژی وەستاوەو چۆتە پال ئەرتاتامای دووەم.

ئەمینۆفسی چوارەم (ئەخناتون) ڕەزامەندی خۆی لەسەر سەربەخۆی ئاشوورییەکان ڕاگەیاند. هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ نەمانی پەیوەندیە دیبلۆماسییەکانی میسر لەسەردەمی ئەمنۆفسی چوارەم (ئەخناتون) لەگەل مەملەکەتی میتانی لەسەردەمی توشراتا. لەلایەکی تر مەلیکی بابل بارودۆخی دارماوی مەملەکەتی میتانی بەهەلزانی بۆ داواکردنی هەرێمەکانی ڕۆژهەلأت (ئاشوور، ئاراپخا). بۆ ئەم مەبەستەش بابلیەکان لە دەوروبەری ١٣٤٠پ.ز هەلمەتێکی سەربازی کاولکەریان بۆ سەرو ولأتی ئاراپخا ئەنجامدا. ئەم هەلمەتە سەربازییە سەرەتا بە شەڕێك لە نزیك شاری(لوبدی) سەر سنووری نێوانیان دەستیپێکرد پاشان درێژەی کێشا تاکو گەیشتە رووباری زابی خواروو. ئاشوورییەکان ئەم بارودۆخەیان بەهەلزانی و ناوچە میتانییەکانی باکووری ولأتەکەیان داگیرکرد. بەمەش ئاشوورییەکان توانیان بە یەکگرتن لەگەل ولأتی ئەلشی (ئەم ولأتە دەکەوێتە باکووری مەملەکەتی میتانی) بەرەیەك لە باکووری ڕۆژهەلأت پێکبهێنن دژی مەملەکەتی توشراتا. ئەم بەرەیەش لە ڕێگەی ئەرتاتاماوە پەیوەندی لەگەل شوبیلۆلیۆما هەبووە. مەلیکی حیسی شۆبیلۆلیۆما لە بەرەی ڕۆژئاواوە هێرشی بۆ سەر مەملەکەتی میتانی ئەنجامداو توانی ناوچە میتانییەکان لە بەرەی ڕۆژئاوا داگیربکات. ئەم پالە پەستۆیە و هێرشە سێ قۆلییەی کە لەسێ بەرەوە بۆ سەر مەملەکەتی میتانی ئەنجامدرا بووە هۆی ئەوەی بەخێرایی مەملەکەتی میتانی لەناو بچێت.

شۆبیلۆلیۆما توانی بەخۆی و هێزەکەی لە ڕووباری فورات بپەڕێتەوە. بەمەش توانی وڵاتی ئیششوا داگیر بکات و بگاتە سنوورەکانی وڵاتی ئەلشی. مەلیکی وڵاتی ئەلشی(ئەنتەر- ئەتلی) دوایین شاری وڵاتەکەی کە شاری کوتمەر بوو بە دەستەوەدا و لەلایەن شۆبیلۆلیۆما داگیرکرا. دوای ئەمەش شۆبیلۆلیۆما بۆ لای باشوور بەرەو مەڵبەندی مەملەکەتی میتانی بەرێکەوت.

توشراتا لە ڕووبەڕووبوونەوەی شۆبیلۆلیۆما لەشەڕێکی یەك لاکەرەوەدا خۆی پاراست، هەربۆیەش شۆبیلۆلیۆما بەرەو لای ڕۆژئاوا بەرێکەوت و لە ڕووباری فورات پەڕیەوەو پاشان لە یەك هەڵمەتی سەربازی توانی هەموو ناوچە میتانییەکانی نێوان پێچەکەی ڕووباری فورات و دەریای سپی ناوەڕاست داگیربکات. لەنێوانیاندا شاری (کەرکەمیش)ی داگیرکرد. شۆبیلۆلیۆما دەسەڵاتی خۆی بەسەر حاکمە ناوەخۆییەکانی ئەو ناوچانەی کە داگیری کردبوون سەپاند، بە جۆرێك کە پاشکۆیەتی(تبعیە) ئەو بکەن. مەلیکی قادش (ئەم مەلیکەش تەنها بەناو سەر بە دەسەڵاتی میسر بوو)دژایەتی مەلیك شۆبیلۆلیۆمای دەکرد. ئەمە وای کرد کە مەلیك شۆبیلۆلیۆما هەڵمەتێکی سەربازی دژی مەلیکی قادش ئەنجامبدات و بەسەریدا سەرکەوێت. شۆبیلۆلیۆما لەم هەڵمەتەی خۆی بەردەوام بوو تاکو گەیشتە وڵاتی لوبنانی ئێستا و داگیریکرد. لەبەر ئەم هێزە زۆرەی شوبیلۆلیۆما و لەلایەك و بێ دەنگی هاوپەیمانی میسری لەلایەکی تر، ئەوا مەلیکی وڵاتی ئامورو ناچاربوو دان بەدەسەڵاتی شوبیلۆلیۆما دابنێ.

ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی گۆڕانێکی ئاشکرا بەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی مەملەکەتی میسر. ئەم گۆڕانکارییەش بووە هۆی دروست بوونی ناکۆکیەکی درێژخایەن لەنێوان میسرییەکان و حیسییەکان. بەڵام دوای یەك سەدە لە شەڕو ناکۆکی نێوانیان پەیماننامەیەکی ئاشتی بەسترا لەنێوان فرعەون ڕەمسیسی دووەم و مەلیك خاتوشیلی سێهەم. توشڕاتا سووربوو لە سەر ئازاد کردنی ناوچەکانی نوخەششی[٧٠] بە شێوەیەکی سەربازی. توشراتا لە سەرەتای هەڵمەتە سەربازییەکەیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و هێزەکانی گەیشتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میسرییەکان. بەڵام ئەمە ماوەیەکی زۆری نەخایاند، چونکە هێزی حیسییەکان بەرپەرچیان دایەوە و تێکیان شکاند.

---

(٧٠) نوخەششی ناوی کۆنی ئەو ناوچە دەشتاییانەیە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری (عاصی) و باشووری شاری حەلەب.

شــوبیلۆلیۆما بەشــێوەیەکی یــەکجارەکی بــەڕێوەبردنی ســووریا (بــە کوردســتانی سووریاوەش)دایــە دەســت یــەك لــە ســەرکردەکانی بــەناوی (لویــەککی) و کوڕەکــەی بــەناوی (تیلیبینۆ) کە نازناوی (پیاوی ئایینی) (کاهن) هەڵگرتبوو. تیلیبینۆ کاهنی (پیــاوی ئــایینی) خوداوەندی کەش(الــە الطقس)بــوو لــە شــاری کومــەنی پایتــەختی وڵاتــی کیزۆفــەتنا. بــەڵام ئەنجامدانی هێرشێکی سەربازی هاوبەشی خووری و میــسری دژی حیــسییەکان شــۆبیلۆلیۆمای ناچارکرد جارێکی تر خۆی بێتــەوە مەیــدانی جــەنگ لــە ســوریا. واپێدەچــێت لــەم قۆناغــەی بەربەرەکانێــدا مەملەکــەتی میتانییــەکان هــەرمابێت و توانــای بــەرگری کردنیــی لــە خــۆی هەبووبێت، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کــە مــەلیك توشــراتا هــەر زینــدوو بــووە و دەســەڵاتی بەتەواوەتی کۆتایی نەهاتووە.

شۆبیلۆلیۆما دەستیکرد بــەدانانی ئابلۆقــە لــە ســەر شــاری کەرکــەمیش، لەوکاتــەی کــە لویەککی (سەرکردەی هێزەکانی شۆبیلۆلیۆما لە سووریا) چوو بــۆ بــەر پــەرچ دانــەوەی هێــزی میسرییەکان کە دەیانویست جارێکی تر قادش بخەنــەوە ژێردەســەڵاتی مەملەکــەتی میــسری. چیرۆکێکی بەناوبانگ هەیە کە مێژووەکەی بــۆ ئــەم قۆناغــە دەگەڕێتــەوە. ئــەم چــیرۆکە لــەم ڕاپۆرتــەدا هــاتووە کــەباس لــە دەســکەوت و کارەکــانی شــۆبیلۆلیۆما دەکــات. نــاوەڕۆکی چیرۆکەکەش ئەمەیە: ﴿دوای مردنی فرعەونی میسر خێزانی فیرعەون داوای لە مەلیکی حیسی کرد کەیەکێك لە کوڕەکانی خۆی بنێرێتە لای بۆ ئەوەی مێردی پێبکــات و ببێتــە مــەلیك لــە سەر وڵاتی میسر. دوای دڵنیابوونەوەی مەلیك شۆبیلۆلیۆما لە ڕاستی ئــەم هەواڵــە، داواکــەی خێزانی فیرعەونی قبووڵ کردو یەکێك لە کوڕەکانی خــۆی بــۆ میــسر ڕەوانکــرد. بــەڵام مــێری حیسی (کوڕی مەلیکی حیسی) لە ڕێگەی چوونی بۆ میسر کوژرا﴾.

بەداخەوە نازانین ئەم بێوە ژنە(خێزانــی فرعــەونی مــردوو) کێیــە کــە بــەم شــێوە نامۆیــە هەوڵیداوە لە ڕێنماییەکانی میراتگری عەرشی فرعەون دەربچێت. بــەڵام بــەم دواییــە هەنــدێك بەڵگــەی نــوێ دۆزراوەتــەوە کــە تیایــدا دەردەکــەوێت کــە ئــەم ئــافــرەتە خێزانــی فرعــەون ئەمینۆفسی چوارەم (ئەخناتون) (١٣٥٢-١٣٣٦پ.ز) بووە نەك بێوە ژنی توت عــەنخ ئــامون هەروەك پێشتر وادەزانرا.

هێزی حیسییەکان لەم ماوەیەدا توانیان شاری کەرکــەمیش داگیربکــەن، کــە بــە گــرنگترین مەڵبەندی (معقل) سەر ڕووباری فورات دادەنرا. ئەم شارە پێگەیەکی ستراتیجی تایبەتی هــەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم شارە ڕێزو پیرۆزییەکی زۆری هەبوو چونکە مەڵبەندی پەرســتنی خواوەنــد

کوبابا (Kubaba) بووه[٧١]. ئەم خواوەندەش هەر لـە سـەردەمی بنکـە بازرگانییـەکانی وڵاتـی ئاشوور لە ئاسیای بچووك پەرستراوە. هەربۆیەش لە کاتی داگیرکردنی شـارەکە هێزەکـانی تـەنها بەشی خوارووی شارەکەیان بەتاڵان برد، بەڵام بەشی سەرووی شارەکە کە پەرستگا ئایینییەکان لـە خۆ دەگرێت توشی تاڵان کاری نەبوون ئەمەش لەبەر پایەو رێزی ئەم خواوەندانە بوو لەلایان.

شۆپیلۆلیۆما کوڕەکەی خۆی (پیەششیلی) هەڵبژارد بۆ حوکمکردنی شاری کەرکەمیش. ئەم کوڕەی بە نازناوێکی خووری کە(شەرری- کوشوخ)ە ناسرابوو لە شـاری کەرکـەمیش. ئەمــەش بەڵگەیە کەداب و نەریتی خوریەکان لـەو کـات لەشـاری کەرکـەمیش زۆر زاڵبـووە. هـەروەك هەموو جێنشینەکانی دوای (شەرری ـــ کوشوخ) نازناوی خوریان هەبووە. بەڵام کوڕەکەی تـری شوپیلۆلیۆما کە ناوی تیلیبینۆ بوو (کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە پیاوی ئـایینی ـ کـاهن ـ بوو) .بەڕێوەبردنی شاری حەلەبی خرایە ئەستۆ. ئەمەش لەبەر ئەوەی شاری حەلەب مەڵبەنـدی ئایینی سەرەکی پەرستنی خواوەندی کەشی خورییەکان (تیششوب) بووە، کـە حیـسییەکانیش هـەر لەکۆنـەوە ئـەم خواوەنـدەیان پەرسـتووە دوای ئـەوەی بەشـێوازێکی محـەللی گۆڕانیـان بەسەرداهێناوە. پێش ئەمەش تیلیبینۆ کاهن بووە لە شاری کومەننی.

دوای ئەوەی توشراتا بەشی ڕۆژئـاوای ڕووبـاری فـوراتی مەملەکـەتی میتـانی لەدەسـتدا. یەکێك لە کوڕەکانی خۆی تیرۆری کرد و کوشتی. هەرچەندە ئەم کوڕەی نـەیتوانی جـارێکی تـر قەوارەیەکی میتانی سەربەخۆ پێکبهێنێتەوە. شوتارنای سێهەم کوڕی ئەرتاتامای دووەم کە ئەو کات لە سەر ژیاندا مابوو (بەڵام لە تەمەنێکی زۆر گەورە دابوو) ئەم هەڵەی قۆستەوە توانی بە یارمەتی هاوپەیمانە ئاشووری و ئیلشیەکان دەسـت بگرێـت بـە سـەر مەملەکـەتی میتـانی و پایتەختەکەی داگیر بکات. لە ئەنجامی ئەوەش زێڕو زیوەکانی کۆشکی مەلەکی گواسترایەوە بۆ ئاشوور. هەروەها ژمارەیەکی زۆری یەکە جەنگییە میتانییەکانی (جەنگاوەرەکانی) تایبەت بە بەکارهێنانی گالیسکەی جەنگی گواسترایەوە بۆ شاری ئەلشی، مەلیکی میتـانیش لـە شـاری تەئید بەند کرا، هەرچەندە ئەو ڕاپۆرتەی کە ئەم زانیارییەمان لێوەرگرتـووە، وا پیـشان دەدات کە مەلیك شوتارنا وەك تۆڵە سەندنەوەیەك ئەم کارەی کردووە وهـەر خـۆی هێـزی جولێنـەری ڕووداوەکان بوو لە ناوچەکە. بـەڵام لـە ڕاسـتیدا شـوتارنا بێجگـە لـە ئـامرازێك لـە دەسـتی هاوپەیمانەکانییەوە زیاتر هیچی تر نەبووە ئەمەش بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەردەکەوێت لە

---

(٧١) ئەمەش بریتییە لە خوداوەندی دایك.ئەم خوداوەندە پەرستگایەکی هەبوو لە شاری کەرکەمیش.

کاردانەوەی حیسییەکان لە دوای تەواوبوونی مەلیك شۆبیلۆلیۆما لە لەناوبردنی بزوتنەوەیەکی هەڵگەڕاوە (متمرد) کە لەباکووری ئەنادۆل سەریان هەڵدابوو. بڵاوبوونەوەی ئاشوورییەکان و هاتنیان تاکو پێچی رووباری فورات مەلیکی حیسییەکانی زۆر نارەحەت کردبوو، بۆیە هیچ دوو دڵی نەکرد لە هەڵقۆستنەوەی یەکەم هەلی گونجاو بۆ گۆڕانی هەڵوێستی پێشووی لە هاوپەیمانییەتەکەی لەگەڵ ئاشوورییەکان دژی میتانییەکان. گۆڕانی هەڵوێستی مەلیکی حیسییەکان بە مەبەستی دەرهێنانی وڵاتی میتانی لەژێر دەسەڵاتی ئاشوورییەکان و خستنە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە بووە. بەدەرکەوتنی شەتتی وازا (کە ئەمەش کوڕێکی تری توشراتایە) لە سەر ساحەی سیاسی هەلی گونجاو بۆ شۆبیلۆلیۆمای مەلیکی حیسییەکان رەخسا. (شەتی ــ وازا) لە هەوڵێکی تیرۆرکردن لەلایەن ئەکیت – تیشوب (هەر ئەمەش بوو کە توشراتای تیرۆرکرد) رزگاری بوو. پاشان بە سەرکردایەتی یەکەیەکی گالیسکەی جەنگی ژمارەکەم رای کرد لە کاتی رووخانی مەملەکەتی میتانی. دوای ئەوەی کە مەلیکی بابل رازی نەبوو وەك پەناهەندەیەك (شەتتی ــ وازا) وەربگرێت، ئەوا ناچار بوو بچێتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حیسییەکان و لەسەر کەنارەکانی رووباری هاکیس چاوی بە شۆبیلۆلیۆما کەوت و داوای یارمەتی لێکرد. شۆبیلۆلیۆما بۆ مەبەستی ئەنجامدانی پیلانی خۆی ئەم هەلەی هەڵقۆستەوە، ئەویش دۆزینەوەی نوێنەرێك بوو بۆ فەرمانڕەوایی کردنی وڵاتی میتانی کە سەربەخۆی بێت و دژی شوتارنای سێهەم بێت کە هەڵبژێردراوی ئاشوورییەکان بوو بۆ ئەم پۆستە. شۆبیلۆلیۆما پەیوەندی خۆی لەگەڵ (شەتتی ــ وازا) بەهێزو توند کرد ئەویش بە پێدانی یەکێك لە کچەکانی خۆی. هەروەك شۆبیلۆلیۆما فەرمانی بە کوڕەکەی خۆی (شەرری- کوشوخ) کرد، کە ئەو کات حاکمی کەرکەمیش بوو کە پاڵپشتی سەربازی (شەتی ــ وازا) بکات. بەم جۆرە (شەتی ــ وازا) توانی جارێکی تر شارە گرنگەکانی مەملەکەتی میتانی داگیر بکاتەوە. پاشان پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی بەسترا لەنێوان مەلیکی میتانی (شەتتی ــ وازا) و مەلیکی حیسی (شۆبیلۆلیۆما) کە تیایدا ئاماژە بەدوا گۆڕانکارییەکانی ناوچەکە کراوە، هەروەك میتانی بە مەملەکەتێك دەست نیشاندەکات کە مەلیکەکەی (شەتی ــ وازا) بووە، بەڵام لەژێر چاودێری مەلیکی حیسی دابووە.

نازانرێت کە فراوانی مەملەکەتی میتانی نوێ لە لای رۆژهەڵاتی گەیشتە کوێ. بەڵام بێ گومان فراوانییەکەی زۆر کەمتر بووە بە بەراورد کردن لەگەڵ سنووری جارانی پێشوو. لە پەراوێزی سەر ئەم پەیماننامەیە کە بەدەستمان گەیشتووە بۆمان دەردەکەوێت کە شەتی ــ وازا

خۆی ناوی مەلەکی خۆی هەڵبژاردووە (شەتی ـ وازا) کە ئەم ناوەش ناوێکی (هیندۆ ئاری) یە بەڵام ناوی ڕاستەقینەی خۆی(کیلی تیشوب)ە کە ئەمەش ناوێکی خورییە.

ئەوەی زۆر سەرنج ڕاکێشە لەو پەیماننامەیەدا دان نانە بە مافی ئەرتاتاما لەحوکمکردندا، هەروەك چۆن مافی شتی وازای لە میراتگری تەختی دەسەڵاتی دیاریکردووە. ئێمە دەتوانین نهێنی ئەمە ڕوون بکەینەوە بەوەی کە شۆبیلۆلیۆما نەیویستووە پەیماننامەکانی پێشووی لەگەڵ ئەرتاتاما بەشێوەیەکی ڕەسمی بشکێنێت، تاکو خۆی نەخاتە هەڵوێستێکی پێچەوانەی بڕیاری خوداوەندەکان. هەر بۆیەش لە پەیماننامەکە بەردنگاری ئەرتاتاما نەبۆوە بەڵکو ئیشارەتی پێکردووە بە نازناوێکی گشتی کە ئاماژە بە سەرۆکایەتی ئەرتاتاما دەکات بەسەر گشت وڵاتەکانی خوریەکان کە وڵاتی میتانی یەکێك لە گرنگترین بەشەکانی ئەم وڵاتەی پێکدەهێنا. بەم جۆرە ڕێی تێدەچێت کە شەتی ـ وازا لە جێی شوتەرنای سێهەم کوڕی ئەرتاتاما ببێتە مەلیك لە سەر وڵاتی میتانی.لە هەمان کاتیش ڕێزی لە شەرعیەتی دەسەڵاتی ئەرتاتاما گرتووە، هەرچەندە ئەمەش تەنها لە بەرهۆکاری پێشوو بووە نەویش نەشکانی بڕیاری خوداوەندەکانە.

ئەگەربێت و ئەم شیکردنەوەیە ڕاست بێت ئەوا مەسەلەی میراتگرتنی دەسەڵات چەندین ناوچەی تریشی دەگرتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی شەتتی وازا و مەلیکی حیسی کە پاڵپشتی شەتتی وازای دەکرد دانەبووە. لە گرنگترین ئەو ناوچانەش ناوچەکانی باکووری وڵاتی دوو ڕووبارە(کوردستانی عێراق). ئەم جۆرە ڕایانەش لەڕاستیدا بەشێوەیەکی تەواو جیاوازە لەگەڵ بارودۆخی ناوچەکان و ئەو هێزە سیاسییانەی کە لەو کاتدا هەبوون.

مەملەکەتی خەتتی (مەملەکەتی حیسییەکان) تووشی پارچە پارچە بوونێکی خراپ هات. چونکە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو پەتایەکی خراپی تێدا بڵاوببۆوە، ئەمە سەرەڕای سەرهەڵدانی چەندین بزووتنەوەی هەڵگەڕاوە لە ئەنادۆڵ، لە هەمووشیان خراپتر مردنی شۆبیلۆلیۆما و پاشان مردنی جێگرەکەی ئەرنووەندای دووەم بوو. هەر بۆیە ئەمانە هەموویان بوونە ڕێگر لە هێرشێکی کاریگەر بۆ سەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات.

شتێکی تر نازانین دەربارەی شەتتی وازا و چارەنووسی. بەڵام دەتوانین گومانی ئەوە بکەین کەتوانیویەتی یەکگرتنەکی ناوەخۆی لە وڵاتی میتانی بەدەستبهێنێت و تارادەیەك مەملەکەتەکەی یەکبخاتەوە. ئەو پاڵە پەستۆیەی کە لە سەر دەولەتی ئاشووریدا هەبوو لە کۆتایی ماوەی فەرمان ڕەوایی مەلیك ئاشوور ئۆبەلتی یەکەم، بووە هۆی ئەوەی کە مەلیکی

میتانی شەتتی وازا بروای بە خۆی زیاد بێت و لە حیسییەکان جیا بێتەوە چیتر پێویستی بە یارمەتیان نەبێت. بەم جۆرە مەملەکەتی میتانی یاخی بوونی خۆی دژی مەملەکەتی حیسییەکان ڕاگەیاند لە سەرەتای ماوەی فەرمانڕەوایی مەلیکی حیسی مورشیلی دووەم لە دەوروبەری (١٣٢٥پ.ز). ئەم مەلیکە (مورشیلی دووەم) لە یەکێك لە دوعاکانیدا دەڵێت (وڵاتی میتانی بۆ جەنگ ئامادەیە، هیچ خوداوەندێکی نییە، سوێندەکانی شکاندووە). ئەم جۆرە وتانەش بێ گومان ئیشارەتێکە بۆ شکاندنی پەیماننامەکەی نێوان شەتی ـــ وازا و مەلیکی حیسی شۆپیلۆلیۆما. ئەم دوعایە دوایین بەڵگەی نووسراوە کە ناوی میتانی تێدا هاتبێت، بە مەرجێك ئەگەر ئەم دوعایە دانەیەکی کۆپی کراو نەبێت لە سەر نووسخەیەکی ئەسڵی کۆن لەگەڵ دەسکاری کردنی شێوازی دەربرینەکەی، بەڵام نوێترین بەڵگە لە سەر ئەم ناوە (میتانی) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی تجلات بلیسەری یەکەم (١١١٤- ١٠٧٦) پ.ز.

ئەو سەرچاوانەی کە لە پایتەختی مەملەکەتی حیسییەکاندا دۆزراوەتەوە زانیاری مێژوویی بەسوود بەدەستەوە نادەن دەربارەی ئەو ڕووداوانەی کە لەو سەردەمدا لە مەملەکەتی میتانیدا ڕوویان دابوو. هەندێك نامە هەیە کە لەنێوان مەلیکە حیسییەکان و مەلیکەکانی مەملەکەتی خانی کەڵبات (لە تێکستە ئەکەدیەکان مەملەکەتی میتانی بە مەملەکەتی خانی کەلبات ناودەبرا) ئاڵوگۆڕکرابوو بەڵام ناتوانین بەشێوەیەکی ورد مێژووی ئەم نامانە دیاریبکەین. هەروەها ئەم نامانە زانیاری تەئکید کراوی تێدا نەهاتووە.

سەرچاوە ئاشوورییەکان کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (١٣پ.ز) زانیاری زۆر بەسوودی تێدا هاتووە. دەوڵەتی ئاشووری لە سەردەمی هەرسێ مەلیکە بەناوبانگەکانیدا ئەوانیش : ئەدەدنیراری یەکەم و(١٢٩٥ -١٢٦٤ پ.ز) شەلمەنسەری یەکەم (١٢٦٣ — ١٢٣٤ پ.ز) و توکلتی نەنورتای یەکەم (١٢٣٣ـ١١٩٧پ.ز). ئامانجی هەرە گەورەی وڵاتی ئاشوور لە مەجالی سیاسەتی دەرەوەدا لە سەردەمی ئەم سێ مەلیکە بریتی بوو لە داگیرکرنی باکووری وڵاتی دوو ڕووبار تا دەگاتە ڕووباری فورات (واتە کوردستانی عێراق و کوردستانی سوریا).

لە یەك لەنەقشەکانی مەلیك (ئەدەدنیرای یەکەم) ناوی ئەو مەلیکە هاتووە کە لەسەرەتای سەدە ی (١٣ پ.ز) فەرمان ڕەوایی مەملەکەتی خانی کەلباتی کردووە. ئەم مەلیکەش ناوی شەتتو ـــ وارای یەکەم بوو. ناوی ئەم مەلیکەش وەك ناوی مەلیکەکانی تری مەملەکەتی میتانی ناوێکی هیندۆئارییە. شەتتو ـــ وارا جێنشینی مەلیك شەتتی ـــ وازا بووە. ئەمەش چونکە جارێکی تر ناوی مەلیك شەتتی وازا بەشێوەیەکی پێچەوانە لەلایەن کوڕی مەلیك

شەتتو ـــ وارا دا هاتووە کە ئەویش وازا ـــ شەتتایە. لە نووسینەکانی مەلیك ئەدەد نیراری دەردەکەوێت کە شاری واششوکانی (دواتر بوو بە نوششوکانی) چەندین جار تووشی داگیرکردن و تالآنکردن هاتووە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەم شارە گرنگیەکەی خۆی لەدەست بدات و شاری تەئید کە زۆر لەشاری واششوکانی دوور نەبوو شوێنەکەی گرتەوە. پێش ئەمەش شاری تەئید مەڵبەندی مەلیك تووشراتای سێهەم بووە کە ئەو مەلیکە هاوپەیمانی ئاشوورییەکان و دووژمنی شەتتی ـــ وازا بوو. بەڵام دواتر حیسییەکانی هاوپەیمانی شەتتی ـــ وازا شاری تەئیدیان داگیرکرد بەمەبەستی زیاتر سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی شەتتی ـــ وازا لەناوچەکە.

لەبەر هەڕەشەی ئاشوورییەکان وازا ـــ شەتتا هەولی بەدەستهێنانی یارمەتی و پاڵپشتی حیسییەکانی دا هەروەك حیسییەکان بەڵێنی یارمەتیدانیان پێدابوو. بەڵام دواتر حیسییەکان پەیمانەکەیان نەگەیاندە جێ. ڕەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ دووبارە سەرهەڵدانەوەی ناکۆکی نێوان حیسییەکان و میسرییەکان کە گەیشتە ئاستێك کە لە شەڕی قادش لە ساڵی (١٢٧٥پ.ز) ڕەنگیدایەوە.

یەکێك لە تێکستە ئاشوورییەکان باس لە دروستکردنی کۆشکێکی نوێ دەکات لەلایەن مەلیك ئەدەد نیرای یەکەم لە شاری تەئید. ئەم کارەش لەدوای داگیرکردنی شاری تەئید لە لایەن مەلیك ئەدەد نیراری یەکەم ئەنجامدراوە. هەروەها لە تێکستەکەی مەلیك ئەدەد نیراری ئەمە هاتووە:{ دوای ئەوەی شەتتو ـــ وارا سووربوو لەسەر دوژمنایەتی کردنم وچەندین کاری دوژمنکاری بەئەنجام گەیاند لە دژی من، بۆیە بەفەرمانی خوداوەند ئاشوور گەوەرە و پاڵپشتی کەرم و خوداوەندە گەورەکانی تر کە وەك ڕێ نیشاندەرم بوون، هەڵستام بە داگیرکردنی شارەکە و پاشان مەلیك (شەتتو ـــ وارا)م هێنا بۆ شاری ئاشوور وام لێکرد کە سوێند بخوات. پاشان ڕێگەم دا تاکو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی لە بەرامبەریشدا بەدرێژایی ژیانی ساڵانە دیاری و باجی دەنارد بۆ وڵاتی ئاشوور. دوای مەلیك شەتتو ـــ وارا کورەکەی وازا ـــ شەتتا هاتە سەر تەختی دەسەڵات و دووبارە یاخی بوونی خۆی ڕاگەیاند و سووربوو لە سەر دوژمنایەتی کردنم و چەندین کاری دوژمانییەتی بە ئەنجام گەیاند. وازا ـــ شەتتا بۆ وڵاتی حیسییەکان چوو بۆ ئەوەی داوای یارمەتیان لێبکات، ئەوانیش دیاری خۆیان لێ وەرگرتن بەڵام یارمەتیان نەدا. بەهۆی چاکی و باشی چەك وتفاقە بەهێزەکانی گەورەی من خوداوەند ئاشوور و بەپاراستنم لە لایەن خوداوەندە بە هێزەکانی وەك : ئانۆ، ئەنلیل، ئەیا، سین، شەمەش، ئەدەد، عەشتار، نەرگال، کە هەموویان خوداوەندی ترسێنەرن، گەورەکانم، هەستام بەداگیرکردنی شاری تەئید کە

گەورەترین شاری مەملەکەتەکەی وازا ـــ شەتتا بـوو , هـەروەك شـارەکانی وەك (ئەمەسـکۆ، کەخەت، شورو، نەبولو، خەررو، شودوخۆ، ئوششوکانۆ) م داگیرکرد. ئینجا سەروەت و سامانی ئەم شارانە و سـەروەت و سـامانی باوبـاپیران و کۆشـکەکانی وازا ـــ شـەتتام بـەتالآن بـرد و هەمووشیانم هێنا بۆ شاری خۆم (شاری ئاشوور). بەڵێ شاری تەئیدم داگیرکرد و کـاولم کـرد و ئاگرم تێبەردا، گژوگیای خراپ و زەرەرمەندم تێـدا تـۆ و کـرد.خوداوەنـدە گـەورەکانم هـەموو ناوچەکانی پێ بەخشیم لەشاری تەئید تاکو شـاری ئەرویـد و لـە ئیلخـەتتۆ و کـشیاری(کێـوی عابدینی ئێستا) تاکو سنووره دوورەکەی هەرێمی شودو، هەرێمی حەرران تـاکو کـەناراوەکانی رووباری فورات.دەستم بەسەر ئەم هەموو ناوچانەدا گرت. کاری گران و زەحمـەتم بـە پاشمـاوەی هێزەکانی مەلیك وازا ـــ شەتتا ئەنجامدا (جۆرەکارێك کە بەهۆی داس و خاکەناس و سـەبەتەی خۆل هەلگرتن ئەنجامدەدرا). بەلآم بەنیسبەت وازا ـــ شەتتا ئەوا من هەستام بەدەستگیرکردنی هەموو ئافرەتەکانی کۆشك و کوڕو کچەکانی مەلیك و هێزەکانی لە شاری تەئیـدەوە بەدەسـت بەستراوی هێناومن بۆ شاری ئاشوور. بەلێ شـاری ئەریـد ولادێکـانی دەوروبـەریم داگیرکـرد و ئاگرم تێبەردان سووتاندمن، کاولم کردن.}

کاریکی هەلەیە ئەگەر ئێمە بەو ڕاپۆرتەی ئەدەد نیراری باوەڕبکەین بەوەی کە توانیویـەتی دەست بگرێت بەسـەر ئـەم ناوچـە دوورانـە و تـالآنی کردبێـت و خـستبێتیە سـەر ناوچـەکانی ژێردەسەلآتی مەملەکەتی ئاشووری. لە کاتێکدا تێپەرین بەهەنـدێك بەشـەکانی ئـەم ناوچـانە کارێکی زۆر زەحمەتە. بەلآم رەنگە ئەدەد نیرای توانیبێتی کە چاودێریەکی تەواو بکات لە سـەر ناوچەکانی رووباری خابوور و لقـەکانی و هەنـدێك بەشـەکانی کێـوی عابـدین. دروسـتکردنی کۆشکێکی نوێش لەشاری تەئید هەر بۆ ئەم مەبەستەش بووە. وازا شەتتا نەکـەوتبووە دەسـت مەلیکی ئاشووری ئەدەد نیراری. بەلکو جارێکی تر توانی دەسەلآت و گەورەیی خۆی بەدەسـت بهێنێتەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی کە سیاسەتی دەرەوەی حیسییەکان تـەرکیزی کردبـووە سـەر بەرپەرچ دانەوی هەلمەتی ئاشوورییەکان بۆ سەر ناوچەکە. ئەمەش دوای بەسـتنی پەیماننامـەی ئاشتی لە نێوان حیسییەکان و میسریەکان.

ناوچـەکانی ڕۆژهـەلآت و سێگۆشـەی رووبـاری خـابوور کـە بەیـەکێك لـە گـرنگترین مەلبەندەکانی شارستانی و ئابووری مەملەکەتی حیسییەکان دادەنرا لـە لایـەن ئاشـوورییەکان داگیرکـرا. ئەمـەش بەناچـاری وای لـە مـەلیکی حیـسییەکان کـرد کـە دان بـە دەسـەلآتی ئاشوورییەکان دابنێت.

شەتتو ـ وارای دووەم جێنشینی وازا ــ شەتتا توانی لە بەردەمی مەلیك شەلمەنسەری یەکەم (١٢٦٣ -١٢٣٤پ.ز) بوەستێت ئەمەش بەهۆی یارمەتی دانی شەتتو ـ وارا لە لایەن هەریەکە لە حیسییەکان و هۆزی ئەخلامۆی ئارامی کە لەو کاتدا گرنگی تایبەتی خۆیان هەبوو.

شەلمەنسەری یەکەم لە یەکێك لە نووسینەکانیدا دەڵێت کە سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر مەلیکی خانی کەلبات بەدەستهێناوە. بەڵام ئەوەی لێرەدا زۆر سەرنج ڕاکێشە ئەو زانیارییانەیە کە دەربارەی هەڵمەتەکەی باسیکردووە کە زۆر جێگەی باوەڕ پێکردن نییە. بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بەناوی ئەو شوێنانە هەیە کە لە نووسینەکانیدا باسیدەکات و دەڵێت داگیرمکردوون. کە تیایدا دەردەکەوێت ئەم نووسینانەی لە سەر نووسراوێکی تری سەردەمی باوکی کۆپی کردووە، هەروەك ئاماژەکردنی چەند جارەی بەو ڕێرەوە سەخت و ناخۆشانەی کە لەسەری پێویست بووە پێیدا بڕوات بۆ گەیشتن بە خانی کەلبات بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە مەڵبەندی سەرەکی وڵاتەکەی لە ناوچەکانی کێوی عابدین یان ناوچەکانی ڕۆژئاوا یان ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوا بووە.

بەڵام توکلتی نەنورتای یەکەم (١٢٣٣-١١٩٧پ.ز) جێنشینی شەلمەنسەری یەکەم دەگێرێتەوە ودەڵێت: ﴿ سۆبارتییەکان ــ ئەمەش شێوازی ئەدەبی ناوی خورییە ــ لەسەردەمی باوکی یاخی بوونە و باجیان نەداوە. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ڕاست نەبوونی ئەو پروپاگەندانەی کە شەلمەنصەری یەکەم رایگەیاندبوو. هەروەك ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەلمەنسەری یەکەم سەرکەوتوو نەبووە لە شەڕەکانی دژی مەملەکەتی خانی کەلبات. توکلتی نەنورتا هەڵستا بە ئەنجامدانی هەڵمەتێکی سەربازی دژی هاوپەیمانییەتێکی خووری کە لە هەریەك لە وڵاتەکانی ئەلشی (ئەلزی) وڵاتی ئەمەدانۆ( ناوچەکانی دەوروبەری دیاربەکر) و وڵاتی بورولومزی و چەندانی تریش پێکهاتبوو. ڕەنگە ناوی دوایی بورولومزی پێکهاتبێت لە وشەی خووری (بورلی) یان (بورول ــ لی)ە ئەمەش بەمانای پەرستگا دێت. ناوی مەلیکی شاری ئەلشی کە لەتێکستەکەدا بە ناوی (ئیتخی ــ تیششوب) هاتووە لە بنەڕەتدا ناوێکی خورییە؟ توکولتی نەنورتا هەوڵێکی زۆری داوە بۆ جێگیرکردنی هێمنی و ئارامی لە ناوچە خوریەکاندا. ئەویش لە ڕێگەی ئەنجامدانی سیاسەتی کۆچ پێکردنی دانیشتوان و گۆڕینی ناسنامەی دانیشتوان لە ناوچەکەدا.

کاریگەری مەلیکە ئاشوورییەکان لەسەر ئەم بارودۆخە نوێیە زۆر لاوازتربوو لە کاریگەری ئەو کۆچ کردنانەی کە بەرەو وڵاتی ئەنادۆڵ هات. لەوانەش کۆچکردنی پاشماوەی دانیشتوانی مەملەکەتی میتانی دوای رووخانی مەملەکەتەکەیان بەشێوەیەکی یەکجارەکی. هەروەك لە سەدەی (١٢پ.ز) مەملەکەتی حیسییەکان رووخاو پایتەختەکەشیان (خاتووشا) نوقمی ئاگر کرا. هەربۆیەش داب ونەریتی حیسییەکان لە هیچ شوێنەك نەمایەوە تەنها لە بەشەکانی باشووری رۆژهەلات نەبێت. ئەمەش پاڵی بەدانیشتوانی کۆنی ناوچەکە نا بۆ ئەوەی جموجۆڵی خۆیان ئەنجامبدەن وەك کشکیەکان و لوڤیەکان. هەروەك لە پاڵ ئەمەش کارەساتێکی سروشتی روویدا کە بووە هۆی نەهێشتنی بەروبوومی ئابووری ناوچەکە. ئەمە لەپاڵ هاتنی هەندێك نەتەوەی نوێی وەك فریجیەکان(٧٢) بۆ ناوچەکە و تیایدا نیشتەجێبوونی.

نازانرێت تاکەی مەملەکەتی خانی کەلبات مایەوە بەلام لە کۆتایی سەدەی (١٣ پ.ز) سەرەتای سەدەی (١٢ پ. ز) هەندێك نووسراو هەیە ئیشارەت بەمەلیکی مەملەکەتی خانی کەلبات دەکات و دەلێت ناوی (ئەتەل- تیششوب)ە. هەروەك لە نووسراوەکانی مەلیکەکانی مەملەکەتی ئاشووری نوێدا باس لە مەملەکەتی خانی کەلبات دەکرێت. بەوەی کە ناوێکە دەلالەت لەسەر ناوچەیەکی زۆر فراوان دەکات کە لە کێوی عابدین درێژدەبێتەوە تا دەگاتە حەرران. کە هۆزە ئارامییەکان لەوکاتدا دەستیان بەسەر ئەم ناوچانەدا گرتبوو چ لەرووی سیاسی و چ لە رووی بلاوبوونەوەی دانیشتوان تیایدا.

کاتێك مەلیکی ئاشووری تەجلات بلیزەر (١١١٤ ـ١٠٧٦پ.ز) دەستیکرد بە ئەنجامدانی هەلمەتە سەربازییەکانی بۆ سەر ئەو ناوچانەی کە دەکەوێتە باکوور و باکووری رۆژهەلاتی مەملەکەتەکەی تووشی بارودۆخێکی گۆڕاوی نوێ هات.کە نەتەوەیەکی بینی کە بە موشکۆ(ئەمانەش لە فریجیەکانن) ناسرابوون کە هەردوو مەملەکەتی خووری ئەلشی و بورولومزی و وڵاتی کەتموخییان داگیرکردبوو.

---

(٧٢) فریجیەکان نەتەوەیێکی هیندۆ جەرمانین، لە سەدەی (١٢ پ.ز) هاتنە ئاسیای بچووك. ئەم نەتەوەیە رۆلێکی گرنگیان هەبوو لە رووخانی مەملەکەتی حیسییەکان، هەروەك کاولکردنی شاری تەروادە لە لایەن ئەم نەتەوەیەوە بووە، فریجییەکان لە سەدەی (٨ پ.ز) ئیمبراتۆریەتێکی گەورەیان پێکهێناوە کە پایتەختەکەی شاری (جۆردیون)بوو. بەلام لە سەدەی دواتر (واتە سەدەی ٧ پ.ز) لە لایەن کیمیرییەکان لەناوبرا، پاشان لیدییەکانی تێدا نیشتەجێ بوو.

لەكاتی باسکردنی تەجلات بلێزەر دەربارەی هەڵمەتە سەربازییەکانی خۆی ئەوا ناوی چەندین دەولەتۆکە دەهێنێت کە لە سەرووی رووباری دیجلە و نزیك بۆتان سو و بەتلیس جای دروستببوون. ناوی هەندێك لەو دەولەتۆکانە بەئاشکرا خورییە وەك : بەبخی (واتە : چیایی)، نووررا خینەش(واتە نولاخی چیایی). هەروەها ئەم دەولەتۆکانە مەلیکەکانیان ناوی خوریان هەبووە وەك : کیلی تیششووب کوڕی کەلی تیششوب، شەددی تیششووب کوڕی خەتتووخ. واپێدەچێت زمانی خووری لەم ناوچانە بەردەوامبێت لە بەکارهێناندا. ئەگەر ئەم جۆرە شیکردنەوە راست بێت کە دەلێت: نازناوی مەلیکی (ئیرۆبی)کە لەم ناوچانە بەکاریان دەهێنا لە بنەڕەتدا لە وشەی (ئیور ـــ ئیفۆ)وەرگیراوە، کە ئەمەی دوایی بەمانای (گەورەم) دێت.دانیشتوانی ناوچەکانی باشووری دەریاچەی وان لەنێوان رووباری دیجلە و زابی خواروو بەردەوام بوونە لە سەر بەکارهێنانی ناوی خووری. ئەم ناوچانەش بەکۆنترین ناوچەی نیشتەجێبوونی خوریەکان دادەنرێت. ئەمەش تاکو کۆتایی هاتنی سەرچاوە نووسراوە ئاشوورییەکان هەر ئاماژەی پێکراوە. بۆیە ناتوانین بەشێوەیەکی تەئکید مێژووی کۆتایی هاتنی زمانی خووری دیاریبکەین.

ئەم ناوچانە دواتر لە رووی مێژووییەوە گرنگییەکەیان کەم بۆتەوە کە تەنها وەك ساحەیەکی جەنگی لێهات لەنێوان هێزی ئاشووری و ئۆرارتییەکان. هەروەك دەزانین کە ئۆرارتییەکان لە رووی زمانەوانییەوە پەیوەندیان بە خوریەکانەوە هەیە. هەروەك زانایان دەلێن کە زمانی خووری و ئۆرارتی لە هەزارەی سێهەمی پێش زایین لە یەکتری جیابوونەتەوە. هەروەك دەزانین کە ئۆرارتییەکان جموجۆلەکانیان لە ناوچە سەرەکییەکانی خۆیان (باکوور و ڕۆژهەلاتی دەریاچەی وان) لە هەردوو سەدەی (٩- ٨ پ.ز) دەستپێکردووە. کە توانیان مەملەکەتێك دابمەزرێنن کە لە ڕۆژئاوا گەیشتە رووباری فورات و لەرۆژهەلاتیش گەیشتە دەریاچەی ئورمیا لە باکووریش گەیشتە ناوچەکانی قەفقاس (ئەمانەش هەموو ناوچەکانی کوردستانی گەورەی ئێستان).

شارستانییەتی ئۆرارتییەکان زۆر کاریگەر بووە بەسەر ئاشووریەکان ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لە رووی بیروباوەڕی ئایینی تەنها لەشتێکی کەم لەگەڵ بیروباوەڕی خوریەکان هاوبەش بێت. هەروەك دەتوانین بڵێین کە پەیوەندی نێوان خوریەکان و ئۆرارتییەکان پەیوەندییەکی زامانەوانییە نەك پەیوەندییەکی مێژووی یان کۆمەلایەتی. هەربۆیەش لێکۆلینەوە لە مێژووی ئۆرارتییەکان و شارستانییەتی ئۆرارتییەکان لە چوارچێوەی ئەم کتێبە دەچێتە دەرەوە

# شارستانییەتی خوورییەکان

## {ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی خوورییەکان}

ئەفسانە و تقوسە ئایینییەکانی خوریەکان ڕەنگدانەوەی ئەو راستییەیان پێوەدیارە کە ڕاوکردن لە سەردەمەکانی پێش مێژوو (پێش داهێنانی نوسین ٣٥٠٠ پ.ز) هۆکاری سەرەکی بووە لە لای خوریەکان بۆ دابین کردنی خۆراك. هەروەك دەبینین کە ناوبانگی کەوانی میتانی (خوریەکان) لە سەدەی (١٤ پ.ز) لە سنووری وڵات دەرچووبوو[٧٣]، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە خوریەکان کارامە نەبوونە لەبواری کشتوکاڵیدا لە سەردەمەکانی پێش دەرکەوتنیان لە سەرچاوە نووسراو و باوەڕپێکراوەکانی مێژوودا. ئەمەش بەشێوەیەکی روونتر دەردەکەوێت لە شارستانییەتە زووەکانی ناوچەی قەفقاس (شوێنی یەکەمی خوریەکان) لە هەزارەی سێهەمی پێش زایین کە بەشەکانی باشوورو ڕۆژهەڵاتی قەفقاس وڵاتی یەکەمی خوریەکان بووە پێش کۆچ کردنیان بۆ وڵاتی هیلال خەسیب (ئەمەش ناوچەیەکی زۆر فراوان دەگرێتەوە وەك چیای تۆرۆس و بەشێکی زاگرۆس و چەندین ناوچەی تری کوردستان و هەندێك بەشی وڵاتانی تری دراوسێی کوردستان دەگرێتەوە کە بەهەموویان شێوەی مانگی یەك شەوە پێکدەهێنن) کە بەشێوەیەکی سەرەکی پشتیان بە کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ بەستبوو.

ئەو کۆمەڵە خوریانەی کە بۆ ناوچەکانی هیلال خەسیب کۆچیان کردبوو (ئەم کۆچ کردنەش لە ئەنجامی گوڕانی بارودۆخی سیاسی و زیادبوونی پاڵەپەستۆی دانیشتوان ڕوویدا) بە شێوەیەکی سەرەکی لەوناوچانە جێگیر بوون کە رێژەی باران بارینی ساڵانەی تێدا دەگاتە زیاتر لە ٢٠٠ ملم. ئەم ناوچانە بەوە جیا دەکرێنەوە کە خاکەکەیان خاکێکی زۆر بەپیتە. هەروەها ئاودێری دەورێکی مام ناوەندی هەبوو لە چاندنی دانەوێلە کە بەیەکێك لە گرنگترین سەرچاوەکانی خۆراك دادەنرا، ئەمەش چونکە ئاودێری بۆ زیادکردنی بەرهەم تەنها یارمەتیدەر بووە و پێویستی سەرەکی نەبووە. هەرچی ئەو مێرگانەیە کە دەکەونە ناوچەکانی فوراتی

---

(٧٣) میتانییەکان لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە سەر خوورییەکان بەڵام میتانییەکان لەدوای خوورییەکانەوە لە ساحەی سیاسی مێژوودا بەدەرکەتوون، واتە دەتوانین بڵێین کە میتانییەکان نەوەی خوورییەکانن.

ناوەڕاست و بەشەکانی خوارووی هەردوو رووباری بلیّخ و خابوور لە دەرەوەی سنووری ناوچەکانی گیرسانەوەی خوریەکان مانەوە (واتە خوریەکان لەم ناوچانە نیشتەجیّ نەبوون)[٧٤].

لە رووی جوگرافیای کشتوکالییەوە ناوچە کشتوکالییەکان بەپێی سروشتی هەڵکەوتنیان هەریەکەیان لەناوچەی دیاریکراوی خۆیدا دەسەڵاتێکی سەربەخۆی هەبووە، ئەم ناوچە کشتوکالیانەش بەهۆی چەند ناوچەیەکی وشك و ناپیت لەیەکتری جیاکرابوونەوە. ئەمەش لەگەڵ چۆنییەتی دابەشبوونی یەکە سیاسییەکانی مەملەکەتە میتانییەکان (خوریەکان) گونجاوە، ناوچەکانیش لە رۆژئاوا بۆ ڕۆژهەلات ئەمانەن:

ناوچەی جوکورفا (بەشی باشووری وڵاتی کیزۆفەتنا).

دەشتی قووڵ (سهل العمق) لە ناوچەی عاسی خواروو (ئاڵالاخ).

- ناوچەی حەلەب (خەلەب).
- ناوچەکانی دەوروبەری هەردوو شاری حەماو حومس لە عاسی سەروو (قەتنا و قادش).
- دەشتی فورات لە باکووری ناوچەی مەسکەنە (ئیمار).
- دەشتە کشتوکالییەکانی باکووری ڕۆژهەلاتی سووریا یان کوردستانی سووریا(میتانی، خانی کلبات).
- وڵاتی ئاشوور (واتە موسل و هەولیر و ناوچەکانی دەوروبەری)و کەرکوك، واتە بەشی هەرە زۆری کوردستانی عێراق کە ئەوکات پێی دەگوترا ناراپخا.

لادێکانی ئەم ناوچانە (بەپێچەوانەی ناوچەکانی باشووری وڵاتی دوو رووبار ـــ میزۆپۆتامیا ـ کە پشتیان بە ئاودێری دەبەست) هیچ پرۆژەیەکی ئاودێری وا گەورەی تێدا ئەنجام نەدراوە (واتە پرۆژە ئاودێرییەکانیان چوارچێوەی ناوەخۆییان تێنەپەراندووە). لەلایەکی ترەوە بەوە لە وڵاتی دوو رووبار جیادەکرێتەوە کە بەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ بلاوببوونەوە. دروستبوونی ئەم کۆمەڵانە لەسەر بنەمای پەیوەندی خزمایەتی بوو. ئەمەش لەئەنجامی بوونی پەیوەندی نێوان خێزان و مولکداریەتی زەوی ڕەنگی داوەتەوە. لەئەنجامی بوونی ئەم جۆرە پەیوەیوەندییە بۆمان روون دەبێتەوە کە زەویەکان وەك سەرمایەیەکی گواستراوە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر مامەڵەی لەگەڵ دەکرا.

---

(٧٤) مەبەستمان لێرەدا سەرەتای هاتنی خوورییەکانە بۆ ناوچەکە، بەلاّم دواتر ئەم ناوچانە گشتی دەکەوێتە ژێر دەسەلاّتی خوورییەکان.

چینی دەسەڵاتدار ئەو چینەبوون کە لەئەنجامی شەڕو داگیرکاریدا سەری هەڵدابوو. ئەم چینە دەسەڵاتی بەسەر بەشێك لە بەرهەمی کشتوکاڵی وڵاتدا گرتبوو. لادێکانیش وەك قەوارەیەك مامەلەی لەگەڵ دەکرا. سەرپەرشتی کردن و بەڕێوەبردنی لادێکان لەلایەن ژمارەیەکی کەمی چینی دەسەلاتدارەکانەوە بوو، ئەمانەش سەر بە بنەماڵە پاشایەتییەکانی مەلیکەکانی دەولەتە خوریەکان بوون.

چینی (مەری ـــ یەننی ـــ نا) ـــ ئەمەش وشەیەکی خوریە بەمانای چینی دەسەڵات دار دێت ـــ ژمارەیان زۆر و پیشەکەشیان کاری سەربازی بووە، ئەمانە بەشێوەیەکی باشتر گرنگیان بەرێکخستنی بەرهەمی زەویە کشتوکالییەکان دا، ئەویش لەرێگەی تەرخانکردنی پارچە زەوییەکان بۆ خۆیان کە لەرێگەی خێزانێکی ژمارە کەم یان زۆر بەرهەم دەهێنرا، زۆر جاریش چەند کۆیلەیەك هاوکاری ئەم خێزانەی دەکرد لەکارەکانیدا. ئەم چینە کاریگەری و دەوری خۆی هەبوو لە پرۆسەی پێشکەوتندا کە بووە هۆی گۆڕانی سیستەمی کشتوکاڵی (النظام الزراعي) بەشێوەیەکی گشتی (بەلایەنی کەم لە ناوچەکانی رۆژهەڵات) کە ئەمەش لە گەشەکردن و بەرزبوونەوەی رێژەی بە موڵك کردنی زەویە کشتوکالییەکان دەردەکەوێت.

بەم جۆرە بەشێکی چینی (مەری ـــ یەننی ـــ نا) بوونە خاوەنی زەوی فراوان لە سەر حیسابی کەسانێك کە هەژاربوون. هەرکەسێك بیویستبایە بچێتە ریزی ئەم چینە لە ناوچەی ئارابخا ئەوا دەبوایە خاوەنی گالیسکەیەکی سەربازی بێت، کەچی لەناوچە خوریەکانی بەشی رۆژئاوا ئەم مەرجە کاری پێنەدەکرا، بەڵکو چوونە ریزی ئەم چینە، ببووە سیفەتێکی کۆمەڵایەتی و میراتگری (واتە ئەگەر باوك لەم چینە بوایە ئەوا کوڕیش لەم چینە دادەنرا).

سەرچاوەکانی لێکۆلینەوی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و سەربازی و دامودەزگا داراییەکان و سیستەمە یاساییەکان لە هەموو ناوچەکان بەشێوەیەکی پچر پچرە و بەتەواوی بەدەستمان نەگەیشتووە، هەمان شتیش بەنیسبەت لایەنی ئابوورییەوە.

هەرچی ئەوەی کە پەیوەندی بە دامودەزگا کارگێڕی و سیستەمە یاساییەکان هەیە ئەوا بە شێوەیەکی سەرەکی پشتمان بەو بەڵگەنامانە بەستووە کە لەبەشەکانی رۆژهەڵاتی شارستانییەتی خوریەکان دۆزراوەتەوە، گرنگترینیان ئەو پارچە شوێنەواریە بچووکانەن (بەتایبەتی ئەو نووسراوانەی کە مۆرکی کارگێڕی و یاسایی هەیە) کە لە وڵاتی ئارابخا دۆزرایەوە لەسەر سنووری رۆژهەڵاتی وڵاتی خوریەکان، لەهەر سێ شارەکانی : نووزی، کوروخەننی، ئارابخا. ئەو بەڵگەنامانەی کە لە چینی چوارەمی شاری ئالالاخ دۆزراونەتەوە (ئەم

شاره سەر بە مەملەکەتی خوریەکان بووە) دەمانپارێزێ لە گشتگیریەکی خێرا لەگەڵ ئەو ئەنجامانەی کە بەدەستهاتووە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەو ماددە شوێنەواریانەی کە لە شاری نووزی دۆزرابوونەوە.

ئەوەی کە گومانی تێدا نییە بارودۆخی ئابووری، لە رووی ژینگە و بەرووبووم و ئاووهەوا و باری گواستنەوەدا بەشێوەیەکی گشتی یەکگرتوو بووە لە ژێر رۆشنایی تایبەتمەندی ئابووری ناوچەکە. هەرچی ئەو راستیانەی کە پەیوەندی بە زمانی هاوبەش و فۆلکلۆری مێژوویی و ئایینی یەکگرتوو هەیە ئەوا دەورێکی کەمی تیایدا هەیە.

ئەم پێشکەشکردنەی خوارەوە پەیوەستە بە بارودۆخی وڵاتی ئارابخا لەنێوان ساڵانی (١٤٥٠ ــ ١٣٥٠ پ.ز). هەندێك دیاردەی دیاریکراوی مەملەکەتی میتانی هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ئەوەی کە لە ئارابخادا هەبوو.لەوانەش :

ــــ فەرمانی کۆشکی پاشایەتی کە وەك ناوەندێك بووە بۆ کاروباری پیشەیی وبازرگانی.

ــــ زۆر گرنگی دان بە مولکداریەتی زەوی و ئەو گۆڕانکارییانەی کە پەیوەندی بە پێکهاتەی چینی دەسەلاتدار (طبقة النخبة او الأعيان) هەیە.

شایانی باسە دیاردەی دووەم گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە، چونکە هۆکاری سەرەکی بووە بۆ رووخان و لەناوچوونی خێرای هەردوو دەولەتی میتانی و ئارابخا دوای ئەوەی کە میتانییەکان (خوریەکان) لەوپەڕی بەهێزی دەسەلاَت دابوون.

لە هەزارەی دووەمی پێش زایین بەتایبەتی سەردەمی برۆنزی کۆتایی (١٦٠٠ ــ ١٢٠٠ پ.ز) ناوچەکانی رۆژهەلاَتی کۆن و ناوچەی ئیجە (دەریاچەی ئیجە) بە سەردەمی ئابووری کۆشکی پاشایەتی ــ مەلەکی ـ وەسفدەکرا. ئەم وەسفکردنەش پاساوی خۆی هەیە، ئەگەر کەمێك لە راڤەکردنی ئەم زاراوەیە دوورکەوینەوە بەوەی کە هەموو جموجۆڵێکی ئابووری بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە کۆشکەوە دەردەچوو. کۆشك چاودێری بەروبوومە کشتوکالییەکانی بەرادەیەکی کەم دەکرد ــ کە لەگرنگترین بەشەکان و فراوانترینیان بوو ــ ئەمەش چونکە وەك نوێنەر یان وەك ناوەندێکی ئابووری وەسفدەکرا. یان بلێین کۆشك بەزۆری کاریگەری لەسەر بەرهەمەکان هەبوو چونکە بە لێپرسراوی حکوومی دانرابوو، ئەمەش لەرێگەی بەرزکردنەوەی باج یان دابەشکردنی زەوی یان دەرکردنی بڕیاری یاسایی. هەرچی مانا راستەخۆکەی زاراوەی (ئابووری کۆشکی مەلەکی) ئەوا دژی ئەمەی پێشوو بووە، کە ئیشارەت بەدەوری تاك رەوی یان قۆرخ کردنی کۆشك دەکات لە بواری بازرگانی دەرەکیدا، هەروەها ئەمە پەرۆشی

دەسەڵاتدارانی کۆشك بۆ کۆکردنەوەی گشت جموجۆڵێکی پیشەکاری بەتایبەتی کانزاکاری بۆ لای خۆی دەردەخات.

نووسراوەکانی نووزی ئاماژە بەوە دەکەن (مەبستمان لە بەکارهێنانی ئەم ناوە کە لەبەشەکانی تری ئەم کتێبە پشتی پێ دەبەستین، ئەو نووسراوە زۆرانەیە کە لە شاری نووزی دۆزراونەتەوە ــ پاشماوەی شاری نووزی لەنزیك شاری کەرکوکی ئێستایە ــ سەرەرای ژمارەیەکی زۆری ئەو نووسراوانەی کە لە هەردوو شاری ئارابخاو کوروخەننی دۆزراوەتەوە) کە ژمارەیەك لە شارەکانی ولاتی ئارابخا کۆشکی تێدا بووە. بەداخەوە زمانی ئەکەدی (بەهۆی جیاوازی چەمکەکان تیایدا) ناو و جۆری نشینگەکان لێك جیا ناکاتەوە، بۆ نموونە لە ئەکەدیدا وشەی (ئالۆ ــ ALU) بەکاردێت وەك ئاماژە کردنێك بۆ لادێ بچووکەکان و شارە گەورەکان لەیەك کاتدا بێ ئەوی کە جیاوازی لە نێوانیاندا بکات. هەربۆیەش ناوی ئەو شوێنانەی کە کۆشکی تیادا بووە دەلالەتە لەسەر شارێکی قەبارە دیاریکراو، تەنها دانیشتوانیشی لە خزمەت کۆشکدا نەبوونە، وەك شارەکانی ئارابخاو نووزی. لەوانەشە ئەم وشەیە تەنها دەلالەت لە خانووەکانی سەر بەکۆشك بکات. هەروەك دەزانین دواتر کۆشکەکان گەشەیان سەندو شوورەدارکران، وەك لە شاری کورڕوخەننی، بەڵام لە شارێکی گەورەی وەك نووزی دەبینین کۆشك بەتەنها نزیکەی نیوەی پێوانەی شوورەی شاری داپۆشیبوو.

زانیاری تەواومان لەبەردەستدانییە دەربارەی پێوانەی ئەو کێڵگانەی کە لەلایەن کۆشکی مەلەکییەوە سەرپەرشتی دەکران و وەبەردەهێنران. تێبینی ئەوە دەکەین لەکاتی باسکردنی کێڵکەگان لەبەڵگەنامە تایبەتییەکاندا ئەوا ناوی خاوەنی کێڵگە دراوسێکانیش دەهێنرا، بەڵگەنامەی خاوەن کێڵگەکان پەیوەندی بە بەڵگەنامەی کۆشك یان شاژن هەبوو. بێگومان مەرج نییە ئەم جۆرە پەیوەندییە ڕەنگدانەوەی بڕی پەیوەندیەکانی نێوان موڵکی کۆشك و موڵکی تاکەکان بێت، بەڵکو ئەمە هێمایەکە بۆ هەردوو موڵکداریەتی (موڵکداریەتی کۆشك و موڵکداریەتی تاك) کە هەندێك جار بەشێوەی شەراکەت بەیەکەوە بوونە.

کۆشك پێداویستییەکانی لە دانەوێلە لەو لادێیانەی کە بە موڵکی کۆشك دادەنران دابیندەکرد. تاکو ئێستا شێوازی پەیوەندی نێوان کۆشك و ئەو لادێیانە بۆمان ڕوون و ئاشکرانییە، هەروەها ئەو ناوەی کە دەلالەت لەسەر موڵکداریەتی هەردوولا دەکات لەم حاڵەتەدا نازانرێت، هەروەك چۆنییەتی دابەشکردنی بەرووبوومەکان لەنێوانیان نازانرێت.

جۆرە باجێك هەبوو پێیان دەگوت (ئیلکۆ ــ Elku) (ئەمەش یەکێکە لە سیستەمەکانی پێدانی زەوی، کە بەپێی ئەم سیستەمە پارچە زەویەك بەجوتیار دەدرا بۆ ئەوەی کاری تیادا بکات و وەبەری بهێنێت لە بەرامبەریشدا بەشێك لە بەرهەمەکەی بەخاوەن زەویەکە دەدات) کە بەسەر ئەو کێڵگە زۆرانە سەپێندارابوو کە موڵکدار نەبوون، واپێدەچێت شوێنەواری ئەمەش وەك خۆی لەیاسای کشتوکاڵیدا مابێتەوە بەبێ گۆڕان وەك ئەوەی کە لەسەردەمی بابلی کۆندا بڵاوبووە. دیاریکردنی چەمکی ئەم جۆرە باجە بەوردی لە سەردەمی بابلی کۆندا کارێکی ئاسان نییە، بەڵام ڕەنگە ئەمە ئاماژە بێت بۆ جۆرێك لە باجی کشتوکاڵی کە بەسەر ئەو جوتیارانە دەسەپێندرا کە زەویەکانیان بەمیرات بۆ ماوەتەوە و نەدەکرا بفرۆشرێت، لەسەریان پێویست بوو وەبەری بهێنن و بەشێك لە بەرهەمەکەی بەکۆشك بدەن. نازانین ئەم جۆرە باجە(ئیلکۆ) تا چ رادەیەك گونجاو بووە لە ئارابخا لەگەڵ ئەم جۆرە دیاریکردنە. یەکێك لەو پرسگەلانەی تر کە بۆ ئێمە ناروونە ئەوەیە : ئایا ئەم سیستەمە دەگەڕێتەوە بۆ دووبارە دابەشکردنەوەی زەویەکان کە لەکۆتایی سەدەی شانزە و سەرەتای سەدەی پانزەی پێش زایین ئەنجامدرا دوای داگیرکردنی زەویەکان سەپاندنی دەسەڵات بەسەریدا، یان ئەمە بەدیارکەوتنی پەیوەندییەکی جوزئییە بەلایەنی کەم لەگەڵ بارودۆخی موڵکداری زەویەکان لەسەردەمی بابلی کۆندا ؟.

هەرچۆنێك بێت، نووسراوەکانی نووزی هەڵوەشاندنەوەی ئەم جۆرە سیستەمەی ڕاگەیاندووە، کە ئیشارەت بەسەرهەڵدانی چینەك لە خاوەن زەوی دەکات. ئەمەشیان چینی ناوەڕاستە کە لەنێوان کۆشك و ئەو جوتیارانەی کە بەپێی سیستەمی باجی ئیلکۆ کاریان دەکرد دا هەبوون. گومانی تێدانییە ئەم سیستەمە هەر مایەوە، ڕەنگە ببێتە بەجێهێنانەکی رەسمی لە کۆشك، بەڵام ئەمە لە سەرچاوەکان ئاماژەی پێنەکراوە.

موڵکەکانی شاژن بەشێوەیەکی سەربەخۆ و جیا لە کێڵگەکانی کۆشك بەرهەم دەهێنران. پێوانەی زەویە گەورەکان کە بە دیمات ناسراوبوو، کە ئەمەش موڵکێکی تایبەت بە مەلیك بووە (وەك بڵێی : دێماتی فلانە مەلیك)، ئەم جۆرە زەویانە بەشێوەیەکی جیا لەبەرهەمی کۆشك وەبەردەهێنرا.

دانەوێڵە بەرهەم هێنراوەکانی سەر بەکۆشك هەر لەناو کۆشك دابەشدەکرا، لەدیارترینی ئەوانەی کە لەناو کۆشك سوودیا لێ ئەبینی ئەمانەن :

١- پاشاو فەرمانبەرە گەورەکان و نوێنەرانی وڵاتەکانی تر و بێگانەکانیان و ئەسپەکانیان. (تێبینی ئەوە دەکرێت کە مەلیك بەشێوەیەکی جێگیر لە پایتەخت نەدەژیا، بەڵکو لە

کۆشکێکەوە بۆ کۆشکێکی تر دەڕۆیشت ــ وەك شێوازی گەڕانی فەرەنگییەکان[٧٥] و ئاگاداربوونیان لە وڵات ــ ڕەنگە جۆری بەرهەمەکان بەپێی ناوچەکان دەوری خۆی هەبێت بۆ پەیرەوکردنی ئەم شێوازەی گەڕان سەرەرای پێویست بوون و زەروورەتی بەرێوەبردنی یاسایی و بەشداریکردنی مەلیك لە ئاهەنگ و بۆنە ئایینییەکان).

٢- شاژن و میرە تەمەن بچووکەکان و ئەو کچە شایانەی کە لەباڵی ئافرەتان لە کۆشکی پاشایەتی (ئەمەش شوێنێکە لەناو کۆشك کە تەنها ئافرەتە بەرێزو پایە دارەکانی تێدا دەژیا) دەژیان. ئەمە سەرەرای ئافرەتە گۆرانی بێژەکان کە ژمارەیان یەکجار زۆر بووە، ئەمانەش وەك کۆیلە بوونە، هەروەك ئەم ئافرەتانە لە پاڵ کاری گۆرانی بێژی کاری رستن وچنینیان بۆ کۆشك ئەنجامدەدا.

٣- کۆیلەکان، کە ژمارەیەکی یەکجار زۆریان لە مەجالی دروستکردنی سوف وخووری کاریان دەکرد.

ئەو لیستانەی کە تایبەتە بە دابەشکردنی خۆراك و ناوی کەسەکان ئەوا هەندێك ژمارەی لەگەڵ دایە کە بارودۆخەکە بەشێوەیەکی باشتر روونەدەکاتەوە، لە باڵی ئافرەتاندا لە کۆشکی شاری (زیزا ــ ZEZZA) نزیکەی (٤٣) کەسی تیادا بووە، لەنێوانیاندا شەش کچە مەلیك و پێنج کورە مەلیك. لیستەکی تر هەیە لە کۆشکی شاری (نووزی) بەناوی کۆیلەکانە، کە نزیکەی ناوی ٨٣ کەسی تیاداهاتووە کە بەم جۆرە بووە : (٣٢) کۆیلە کاری رستن وچنینیان ئەنجامداوە، (٣) دارتاش، (٣) ئاسنگەر، (٢) وەستای دروستکردنی گلێنە، (٤) نووسەر، (٢) وەستای دروستکردنی سەللە، ئەمە سەرەرای بوونی ژمارەیەك چێشتلێنەر و نانەواو وەستای دروستکردنی بیرە و شوان و باخەوان و چەندانی تریش.

پیشەی ڕستن وچنین لە گرنگترین کارە بەرهەمهێنەرەکانی کۆشك بوو، بۆ ئەم مەبەستەش کۆشك چەندین مێگەل مەڕ و ماڵاتی بەخێو دەکرد. کە چاودێری کردن و سەرپەرشتی کردنی ئەم مەڕ و ماڵاتانە ئەرکی سەرشانی کۆیلەکانی سەر بە کۆشك بوو، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤە ئازادەکان وەك شوان مەڕوماڵاتی کۆشکیان بەخێودەکرد بەپێی بوونی گرێبەستی کار لە نێوان ئەوان و کۆشکدا. هەر کۆشکێك برێکی دیاریکراو لە باجی فەرز دەکرد بەسەر پارچەی جل و بەرگە دروستکراوەکاندا کە بەگرنگترین ماددەی نێردراو دادەنرا لە وڵاتی ئارابخا.

---

(٧٥) فەرەنگییەکان هۆزێکی جەرمانی بوون لە سەدەی شەشەمی زایینی فەرەنسایان داگیرکرد.

هەرچی ئەوەی کە پەیوەستە بە پرۆسەی فرۆشتنی بەرهەمەکان، ئەوا چەند بازرگانێکی دیاریکراو لێی بەرپرسیار بوون. تێبینی دەکرێت کە ئەم بازرگانانەش ناویان لە ریزی کۆیلەکانی کۆشك بووە (واتە ئەم بازرگانانە کۆیلەی کۆشك بوونە). ئەم کۆیلە بازرگانانە گەشتی بازرگانیان بۆ دەرەوەی ولات ئەنجامدەدا، کە تیایدا هەڵدەستان بە کرینی ئەو شتانەی کە پێیان راسپێردرابوو، سەرەرای بەسترانەوەی ئەم بازرگانانە بەکۆشك (واتە خزمەتکردنی لایەنی بازرگانی تایبەت بە کۆشك) بەڵام لەهەمان کاتدا داواکاری تاکەکانیشیان جێبەجێ دەکرد و شتیان بۆ دەهێنان. لە گرنگترین ئەو شتانەی کە دەیانناردە دەرەوە (صادرات) بریتی بوو لە بەرهەمەکانی رستن وچنین و کۆیلە. بەڵام لە گرنگترین ئەو ماددانەی کە دەیانهێنا (استراد) بریتی بوو لەو ماددانەی کە لە رووەك دەردەهێنران لەگەڵ هێنانی خووری رەنگاورەنگ. (سەیری وێنەی ژمارە ٩ بکە)

کۆشك لە پاڵ گرنگیدان بە لایەنی ئابووری ئەوا زۆر گرنگی بەلایەنی سەربازی دەدا، ئەمەشیان پەیوەندی بە بازرگانی ناوەندی (التجارة المركزية) هەبوو. کۆشك هەڵدەستا بەرێکخستنی پرۆسەی کانزا بەنرخەکانی وەك (مس، تۆتیا، تەنەکە، ئاسن)، پاشان لە لایەن وەستاکانی سەر بە کۆشك کەل وپەلی سەربازی لێ دروستدەکرا، لەناو کۆشکدا کارگەیەگ هەبوو تیایدا زرێ بۆ سەربازەکان و جەنگاوەرەکان و سوارەکانیان دروستدەکرا، ئەمە سەرەرای دروست کردنی چەندین چەکی تری جۆراو جۆر.

لەسەر کۆشك پێویست بوو لەکاتی جەنگدا چەك و پێداویستییەکانی تری جەنگاوەران دابین بکات. بێجگە لە هێزی سەر بەیەکەی گالیسکە جەنگییەکان کە خۆیان هەڵدەستان بە دابینکردنی پێداویستییەکانی تایبەت بەجەنگ لە ئەسپ، گالیسکە، چەکە جۆر بەجۆرەکان (وادیارە ئەم چینە هەموو جارێك ئەم کارەیان جێبەجێ نەکردووە). ئەم جەنگاوەرانە لە کاتی جەنگدا برێکی زۆر دانەوێلەیان لە کۆشك وەردەگرت بە بەراوورد لەگەڵ یەکەکانی تردا، ئەمەش بۆ بەخێوکردنی خۆیان و ئەسپەکانیان.

مەلیك (بەو سیفەتەی کە سەرکردەی دەوڵەتە) هەموو فەرمانەکانی دارایی، یاسادانان، بریارە یاساییەکان، خۆی دەریدەکردن، هەرچی دەوری دەزگا حکوومییەکان و سنووری بەشداری کردنیان لە دەرکردنی بریارەکاندا تاکو ئێستا بۆ ئێمە روون وئاشکرا نییە، ئەمەش چونکە تێکستە مێخییەکان بەروونی باسی لەم خاڵە نەکردووە. دەوری مەلیك لەرووی بریارە یاساییەکان (الأحكام القانونية) وەك دەوری دادگای پیاچوونەوە بووە کە دەسەڵاتی هەڵوەشانەوەی بریارەکانی هەبووە لەبەرامبەر دادگای ناوەخۆیدا.

لەگرنگترین ئەو فەرمانبەرە کارگێڕیانەی کە یارمەتی مەلیکیان دەدا لەبەڕێوەبردن و دەرکردنی بڕیارەکاندا ئەمانەی خوارەوەن :

■ شەککین ماتی، سوکەللو : ئەم دوو فەرمانبەرە هەروەك وەزیری ئێستا بوون، بەڵام ئەرکەکانیان بەتەواوی روون نییە.

■ خەل رُوخلۆ : واتە فەرمانبەری قەڵا (آمر الحصن) ئەمەشیان فەرمان و ئەرکەکانی تەواو دیارنییە.

■ خەزەنتۆ : واتە بەڕێوەبەری ناوچەکان.

هەندێك لە بۆنە و فەرمانە مەلەکییەکان چەند شێوازێکی جموجۆلی و چالاکیەکانی حوکمرانییەتی مەلیکمان بۆ دەردەخات لەوانەش :

• دیاریکردنی نرخی فدیەی پیاوەك کەکراوە بە کۆیلە لە دەرەوەی وڵات، پاشان بازرگانێکی ئارابخا کریویەتی و ئازادی کردووە، بەهیچ جۆرێك نابێت دەستکاری ئەم نرخە دیاریکراوە بکرێت.

• بەهیچ شێوەیەك نابێت هاوڵاتی شاری مەلیك لە رێگەی کەسێکی ترەوە باجی ئیلکۆ بدات.

• هیچ کرێکارێکی کۆشکی پاشایەتی بەبێ ڕەزامەندی مەلیك نابێت ببێتە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی کە کچەکانیان کاری سواڵکردن یان بەدڕەوشتی ئەنجامبدەن.

• لە یەکێك لە فەرمانە ئاراستەکراوەکانی مەلیك بۆ خەزەنتۆ (بەڕێوەبەری ناوچەکە) نووسراوە : پێویستە ووشیاربن لە بەرامبەر کاری دزی و هێرش هێنانی لەناکاو بۆ سەرتان و دەست گیرکردنی هەڵاتووەکانی ئارابخا.

• هەندێك بۆنە مۆرکی کۆمەڵایەتی و سیاسی پێوە دیارە کە تیایدا مەلیك لە سزادانی تاونبارەکان دەبوورێت یان دەستدەکات بە چارەسەرکردنی بارودۆخی چینەکانی کۆمەڵگا و هەژارەکانی ناو گەلەکەی.

لەوانەی کە سەر بەبنەماڵەی دەسەڵاتدارن و بەشێکی بچووکیش لە چینی سەرکردەکانی هێزی گالیسکە سەربازییەکان چینەکی تری نوێ سەری هەڵدا، ئەوانیش بریتی بوون لە گەورە موڵکدارەکانی زەوی، ئەمانەش خاوەنی ژمارەیەکی زۆر لە پارچە زەوی بوون.

لە نموونەیەکدا کە لە نزیکەوە یارمەتیمان دەدات بۆ دیاریکردنی رووبەری ئەو زەویەی کە بەرهەم دەهێنرا لەلایەن یەکێك کە سەربەم چینە نوێیە بوو.کە پێوانەی زەویەکە بەلایەنی

کەمەوە (٢٨٠) هێکتار دەبوو. ئەم رووبەرەش دوو ئەوەندەی خۆی زیاد دەبێت ئەگەر زەویەکە ساڵێ دووجار بەرهەم بهێنرێت (واتە لەساڵێکدا زەویەکە دوو جار تۆ بکرێت وەك ئەوە وایە کە دوو ئەوەندەی زەویەکە لە ساڵێکدا یەك جار تۆ بکرێت).

دوو بەڵگەنامەخانەمان (ئەرشیف) لە وڵاتی ئارابخا دۆزیوەتەوە، کە زانیاری باش و دەوڵەمەندی دەربارەی گەورە مولکدارەکانی زەوی تێدایە، ئەم دوو بەڵگەنامەیەش بە بەڵگەنامەخانەی (تیخیب ــ تیللا) و میراتەکەی و بەڵگەنامەخانەی (شیلووا ــ تیششوب) ناسراون[٧٦].

تیخیب ــ تیللا زاوای مەلیك بووە، پلەیەکی بەرز و گرنگی هەبووە لە کۆشك، زۆرینەی بەڵگەنامەکانی ناو بەڵگەنامەخانەکەی تیخیب ــ تیللا یاسایی بوو، کە ئەمەش یارمەتی داین بۆ زانینی چۆنییەتی کۆکردنەوەی زەوی و زارە کشتوکاڵییەکانی. هەرچی شیلووا ــ تیششوبە ئەوا میر بووە، لە بەڵگەنامە خانەکەی شیلووا ــ تیششووب شێوازی چۆنییەتی بەڕێوەبردنی زەوی وزارەکەی دەردەکەوێت.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد ژمارەیەکی زۆر لە جوتیارە ئازادەکان بوونە خاوەن زەوی، ئەمەش لەئەنجامی دابەشکردنی زەوی لە لایەن کۆشك بەسەریاندا. ئەم جۆرە خاوەندارییەش پەیوەست بوو بەباجی ئیلکۆ، ئەم جۆرە زەویانەی کە بەم رێگەیەوە وەرگیرابوون دەکرا ببێتە میرات بەڵام نەدەکرا بفرۆشێت.

پرۆسەی دابەشکردنی ئەو زەویانەی کە ببووە میرات لە ئارابخا بەجۆرێك بوو کە تەنها کوڕی گەورە دوویەش، بەڵام کورەکانی تر یەکە و یەك بەشیان بەردەکەوت لە زەویەکە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە یەکەی کار لە کورتی بدات لەروو توانای بەرهەمهێنانی ئابووری. هەروەك بەسترانەوەی ئەو زەویانە بە بارودۆخی ئاو و هەوا (باران) بەتایبەتی ئەو زەویانەی کە پشت بەئاوی باران دەبەستن، زۆر جار بەرهەمی باش و تەواویان نەدەدا بەدەستەوە، ئەمەش بەهۆی باران نەبارینەوە، هەربۆیەش لەم حاڵەتەدا جوتیار ناچار دەبێت قەرز وەربگرێت. زۆر جار خێزانەکان نەیاندەتوانی قەرزەکان بدەنەوە چونکە رووبەری زەویەکانیان بچووك و بەرهەمی ساڵانەشی کەم بوو.

---

(٧٦) تیخیب ــ تیللا و شیلووا ــ تیششوب ناوی دوو کەسی خوورییە کە خاوەنی زەوی وزارێکی زۆر بوونە.

چەندین گرێبەستی تایبەت بە وەرگرتنی قەرزمان پێگەیشتووە، ئەم گرێبەستانەش لەنێوان جوتیارە هەژارەکان و گەورە موڵکدارەکان بەسترابوون. لەم جۆرە گرێبەستانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە قەرزە ئاساییەکانی ناوخۆی یەك لادێ یان یەك خێزان وای لێهات مەبەست و مەرامەکانی پێ جێبەجێ نەکرێت. ئەم بارودۆخە بەشێوەیەکی گشتی بووە هۆی وازهێنانی خاوەن زەویەکان لە بەرهەمهێنانی زەویەکانیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ. لەبەر ئەوەی جوتیارەکان نەیان دەتوانی زەویەکانیان بفرۆشن، چونکە ئەم جۆرە زەویانە بە بڕیارێکی مەلەکی لە فرۆشتن قەدەغەکرابوو، هەربۆیەش ئیجتهادێکی یاسایی دانرا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، بەم پێیەش ئەو زەویانەی کە باجی ئیلکۆی لەسەرە دەتوانرێت بکرێتە میرات بە شێوازێکی دیاریکراو. بەم جۆرەش موڵکدارە گەورەکان (لە دیارترینیان لەم رووەوە تیخیب ــ تیللایە هەروەك لە بەشی هەرە زۆری بەڵگەنامەکان دەردەکەوێت) جۆرە رێککەوتنێك لەگەڵ خاوەن زەویە هەژارەکان دەکەن، کە بەرێککەوتنی وەرگرتن (أتفاق تبنّ) ناسراوە کە بەپێی ئەم رێککەوتننامەیە مافی خاوەنداریەتی ئەم زەویە دەدرایە موڵکدارە گەورەکە، کە وەك بەشێکی میرات بۆی وەسفدەکرا لە بەرامبەریشدا موڵکدارە گەورەکان دیارییەك دەدەن بە خاوەن زەویە هەژارەکە. ئەم دیاریەش یەکسانە بەبەرهەمی ساڵانەی زەویەکە، بەڵام هەندێك جار ئەم بڕەیە زیاد دەکرێت تا دەگاتە سێ ئەوەندەی بەرهەمی ساڵانەی زەویەکە. ئەمەش لەبەر گرنگی شوێنی زەویەکە بووە. لەم جۆرە رێککەوتنەدا هەرلایە وەك باسکرا جوتیار زەویەکەی دەدا بە موڵکدارەکە، بەڵام لەسەر جوتیارەکە پێویست بوو باجی ئیلکۆ بدات لە بەرامبەر ئەو دیارییەی کە وەریگرتووە. ئەم یاسایە لەبەرژەوەندی گەورە موڵکدارەکان بوو ئەگەر زەویەکە بەرهەمی باش وچاك بوایە، بەڵام بەداخەوە سەرچاوە مێخییە نووسراوەکان زانیاری زیاترمان لەم بارەیەوە پێنادەن. هەروەها ئێمە نازانین کە ئەم جۆرە رێککەوتنە هیچ مەرجێکی کەسێتی لەخۆ گرتووە کە لەسەر چینی بێ دەسەڵات (جوتیارەکان) پێویست بێت جێبەجێی بکات.

بەم شێوەیە جۆرێکی تری موڵکداریەتی زەوی سەری هەڵدا، ئەمەش لە ئەنجامی سێهەم جار هەموارکردن. هەروەها بەمیرات کردنی ئەم جۆرە زەویانەی کە چینی سێهەم تیایدا بەشدارە (کە لەرێگەی ئەم جۆرە رێککەوتنەی پێشتر باسکرا کە لەنێوان جوتیار وموڵکدارەکان مۆرکرابوو) دوای مردنی خاوەن زەویەکە شتێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەموو جۆرە شەکایەتێك و گازاندەیەکی تایبەت بەم لایەنە پێشکەش کرابا رەت دەکرایەوە، ئەمەش لە زەرەری خاوەن زەویە موڵکدارەکان بوو. هەر لەبەر ئەمەش ئەوانەی کە حەزیان دەکرد زەوی

تر بەدەستبهێنن بۆ وەبەرهێنان، هەڵستان بە بەکارهێنانی شێوازێکی یاسایی تر، ئەویش بریتی بوو لە پێدانی قەرز بەو جوتیارانەی کە زەویەکانیان باجی ئیلکۆی لەسەر بوو، لە بەرامبەریشدا زەویەکانیان رەهن دەکرد بۆ خۆیان، بەڵام ئەوە نازانین کە جوتیارەکان لەم حاڵەتەدا بەردەوام دەبن لە بەرهەمهێنانی زەویەکانیان یان خاوەن قەرزەکە (دەولەمەندە مولکدارەکان) زەویەکە بۆ خۆیان بەرهەم دێنن.

خاوەن مولکە گەورەکان لە لایەنەکانی رێکخستن و شێوازی وەبەرهێنانی ئابووری لە کۆشکدا سوودمەندبوون، بەڵام زەویەکانیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ و جیا لەکۆشك بەرهەم دەهێنا، بەڵام لە هەندێك حاڵەتدا پەیوەندی لەگەڵ کۆشکدا هەبوو، وەك لە حاڵەتی میر (شیلووا ــ تیششوب) کە مولکەکەی لە باوکییەوە کە مەلیك بوو بەمیرات بۆی مابووەوە. هەروەك ئەو کەل وپەل و کۆیلانەی کە لەناو زەویەکەی کاریان پێدەکرا دیارییەکی مەلەکی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە (شیلووا ــ تیششوب) مولکی کۆشکی بۆخۆی بەرهەم هێنابێت.

لەناو مولکەکانی شیلووا ـ تیششوب تێبینی بوونی بەرهەکانی ماددەی رستن و چنین بە قەبارەیەکی گەورە دەکرێت، کە هاوشێوەی بەرهەمەکانی رستن وچنینی کۆشك بووە. هەروەها لەمێگەلە ئاژەلی مەڕ و بزن خووری دابین دەکرد. هەروەها کۆیلەی ئافرەت (بەشێوەیەکی کەمیش کۆیلەی پیاو) هەڵدەستان بە رستن وچنینی خوریەکە. ژمارەی ئەو کرێکارانەی کە لەلای شیلووا ــ تیششوب لە بواری رستن وچنین کاریان دەکرد لە ماوەیەکی دیاریکراودا نزیکەی ٢٤٠ کۆیلەی پیاو و ئافرەت و منداڵەکانیان بوون، ئەمانەش لە چواردەوری کارکردن کۆکرابوونەوە. بەشێکی زۆری بەرهەمەکە خۆی بۆ بەخێوکردنی کارمەندانی کارگەی رستن وچنین بەکاردەهێنرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیلووا ــ تیششوب قازانجێکی زۆری لە دانەوێلەکانی دەکرد کە بەقازانج بەقەرزی دەدا.

جموجۆلی کۆمەڵایەتی بەتایبەتی لە ئارابخا (کە بەسەرهەڵدانی مولکداری گەورە لەلایەك و بڵاوبوونەوەی هەژاری لەنێوان جوتیارە ئازادەکان لەلایەکی ترەوە جیادەکرێتەوە) بووە هۆی سەرهەڵدانی چینەکی کۆمەڵایەتی نوێ. هەروەك مولکدارە گەورەکان زیاتر هەوڵی دابینکردنی سەربەخۆییان ئەدا، هەروەها کۆیلایەتیش زیادی کرد و لە چوارچێوە ئاسابیەکەی دەرچووبوو.

هەرچی لایەنی کۆیلایەتی بوو ئەوا بەکاری خزمەتکردن و مومارەسەکردنی پیشەیەك لە هەندێك لایەنی دیاریکراوی کاروباری کشتوکاڵی وەك بەخێوکردنی ئاژەڵە گەورەکان و کێڵانی

زەوی پەیوەست بوو. گرنگترین سەرچاوەی دەرەکی کۆیلە وڵاتی (لو ــ لو)ە کە دەکەوێتە چیای زاگرۆس (ئەمەش شوێنی لولوییەکانە)، بەڵام سەرچاوەی کۆیلە لەناوەوەی وڵات ئەوا پشتی بە لەدایکبوونی منداڵی کۆیلەکان بەستبوو. تێکستە مێخییەکان ئیشارەت بەوە دەکەن کە ئەو بێگانانەی کە دەرفێنران دەکران بە کۆیلە، هەروەها حاڵەتێکی تر هەیە کە بەسەرچاوەیەکی لاوەکی کۆیلە لەقەلەم دەدرێت ئەویش پێی دەڵێن (تیدینئنۆ)[٧٧] کە پیاوەکان لەم حاڵەتەدا هەڵدەستان بە کارکردن بەهێز و مەچەکی خۆیان بۆ دەستەبەر کردنی یان دانەوەی یان کەفالەتکردنی قەرزێك کە وەری گرتبوو، لەراستیدا ئەمە بەسەر قەرزارەکە دەسەپێندرا کاتێك ئەگەر توانای دانەوەی قەرزەکەی نەبێت، ئەمەش شێوازێکی یاسایی نەبووە.

ئەو چینانەی کە لەبەشی کشتوکاڵیدا کاردەکەن بێ ئەوەی زەوی تایبەتیان هەبێت یان سەر بەو لادێیانەن کە بەتەواوی هی کۆشکە یان هی کەسێکی خاوەن نفوزە لەهەموو چینە کۆمەڵایەتییەکانی تری ئارابخا کەمتر زانیاریمان دەربارەیان هەیە. هەندێك بەڵگە هەیە کە ئیشارەتی بەبوونی جوتیاری ئازاد کردووە کە زەویان بەکرێ گرتووە، هەروەك ئیشارتی بە جوتیاری سەربەخۆ دەکات. گومانی تێدا نییە ئەم توێژینەوە ورد و رێکوپێکە بۆ دەرهێنان و ساغ کردنەوەی چەندین راستی تر سوودی لێ ئەبینرێ.

لە کۆتاییشدا پێویستە ئیشارەت بەو بۆچوونەش بکەین کە دەڵێت: پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە وڵاتی ئارابخا سنووردار بووە بە کۆمەڵە خێزانێکی کارکەر لە چوارچێوەیەکی هاوبەشدا کە ناتوانین تەئکیدی لەسەر بکەینەوە لەژێر رۆشنایی ئەو بەڵگەنامانەی کە تاکو ئێستا دۆزراونەتەوە[٧٨].

---

(٧٧) تیدینئنۆ وشەیەکی خوورییە بە مانای (بەو شتەی کەپێ ی رازییە) دێت.

(٧٨) ئەم بۆچوونە لە لایەن توێژەری رووسی (نینل یانکۆفسکا) پێشکەشکراوە کە بەزاراوەی پێکهاتەی خێزانی فراوان (کومونات أسریة واسعة) دەربڕیوە، کە لە هەردوو توێژینەوەکەی ئاماژەی پێدەکات کە لە ساڵی ١٩٦٩ زایین بڵاوی کردبوەوە.

# ژیانی ئایینی خوورییەکان
## (خوداوەندەکان، ئەفسانەکان، عیبادەت و پەرستن، جادووگەری)

بیروباوەڕی ئایینی و ئەفسانە و پەرستن و ڕێوڕەسمە ئایینییەکانی خوریەکان بە کۆمەڵێکی ڕێکوپێك و سەربەخۆ دانانرێت، ئەمەش شتێکی چاوەڕوانکراوە، چونکە خوریەکان لە ناوچەیەکی سنوور فراوان نیشتەجێ بوونە، کە بۆتە هۆی ئەوەی لەگەڵ شارستانییەتەکانی تری دەوروبەری بەریەککەون وکاریگەری لە سەر یەکتری دروستبکەن.

خوریەکان لە مێژووی خۆیان هەندێك خوداوەندی نامۆیان پەرستووە لە پاڵ کۆمەڵە خوداوەندەکانی خۆیان لە پانسیۆنی خوریدا(مجمع الآلهة الخورية). هەروەك خوریەکان هەندێك لەم خوداوەندە نامۆیانەیان هاوشێوە (متابق) کردووە لەگەڵ هەندێك لە خوداوەندە ناسراوەکانی خۆیان. ئەم دیاردەیەش لە ئەنجامی بەریەککەوتنی شارستانییەتی خوریەکان لەگەڵ شارستانییەتی نەتەوەکانی تری دەوروبەر سەری هەڵدا. پیاوە ئایینییەکان (کاهنەکان)ی خوریەکان شارەزاییەکی تەواویان هەبوو لە فەلسەفەی ئایینی وڵاتی دوو ڕووبار (میزۆپۆتامیا). هەربۆیەش پیاوە ئایینییەکانی خوریەکان بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە توانیان ئەم فەلسەفەیە بۆ ناوچەکانی خوریەکان بگوازنەوە. بەجۆرێك کە توانیان ئەم فەلسەفە ئایینییە لەگەڵ فەلسەفەی ئایینی خوریەکان بگونجێنن. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە خوداوەندە خوریەکانیان لە شوێنی خوداوەندە هاوشێوەکانیان لە وڵاتی دوو ڕووبار دابنێن

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین پێکهاتەی سەرەکی ئایینی خوریەکان بۆ سێ بەش جیابکەینەوە، کە ئەمانەن :

١- ئەو داب ونەریتە ئایینیانەی کە خوریەکان لە کۆنترین ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان لە کوردستان هەیانبوو.

٢- کاریگەرییەکانی هەریەکە لە ئایینی سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکان لەسەر ئایینی خوریەکان.

٣- کاریگەرییەکانی هۆزە سامییەکانی بەشی ڕۆژئاوا ـــ سووریا، لەسەر ئاینی خوورییەکان.

شایانی باسە بەشێکی گەورەی ئایینی سۆمەرییەکان لە هەزارەی سێهەمی پێش زایین بە شێوەی ڕاستەوخۆ لە لایەن خوریەکان نەگواستراوەتەوە. بەڵکو لە هەزارەی دووەمی پێش زایین لە ڕێگەی ئەو بیروباوەرە ئایینییە جۆربەجۆرانەی کە لە کوردستانی سووریادا(باکووری سووریا) باوبووە بۆ لای خوریەکان گواستراوەتەوە.

دەتوانین ئاماژە بە ژمارەیەك لەو خوداوەندە خوریانە بکەین کە لە هەزارەی دووەمی پـێش زاین زۆر بەناوبانگ بوونە و لە هەموو ولاَتی خوریەکان پەرستراون، واتە لەچیای زاگرۆس تـاکو دەریای ناوەڕاست. ئەمەش بەکۆنترین قۆناغی ئایینی خوریەکان دادەنرێت. بـەلاَم دەبێـت لـەم ئیشارەت کردنەدا کەمێك خۆ پارێزی بکەین، چونکە بێگومان تایبەتمەندییە سەرەکیەکانی ئەم خوداوەندانە بە تایبەتمەندی خوداوەنـدە هاوشـێوەکانی لـە ئـایینی سـۆمەری و ئەکەدییـەکان کاریگـەر بـووە. بەپێـچەوانەوەش زۆر جـار خوداوەنـدەکانی خوریـەکان کاریگـەریان لەسـەر خوداوەندەکانی ناوچەکانی تر هەبووە. بەلگەش لەسەر ئەمە خوداوەندەکانی ناوچەکانی ئاسیای بچووکە کـە تایبەتمەندییـەکانی خوداوەنـدەکانی خوریـەکانیان وەرگرتـووە. لـە بـەناوبانگترین خوداوەنـدی خوریـەکان کـە بـۆ نەتـەوەکانی تـریش گوازتراوەتـەوە خوداوەنـد (تیشـشوب - Tishshub) ە. ئەمـەش خوداوەنـدی کـەش (الطقس)بـووە. ئـەم خوداوەنـدە لـە لایـەن ئۆرارتییەکان لە ولاَتی ئاسیای بچووك بە (تایشبا) ناسراو بووە و پەرستراوە. شاری (کومی یان کومییا ـــ Kumme or Kummija) بە گرنگترین مەلبەندەکانی پەرستنی ئـەم خوداوەنـدە دادەنرێت. شوێنی ئەم شارە تاکو ئێستا بەتـەواوەتی دیـاری نـەکراوە. بـەلاَم بـەپێی تێکـستە مێخییە نووسـراوەکان وادەردەکـەوێت کـە ئـەم شـارە بکەوێتـە یـەك لـە چیـا کوردییـەکانی دەوروبەری شاری زاخۆ لە نزیك سنوورەکانی نێـوان کوردسـتانی عـێراق و تورکیـا. خوداوەنـد تیششوب لە ئەفسانەکان بە مەلیکی شاری کومییا وەسفکراوە. خوداوەند تیشووب لە نیـوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پێش زاین بە خوداوەندی سەرەکی دادەنرا لە لایەن خوریەکان (بەلاَم خوداوەند تیشوب لە نێوان خوداوەندەکانی ولاَتی ئۆرارتۆ نەگەیشتە ئەم پلـە بـەرزە). ئەمـەش دوای ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی هاوشان کرا (متابق کرا) لەگەل خوداوەندی کەش لـە ولاَتـی هیلال خەسیب. خوداوەندی کەش لە ولاَتی هیلال خەسیب بە گەورەی هـەموو خوداوەنـدەکانی تـر دادەنـرا. هەربۆیـەش خوریـەکان خوداوەنـد (تیشـشوب)یـان کـرد بـە گـەورەی هـەموو خوداوەندەکانی خۆیان چونکە ئەویش خوداوەندی کەش بوو. لە تێکستە مێخییەکانی هەزارەی سێهەمی پێش زاین تێبینی دەکەین کە ناوی خوداوەند تیششوب تەنها بۆ چەند جارێکی کـەم ئاماژەی پێکراوە. بەلاَم لە تێکـستە مێخییـەکانی هـەزارەی دووەمـی پـێش زایـن کـە لـەو سەردەمەدا ببوو بە خوداوەندی سەرەکی دەبینین بە شێوەیەکی زۆر ئامـاژە بـەناوی کـراوە.لـە سەدەکانی (١٥ ـــ ١٤ پ.ز) ناوی خوداوەند تیشـشوب زۆر بـاو بـووە، کـە وەك بەشـێك لـە پێکهێنانی ناوی کەسەکاندا بەکارهاتووە.

ئەفسانەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە خوداوەند تیششوب گەورەی هەموو خوداوەندەکان بووە. هەروەك ئاماژە دەکەن کە خوداوەند تیششوب خوداوەندی باران و هەورە تریشقەش (کەش) بووە. ئەفسانەکان ئاماژە دەکەن بەوەی کە خوداوەند تیششووب بۆتە مەلیکی ئاسمان (واتە مەلیکی هەموو خوداوەندەکان) دوای ئەوەی کە توانی باوکی خۆی کەناوی خوداوەند (کومماربی) بوو لەم پۆستەی لابدات و خۆی شوێنەکەی بگرێتەوە. گرنگترین چەکەکانی خوداوەند تیششوب بریتییە لە : باران، با، هەورە تریشقە.هەروەها ئەفسانەکان ئەم خوداوەندە وەسفدەکەن و دەڵێن لە سەر گالیسکەیەکی چوار چەرخە دەڕوات کە لەلایەن دوو گا ڕادەکێشرێت. ئەم دووگایە لە ئەفسانەکان بە (شێریش و خوڕویش) ناسراون. بەڵام لە هەندێك سەرچاوەی تر ئەم دوو گایە بە(شێریش و تیلا) ناویان هاتووە. ئەم دووانەش بریتین لە خوداوەند بەڵام لە سەرشێوەی گا دەربڕدراون. دەربڕینی ئەم دوو خوداوەندە لەسەر شێوەی گا وەك ئاماژەیەك بووە بۆ توانای خوداوەند تیششووب لە باران بارین و زۆر کردنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان. چونکە گا لەکاری کشتوکاڵی زۆر بەکاردەهات. ئەمەش بەشێوەیەکی ڕونترو ئاشکراتر لە پەیکەری خوداوەندی کەش لە وڵاتی ئەنادۆل دەردەکەوێت.چونکە دانیشتوانی کۆن بیروباوەڕیان وابوو کەئەم خوداوەندە لە بنەڕەتدا شێوەی گای هەبووە هەربۆیەش ئەم خوداوەندە تا کۆتایی سەردەمی مەملەکەتی گەورەی حیسییەکان هەر لە سەر شێوەی گا پەیکەری بۆ دروستدەکرا. پەیکەری تایبەت بە هەردوو خوداوەندی (شێریش وخوڕویش)ی ڕاکێشەری گالیسکەی خوداوەند تیششووب لە ماوەی هەزارەی یەکەمی پێش زایین لە پەرستگای خوداوەند ئەدەد لە شاری ئاشوور هەبووە. خوداوەند ئەدەد وەك خوداوەندی تیششووب خوداوەندی کەش (باران و هەورە تریشقە) بووە.

تەنها بەڵگە نووسراوەکان ئاماژە بەوە ناکەن کە خوداوەند تیششوب لە وڵاتی ئاسیای بچووك گەورەی هەموو خوداوەندەکانی تربووە، سەرەڕای ئەوەی کە گشت ئەفسانە خوریەکان لە وڵاتی ئەنادۆل دۆزراونەتەوە. مەلیك تووشراتا کە مەلیکی مەملەکەتی میتانییەکان بوو خوداوەند تیششوبی بە گەورەی هەموو خوداوەندەکانی وڵاتەکەی دانابوو. واتە سەرۆکی کۆمەڵگەی خوداوەندەکانی مەملەکەتی میتانی یان (سەرۆکی پانسیۆنی میتانی) بووە. وەك چۆن خوداوەند ئاموون (ئەمانۆ) گەورەی هەموو خوداوەندەکانی مەملەکەتی میسری بوو. واتە خوداوەند ئاموون گەورەی پانسیۆنی میسر بووە. پێش ئەمە لە سەردەمی بابلی کۆن زۆر کەس نازناوی تیششوبیان هەبووە، یان ناوی تیششوب لە بەشێکی ناوی کەسەکاندا هەبووە، وەك

(تیششووب ــ ئیوری) کە بەمانای تیششوبی گەورە دێت. ئـەم نـاوەش لـە سـەردەمی بـابلی کۆندا ناوێکی زۆر باو بووە.

نزیکەی گشت مەلیکەکانی مەملەکەتی ئارابخا ناوی وایان هەبووە کە تیششوب بەشێکی لێ پێکهێناوە، وەك ناوی مەلیکەکانی (کیببی ــ تیششووب، ئیتخی ــ تیششووب، خیشمی ــ تیششووب، موشتییا). ئەمەی دوایی (موشتییا)کورتکراوەی ناوی (موش ــ تیششووبە). بەهەمان شێوە نزیکەی نیـوەی میرەکـانی مەملەکـەتی ئاررابخـا نـاوی هاوشـێوەی ئەمانـەی سـەرەوەیان هەبووە.

گومانی تێدا نییە کە شێوەی ناوەکـان لەهـەر ناوچـەیەك دەلالـەت لەسـەر داب ونـەریتی ناوەخۆی ناوچەکە دەکات. لەبەر ئەوەی شاری ئاررابخا هەر لەسەردەمی بابلی کۆندا مەڵبەنـدی پەرستنی خوداوەندی کەش بووە. هەربۆیەش بـوونی نـاوی تیششـووب لـەپێکهێنانی بەشـێك لەناوی کەسەکانی یان لە ناوی مەلیکـەکانی ئاررابخـا شـتێکی ئاسـاییە ئەمـەش لەئـەنجامی گرنگی خوداوەنـد تیششـووب و ڕەنگدانـەوەی لەسـەر ژیـانی خـەلکی مەملەکـەتی ئاررابخـا بووە.خوداوەند تیشووب لە لایەن ئەکەدییەکان بە خوداوەند ئەدەد ناودەبردرا وهـەمان ئـەرکی خوداوەند تیششووبی هەبووە. بەڵام خوداوەندی کەشی ئەکەدی (خوداوەند ئەدەد) پلە و پایـەی زۆر بەرز نەبووە لە لای ئەکەدییەکان وەك ئەوەی کە خوداوەندی کەشـی خوریـەکان (خوداوەنـد تیششوب) هەیبووە لەلای خوریەکان. واتە خوداوەند ئەدەد بەگەورەی خوداوەندەکان لە قەڵـەم نەدراوە لە لای ئەکەدیەکان، بەڵام خوداوەند تیششووب بە گـەورەی خوداوەنـدەکان لـە قەلـەم دراوە لە لای خوریەکان. لـە شـاری ئۆغاریـت خوداوەنـد تیششـوب دەپەرسـتراو بـە گـەورەی خوداوەندەکان دادەنرا (مەلیکی خوداوەندەکان). بەڵام دواتر خوداوەند تیـشووب لـە ئۆغاریـت ئەم پلە و پایەیەی نەما. ئەمەش دوای ئەوەی کە لەگەڵ خوداوەند (بەعل) هاوشێوە (متـابق) کرا. لە ڕاستیدا هەوڵدانێکی زۆر دەبینرێت لـە لایـەن نووسـەری چیرۆکە ئەفسانەییەکان بـۆ مەبەستی دانانی خوداوەند (بەعل) وەك گـەورەی هـەموو خوداوەنـدەکانی تـر. بـەڵام بێجگـە لەمەی سەرەوە لە زۆربەی ئەفسانە و مەراسیمە ئایینییەکانی شاری ئۆغاریت خوداوەند(ئیـل) بەگەورەی هەموو خوداوەندەکان دانراوە نەك خوداوەند (بەعل).

چیای سەفەن saphan لـە وڵاتـی ئۆغاریـت بـە مەڵبەنـدی پەرسـتنی خوداوەنـد بـەعل دادەنرا.چیای سەفەن لە سەرچاوە کلاسیکییەکان بە چیای (مۆنۆس ــ کاسـیۆس monos) casiusناسراو بووە.بەڵام ئێستا بەم چیایە دەڵێن چیای (ئەقرەع) کە دەکەوێتـە نزیـك شـوێنی

تێکەڵبوونی رووباری (عاصی) لەگەڵ دەریاوە. ئەم چیایە لە لایەن حیسی و خوریەکان بە چیای (خەززی) ناوبانگی دەرکردبوو.چیای خەززی لە گەل چیای نەمنی (ئـەم چـیایەی دوایـی تـاکو ئێستا شوێنەکەی دیاری نەکراوە) لە لایەن خوریەکان بە دیاردەکـانی تایبـەت بـە خوداوەنـدی تیششوب لە قەلەم دەدران.

لە شاری حەلەب خوداوەند تیششووب بە خوداوەند (ئـەددۆ) نـاودەبرا کەنەمـەش نـاوێکی سامییەو هاوشێوەی ناوی ئەدەدە. بەڵام دواتر خوداوەند ئەددۆ لە کۆتایی سەردەمی بابلی کۆن لەگەڵ خوداوەندی تیششووبی خوریـەکان بـە یـەکجارەکی هاوشـێوە کـرا (متـابق کـرا). ئـەم خوداوەندە زۆر بە پیرۆزو مقەددەس دادەنرا بەجۆرێك کە پەرستنی ئەم خوداوەندە لـە سـنووری شاری حەلەب دەرچوو بوو، بەجۆرێك کە پەرستنی ئەم خوداوەندە لەوڵاتی ئاسـیای بـچووك تـا ئۆغاریت لە کەنارەکانی سوریا لەوێشەوە بۆ نووزی لە ناوچـەکانی رۆژهـەڵاتی رووبـاری دیجلـە بڵاوببووەوە. پەرستنی خوداوەند تیششووب هەر لە چاخی حیسی کۆن بۆ خاتووشای پایتـەختی مەملەکەتی حیسییەکان گواستراوەتەوە. (سەیری وێنەی ژمارە ١ بکە)

لەپاڵ خوداوەند تیششوب خوداوەنـد (خیپـات ـــ khepat) پەرسـتراوە. ئـەم خوداوەنـدە مەڵبەندی پەرستنەکەی لە کوردستانی سووریا بووە. خوداوەند (خیپات) بە خێزانـی خوداوەنـد تیششووبی شاری حەلەب دانراوە. هەندێك لەتوێژەرەکان ناوی خوداوەند خیپاتیان لەگەڵ حەوا پەیوەست کـردووە(بـەڵام ئەمـە تـەنها گومـان کردنـە و شـتێکی تەئکیـد کـراو نییـە). لـە سەردەمەکانی دواتر خوداوەند(شەررومما) کە ئەمەشیان خوداوەندی چـیایە بـە کـوڕی هـەردوو خوداوەندی تیششووب و خیپات دانراوە لە وڵاتی ئەنادۆل. هەربۆیەش خوداوەند (شەررومما) بـە گۆلکی نێرینەی خوداوەند تیششوب ناودەبرا(٧٩).

یەکێك لە خوداوەندە بە ناوبانگەکانی تری خوریەکان خوداوەند (شاووشکایە).کە بەیـەکێك لە گرنگترین خوداوەندەکانی خوریەکان دادەنرێت. ناوی ئەم خوداوەندە بۆ یەکەمجار لە تێکـستە مێخییـەکانی سـەردەمی بنەماڵـەی ئـووری سـێهەمدا هـاتووە. بەتایبـەتی لـە تێکـستە مێخییەکانی تایبەت بە وڵاتی ئاشوورو ناوچەکانی رۆژهەڵاتی سەرووی رووباری دیجلە.خوداوەند شاووشکا بەشێوەیەکی هاوبەش لەگـەڵ خوداوەنـد عەشـتار لـە ناوچـەکانی وڵاتـی ئاشـوور و

---

(٧٩) لەسەردەمە کۆنەکاندا نازناوی گا یان گۆلك نازناوێکی زۆر پیرۆز بووە و دەلالەتی لەسەر بەهێزی و بەتوانایی کردووە.

ڕۆژهەڵاتی سەرووی ڕووباری دیجلە دەپەرستـرا[٨٠]. ئـەرکی ئـایینی خوداوەنـد شاووشـکا ــــ عەشتار بریتی بووە لە جنس و جەنگ، واتە خوداوەندی بـەرپرس بـووە لـە جـنس و جـەنگ. مەڵبەندی سەرەکی پەرستنی ئەم خوداوەنـدە شـاری نەینـەوای وڵاتـی ئاشـوور بـووە [٨١] ئـەم خوداوەندە لە شاری نەینەوا تا کۆتایی سەدەی هەشتی پێش زایین هەر بە خوداوەنـد شاووشـکا ناسرابوو.

بەپێی بیروباوەڕی خوریەکان ئەم خوداوەندە توانابییەکی چـاکی هـەبووە لـە چـاککردنەوەی هاوڵاتیان لە نەخۆشی. هەربۆیەش دووجار پەیکەری ئەم خوداوەندە ڕەوانەی وڵاتی میسر کراوە بۆ چاکردنەوەی فرعـەونی میسر لە نەخۆشییەکەی.

خوداوەند شاووشکا ــ عەشتار بە خوداوەندی سەرەکی دادەنرا لە ژمارەیەك لـە شـارەکانی وڵاتی ئاشوورو ئارراپخا. بەڵام هەندێك جار لە پاڵ خوداوەنـد شاووشـکا ــــ عەشـتار هەنـدێك خوداوەندی تـری نـاوەخۆیی (محـەلی) دەپەرسـتران. ئـەم خوداوەنـدە ناوەخۆییانـەش لـە ڕووی گرنگییـەوە پلەیـەکی مـام ناوەنـدیان هـەبووە. هەنـدێك جـار ئـەم خوداوەنـدە ناوەخۆییانـە (محەلیانە)گرنگی و پلە و پایەیان زیاتر دەبوو لە خوداوەند شاووشکا ــ عەشتار، وەك خوداوەند ئاشوور کە بووە خوداوەندی سەرەکی شاری ئاشوور. هەروەها دواتر بووە خوداوەنـدی سـەرەکی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری. لەو شارانەی کە خوداوەندی شاووشکا ــــ عەشـتار وەك خوداوەنـدی سەرەکی دەپەرسترا هەندێك خوداوەنـدی تـر پەرسـتراون کـە بـە خـانمی وڵات نـاوبراون. بـەڵام لەڕاسـتیدا ئـەم خوداوەندانـە فرمـانی سـەرەکیان بریتـی بـووە لـە یەکخسـتن و کۆکردنـەوەی سیفەتەکانی نێوان هەردوو خوداوەند شاووشکای خووری و عەشتار سامی.

لە مەملەکـەتی میتانییـەکان خوداوەنـد شاووشـکا وەك یـەك لـە خوداوەنـدە گـەورەکان مامەڵـەی لەگـەڵ کـراوەو پەرسـتراوە. مـەلیکی مەملەکـەتی میتـانی تووشـراتا خوداوەنـد شاووشکای بە (خانمی وڵات) و (خانمی ئاسمان) وەسفکردووە. خوداوەند شاووشکا بە پێی داب و نەریتی سۆمەری و ئەکەدی و ئەنادۆڵی بە خوشکی خوداوەندی کەش دانـراوە. بـەڵام نازانرێـت

---

(٨٠) خوداوەند شاووشکالەگەڵ خوداوەند عەشتار هیچ جیاوازیەکی نەبووە تەنها لەرووی ناو نەبێت.شاووشکا ناوێکی خووریە بەڵام عەشتار ناوێکی سامییە کە هەردوو ناو دەلالەت لەسەر یەك خوداوەند دەکات.

(٨١) ناوی شاری نەینەوا لە ناوی خوداوەندی سۆمەری (ئینانا) وە هاتووە، ئینانا ناوی سۆمەری خوداوەند شاووشکا ــ عەشتارە.

ئەمە لە پانسیۆنی خوریدا(مجمع الآلهة الخورية)تا چەند لەگەڵ پێگەی بنەڕەتی ئـەم خوداوەندانـە دەگونجێت. خوداوەند شاووشکا لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتیش پەرستراوە، بەتایبەتی لەو ناوچـانەی کە ئاینی خوریەکانی تێدا بڵاوبووەتەوە، کە تیایدا دەبیـنین ئـەم خوداوەنـدە لـەپاڵ خوداوەنـد تیششوب لەو شارانەی کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە وەك شارەکانی: تیللا، خیلمانی، نووزی پەرستراون. لە شاری نـووزی پەرسـتگای دووانـی (المعبـد المـزدوج) دۆزراوەتـەوە. ئـەم پەرستگایەش تایبەت کراوە بە پەرستنی هەردوو خوداوەند تیششووب و شاووشکا.

ولاتی کیزۆفەتنا زۆر کاریگەر بووە بە تەقالیدی ئایینی شاری حەلەب. هەربۆیـەش وڵاتـی کیزۆفەتنا لەڕێگەی ئـەم کاریگەریـە ئایینییـەوە خوداوەنـدی شاووشـکای لـە پـاڵ خوداوەنـد تیششووب وەك خوداوەندێکی سەرەکی لادا و خوداوەند خیپاتی لە شوێن دانا (واتە خوداوەنـد خیپات شوێنی خوداوەند شاووشکای گرتەوە بۆ ئـەوەی وەك خوداوەنـدێکی سـەرەکی لـە پـاڵ خوداوەند تیششووب بپەرسترێت؟) بەڵام لە وڵاتی ئالالاخ و ئۆغاریت خوداوەند شـاووشکا لەگەڵ خوداوەند تیشووب بە گەورەی هەموو خوداوەندەکانی تر دادەنران و هیچ گۆڕانکاریان بەسـەردا نـەهات. بـەڵام لـە شـاری لاوازەنتییـا کـە شـارێکە سـەر بـە وڵاتـی کیزۆفەتنایـە دەبیـنین پەیوەندییەکی درووستکراو هەیە لەنێوان بیرو باوەڕی ئایینی شاری حەلەب و تەقالیدی ئـایینی شاری لاوازەنتییا بە جۆرێك کە بۆتە بەرێز ڕاگرتن و پەرستنی هەرسێ خوداوەند یـەك لـەدوای یەك بەپێی گرنگیان بەم جۆرە :(تیششووب، خیپات، شاووشکا).

تێکستە مێخییە ئەکەدییە دۆزراوەکانی شاری ئۆغاریت خوداوەند شاووشـکا بـە خوداوەنـدی عەشتاری خووری ناودەبات. هەروەها لەنەقشێکی فینیقی کە بۆ سەدەی هەشتەمی پێش زایـن دەگەڕێتەوە ناوی خوداوەند شاووشکا بە عەشتەرووتی خووری ئاماژەی پێکراوە بـەم جـۆرە (ع ث ت ر ت خ ر) ئەم نەقشە نووسراوەش لە شاری مارسـیلیای فەرەنـسی دۆزراوەتـەوە.لـە بـاکووری سووریا وێنە و پیشەی خوداوەند شاووشکا بە شێوەیەکی ڕەها لەگەڵ خوداوەنـد ئیـشخارا تێکـەل کرابوو، ئەمەش چونکە ئەم دوو خوداوەندە لە ڕووخساردا هاوشێوەی یەك بوونە. بەڵام لـە وڵاتـی ئۆغاریت خوداوەند شاووشکا لەگەڵ خوداوەند عەشتەرووت هاوشێوە کراوە.

لــە وڵاتــی کیزۆفــەتنا خوداوەنــدی ڕەش (الألوهيــة الــسوداء) دەپەرســترا. دواتــر ئــەم خوداوەندەش لە وڵاتی کیزۆفەتنا شوێنی خوداوەند شاووشکای گرتەوە. دوای داگیرکردنی وڵاتی کیزۆفەتنا لە لایەن حیسییەکان و کردنی بە بەشێك لە مەملەکەتی حیسییەکان پەیکەری ئـەم خوداوەندە گواسترایەوە بۆ شاری شەموخا.

خوداوەند شاوشکا لە هەموو ئەو ناوچانەی کە لەسەرەوە باسمانکردن بە خوداوەندی ئافرەت (مێ)لە قەلەم دراوە، بەلأم لە ناوچەکانی ئاسیای بچووك تێبینی دەکرێت کە ئەم خووداوەندە بە خوداوەندێکی پیاو (نێر) لەقەلەم دراوە. ئەمەش بەشێوەیەکی ئاشکرا لە هەلکۆلدراوەکانی پەرستگای (یازلی کایا) دەردەکەوێت. مێژووی ئەم پەرستگایە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی سێزدەی پێش زایین دەگەڕێتەوە. ئەم پەرستگایە لەنزیك خاتووشا دۆزراوەتەوە. لەسەر دیوارەکانی ئەم پەرستگایە وێنەی خوداوەندەکان هەلکەندراوە، کە تیایدا خوداوەند شاووشکا لە ڕیزی خوداوەندە پیاوەکان (نێرەکان) بە وەستاوی دەردەکەوێت نەك لەریزی خوداوەندە ئافرەتەکان (مێیەکان). ئەمەش بەلگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەم خوداوەندە لە ناوچەکانی ئاسیای بچووك بە خوداوەندەکی نێر لە قەلەم دراوە. (سەیری وێنەی ژمارە ٤ بکە)

لە یەکێك لە ڕێوڕەسمە ئایینییەکانی خوریەکان کە تیایدا ئاژەلْ وەك قوربانی پێشکەش بە ئەندامی نێرینەی خوداوەندە پیاوەکان و ئەندامی مێینەی خوداوەندە ئافرەتەکان دەکرێت کە لەنێوانیاندا خوداوەند شاووشکادا هەبوو ئەمەش چونکە خوداوەند شاووشکا بە خاغی جنس و شەهوەت دانرابوو. هەربۆیەش ئەم خوداوەندە لەتوانایدابوو کە سزای دوژمنەکانی و پەیمان شکێنەرانی بدات، ئەویش بە گۆڕینی هەلسوکەوتی جنسیان و مندالْ نەبوونیان. ئەم توانایەش بەهەمان شێوە لە لایەن خوداوەندی سۆمەری ئینانا ـــ عەشتار لە ولأتی نێوان دوو ڕووبار(میزۆپۆتامیا) هەبووە. تەنها لە ناوچەکانی بەشی ڕۆژئاوا ئەم خوداوەندە دوو خوداوەندی تری لەگەلدا بووە. ئەم دوو خوداوەندە بە خزمەتکارو مۆسیقاژەنی خوداوەند شاووشکا دادەنران. ئەم دوو خوداوەندەش ناویان (نیناتتا و کولیتتا) بووە.ڕەنگە بوونی ئەم دوو خوداوەندە وەك خزمەتکاری خوداوەند شاووشکا بۆشێوازی داب و نەریتی ئایینی ناوچەکانی ئەنادۆل بگەڕێتەوە. ئەم دوو خوداوەندە بەردەوام لەگەلْ خوداوەند شاووشکا بوونە هەروەك چۆن دوو گایەکە (شێریش وخورویش) بەردەوام لەگەلْ خوداوەند تیششووب بوونە. ئەم دوو خوداوەندەش (نیناتتا و کولیتتا) لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین لە شاری ئاشوور هەر بەم شێوەیە ناسراوو بوونە. تێکستە نووسراوەکانی خاتووشا باسی هەندێك خوداوەندی یارمەتیدەر وخزمەتکار بۆ خوداوەند شاووشکا دەکات. ناوی ئەم خوداوەندانەش خوری بووە وەك :

ـــ شینتەلْ ـ ووری : واتە (خاوەنی حەوت چاو).

ـــ شینتەلْ ـ ئیرتی : واتە (خاوەنی حەوت مەمك).

ـــ شینان ـ تەتوکەرنی : واتە (خۆشەویستییەکی زۆر بەهێز).

یەکێك لەو خوداوەندانەی کە لە گشت ناوچە خوریەکان دەپەرسترا خوداوەند (کومماربی)یە. ئـەم خوداوەندەش تەوەری سەرەکی پێکدەهێنێت لە ژمارەیەك لەو چیرۆکانەی کە باس لە هەوڵدانـەکانی ئەم خوداوەندە دەکات بۆ بەدەستهێنانی پلەی سەرکردایەتی کردنی خوداوەندەکان دوای ئـەوەی کـە خوداوەندی کەش ئەم پلەیەی لە دەست دابوو. ناوی خوداوەنـد کومـاربی دەلالـەت لـە سـەر نـاوی شوێنی سەرەکی پەرستنی دەکات. ئەم ناوەش (کومماربی) لە بنەرەتدا لە ناوی شـوێنێك و پاشگرێك پێکدێت. هەروەها بەڵگەمان هەیە لەسەر ئەوەی کەناوی هەندێك لـە خوداوەنـدەکانی تـریش وەك ناوی خوداوەند کومماربی لە ناوی شوێنێك و پاشگرێك پێکهاتووە. واتـە بـەزۆری نـاوی خوداوەنـدە خوریەکان لە ناوی شوێنێك یان ناوی شارێك لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە. ئەفسانە خوریەکان شاری ئورکیشی مەلەکی بە مەڵبەندی پەرستنی خوداوەند کومماربی دادەنێن. هەرچەندە خوداوەند نـەرگاڵ لە کۆتایی هەزارەی سێهەمی پێش خوداوەندی سەرەکی ئەم شارە بووە.

کۆنترین بەڵگەی نووسراو لە سەر خوداوەند کومماربی لە تێکستێکی (خـووری) دا هـاتووە. ئەم تێکستە مێژووەکەی بۆ (١٧٠٠ پ.ز) دەگەڕێتەوە و لە شـاری (مـاری) دا دۆزراوەتـەوە. خوداوەند کومماربی لە شاری ئازۆخینو لە ژێر ناوی کومموروی پەرستراوە. ئەم شارەش دەکەوێتـە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە. بێجگـە لەمـە ئـەم خوداوەنـدە دەورێکـی مامناوەنـدی هەبووە و هیچ کاتێك دەوری خوداوەندی سەرەکی نـەبینیوە لـە نێـوان پەرسـتراوەکاندا. نـاوی خوداوەندی کومماربی وەك بەشێك لە پێکهێنانی ناوی کەسە خورییەکان بەکار نـەهاتووە. بـەڵام گومانی تێدا نییە کە خوداوەنـد کومـاربی لـە سـەردەمی ئاشـووری نوێـدا لـە پـاڵ هـەردوو خوداوەندی (ئەبەربی، سەممەنوخا) بە خوداوەندی سەرەکی شاری تەئید دادەنرا.

لە چوارچێوەی مەبدەئی گونجاندنی نێوان خوداوەندە سوورییـەکان، خوداوەند کومماربی لەگەڵ خوداوەند (داگان) کە خوداوەندی ناوچەی فوراتی ناوەڕاستە و، خوداوەندی سۆمەری ــ ئەکەدی (ئەنلیل)و، خوداوەندی وڵاتـی ئۆغاریـت (ئیـل) سـازانراوە. لەبەرئـەوەی خوداوەنـد کومـاربی لەڕووی ڕەچەڵەك و ڕووخسارو پەیوەندییەکانییەوە لەگەڵ هەریـەك لـەم خوداوەندانـە جیـاوازە، هەربۆیەش سازاندنی خوداوەند کومماربی لەگەڵ خوداوەند داگان زیادەڕۆییەکی زۆری تیادا کراوە (موبالەغە). بەجۆرێك کە خوداوەند (شالا) بە خێزانی هەردوو خوداوەند (کومـاربی و داگـان) دانراوە.ڕەنگە گۆڕینی ناوی خوداوەند کومماربی لە لیستەکانی تایبەت بـەناوی خوداوەنـدەکانی (حیسی ــ خوری) بەو وشەیەی کەبەمانای دانەوێلە دێت، بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە خوداوەنـد کومماربی وەك خوداوەند (داگان) ی خێزانی بە خوداوەندی دانەوێلە لەقەلەم درابێت. لە ئەفسـانە

و چیرۆکە ئایینییەکانی (حیسی ـ خوورییەکان) ئاماژە بەوە دەکرێت کە خوداوەند کومماربی وەك هەموو خوداوەندە گەورەکانی تری خوریەکان وەزیرێکی هەبووە. وەزیری خوداوەند کومماربی ناوی (موکیشانۆ) بووە. ئەم ناوەش لە ناوی موکیش دارێژراوە. موکیش ناوێکی خووری کۆنە کە دەلالەت لە مەملەکەتی ئالالاخ دەکات.

یەکێك لە خوداوەندە سەرەکییەکانی تری خوریەکان خوداوەند (نوپاتیك)ە. دەربارەی ئەم خوداوەندە بەڵگەی تەواومان لە شارەکانی ئۆغاریت و خاتووششا بەدەست گەیشتووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاکو ئێستا سیفات و ڕەچەڵەکی ئەم خوداوەندە ڕوون و ئاشکرانییە. لە تێکستەکانی تایبەت بە بەردی بناغەی یەکێك لە کارەکانی مەلیك (تیش ـــ ئەتەل) ئەم خوداوەندە بە ناوی (نوباداگا)وە بانگ دەکرێت. لە ئاهەنگەکانی تایبەت بە جەژنی خیشووا قوربانی بەدوو شێوە پێشکەش بەم خوداوەندە دەکرا. هەریەکە لەم قوربانیانەش لە پەرستگایەکی سەربەخۆ ئەنجامدەدرا.کە بە پەرستگای بیبیتا (یان بیبیتخی) و پەرستگای زەڵمانا ناودەبران.

هەردوو خوداوەندی خۆر و مانگ لە هەموو ناوچەکانی خوریەکان دەپەرستران.خوداوەندی خۆر لەژێر ناوی شیمیك (بەڵام لە ناوچەکانی بەشی ڕۆژهەڵاتی خوریەکان خوداوەندی خۆر لەژێر ناوی شیمیکا) دەپەرسترا. هەرچی خوداوەندی مانگ بوو ئەوا لەژێر ناوی کوشوخ (بەڵام خوداوەندی مانگ لە ناوچەکانی ئالالاخ و خاتوششا لەژێر ناوی کوشەخ) دەپەرسترا. ناوی خوداوەندی خۆری خوریەکان ناوی خوداوەندی خۆری ئۆرارتییەکان (خوداوەند شیوینی)مان بەیاد دەهێنێتەوە. بەڵام ناوی خوداوەندی مانگ (کوشوخ)ی خووری بەناوی خوداوەندی کۆنی مانگی (کەسکۆ)ی حیسی پەیوەست کراوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی پەیوەندی زمانەوانی نێوان هەردوو زمانی خووری و حیسی هەر لە کاتە زووەکانەوە. لەلایەکی ترەوە ڕەنگە ناوی خوداوەند کوشوخ لە ناوی شاری کوزینا دارێژرابێت. هەردوو خوداوەند شیمیك و کوشوخ لە هیچ ناوچەیەکی دیاریکراو پێگەیەکی پیرۆز و تایبەتیان نەبووە بە بەراورد کردن لەگەڵ خوداوەندەکانی تر. هەربۆیەش ئەم دوو خوداوەندە ڕووخسار و تایبەتمەندی و کەسایەتی و دەوریان لە ڕووداوەکانی ناو ئەفسانە خوریەکان بەشێوەیەکی نادیار ماوەتەوە.کاتێك مەلیکی میتانی (توشراتا) لەنامەکەی (ئەو نامەیەی کەپێشتر ئاماژەمان پێکرد و وەرمانگێڕا) بۆ فرعەونی میسری کەباس لە خوداوەند شیمیك دەکات، ئەوا لەڕاستیدا مەبەستی خوداوەندی خۆری میسریەکانە کە لای میسرییەکان بە خوداوەند (ڕەع) ناسراو بووە.خوداوەندی خۆر

پەیوەندی پتەوی لەگەڵ کاهنەکان (پیاوە ئایینییەکان) بە هەموو جۆرەکانییەوە هەبووە.چونکە لەماوەی بەدەرکەوتنی خۆر لە ئاسماندا هەموو شتەکانی سەر ڕووی زەوی دەبینێت (ئەمەش بەپێی بیروباوەڕی مرۆڤی کۆن). بەڵام خوداوەندی مانگ بە پارێزەری ئیمان دەدەنرا. پیشەی ئەم خوداوەندە (خوداوەندی مانگی خووری) لە خوداوەندی مانگی ئەکەدی کە بە خوداوەند سین ناسراو بووە جیاوازە. بەهۆی ئەم پیشەیەوە خوداوەندی مانگی خووری (کوشوخ) لە کۆمەڵەی خوداوەندەکانی ئاسمان دوور دەکەوێتەوە، بەڵام لە کۆمەڵەی خوداوەندەکانی ژێر زەوی یان جیهانی دووەم (العالم السفلی) نزیك دەبێتەوە بەپێی بیروباوەڕی دانیشتوانی کۆن.

خوداوەندەکانی جیهانی دووەم بەرپرسیار بوونە لە نەهێشتن و لابردنی تاوان و سیحری ڕەش و بیرو باوەڕی درۆیی. واتە خوداوەندی مانگ بە خوداوەندی بەرپرس لە لەعنەت و مردن دادەنرێت. دانیشتوانی کۆن بیروباوەڕیان دەربارەی خوداوەند خۆر وابووە کەکاتێك لە رووی زەوی ئاوا دەبێت ئەوا دەچێتە جیهانی دووەم (ژێر زەوی). هەرلەبەر ئەمەشە کە خوداوەندی خۆریان بە خوداوەندی جیهانی خواروو (جیهانی دووەم) داناوە. ئەمەش ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی دانیشتوانی ئەنادۆڵە بەڵام بەشێوازێکی زمانەوانی خوریەکان دەربڕاوە. سەرەڕای ئەمەش دەبینین کە خوداوەند شیمیك لە ئەفسانە و عیبادەتەکان و جەژنەکاندا وەك خوداوەندێکی گەورەی کۆمەڵەی خوداوەندەکانی ئاسمان دەردەکەوێت و لەپاڵ خوداوەند تیشووب وەستاوە لەکاتی ململانێ دەربارەی سەرۆکایەتی کردنی خوداوەندەکان.

خوداوەندی مانگ زۆر بەناوبانگ بووە لە مێژووی وڵاتی ئەنادۆل.لە شێوەکانی خوداوەندی مانگ خوداوەندی مانگی تایبەت بە شاری حەررانی کوردستانی سووریایە ( باکووری سووریا). زۆر جار دەبینین ئەم خوداوەندە لە لیستی ناوی خوداوەندەکانی مەلیك (شەتتی- وازا) بەشێوەیەکی سەربەخۆ باسدەکرێت. ئەم لیستەش تایبەت بووە بە پاراستنی بیروباوەر و ئیمانی مەلیك شەتتی ــ وازا.خوداوەند (نیگگال) بەخێزانی خوداوەند مانگ (کوششوخ) دادەنرێت. ئەم خوداوەندە پێگەیەکی زۆر گرنگی هەبوو لەلایەن خوریەکانی ئۆغاریت. ئەم خوداوەندە لە بنەڕەتدا بریتییە لە خوداوەند (نەنگال) ی سۆمەریەکان. وشەی نەنگال وشەیەکی سۆمەرییە بەمانای خانمی گەورە دێت. تێبینی دەکەین کە لەماوەی سەدەی (١٤ پ.ز) ناوی خوداوەند (نیگگال) وەك بەشێك لە پێکهێنانی ناوی سەرەکی زۆربەی زۆری شاژنە حیسییەکان هەبووە. بۆنموونە وەك : (نیگگال ــ ماتی، ئەشمۆ ــ نیگگال). بەڵام لەدوای سەدەی (١٤ پ.ز) ئەم خوداوەندە لە ناوچە خوریەکان و حیسییەکان گرنگییەکەی خۆی لەدەستدا، ئەمەش

چونکە لەو ماوەیەدا پەرستنی خێزانی خوداوەندی خۆری بابلی لە ناوچە خووری و حیسییەکان زۆر پەرەیسەند و لەنێوان پەرستراوە خوریەکان شوێنی خوداوەند نیگگالی گرتەوە.

وەرگرتنی خوداوەندە سۆمەری و ئەکەدییەکان و گواستنەوەیان بۆ کۆمەڵگەی خوداوەندە خوریەکان بەشتێکی نامۆ لەقەڵەم نادرێت. چونکە هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کاریگەری هەردوو لایەن لەسەر یەکتری جا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆبێت یان ناڕاستەوخۆ، کە بەزۆری لە ڕێگەی وڵاتی سووریاوە بووە. هەروەك ئەمە بۆتە هۆی گواستنەوەی هەندێك تێروانینی ئیلاهی دیاریکراو، ئەمەش لە لیستی خوداوەندەکان دەردەکەوێت. ئەم لیستانەش بەچەند زمانێك نووسراوونەتەوە و لە ناوچەکانی ئۆغاریت و ئیمار دۆزراونەتەوە.

خوداوەندی (نەرگال) بەیەکێك لە خوداوەندە خورییەکان دادەنرێت. ئەم خوداوەندە هەر لە کۆنەوە لە سۆمەریەکانەوە گواستراوەتەوە بۆ ناو خوریەکان. ئەسلی ئەم خوداوەندەش بەتەواوی نازانرێت. کۆنترین بەڵگەش دەربارەی ئەم خوداوەندە لە نەقشێکی نووسراوی مەلەکی تایبەت بە مەلیکەکانی سەردەمی ئەکەدی هاتووە. پاشان لەلایەن هەموو ئەو دەوڵەتە خوریانەی کە لەدوای ڕووخانی مەملەکەتی ئەکەدی سەریان هەڵدا ئەم خوداوەندە گرنگیەکی تایبەتی پێدرا. دوو نووسراوی تایبەت بە هەردوو مەلیکی تایبەت بە شاری ئورکیش ئەوانیش(ئەتەل ــ شین، تیش ــ ئەتەل) لە پەرستگای خوداوەند نەرگال دۆزراونەتەوە. ئەم دوو نووسراوە بریتییە لە نووسراوی تایبەت بە دانانی بەردی بناغەی دروستکردنی پەرستگای تایبەت بە خوداوەند نەرگال یان نۆژەنکردنەوەی پەرستگاکە. لەم تێکستە مێخییە نووسراوەدا مەلیك (ئەتەل ــ شین) بە مەلیکی خەوەلوم یان خەویلوم یان خەولوم دادەنرێت. ناوی خوداوەند نەرگال لەو تێکستە نووسراوانەش بەدەردەکەوێت کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بوونی بنکە بازرگانییە کۆنەکانی ئاشوورییەکان لە کەبەدۆکیا. هەروەها بەهەمان شێوەش ناوی خوداوەند نەرگال لە تێکستە مێخییەکانی ناوچەی ماری بەدەردەکەوێت. هەروەها ناوی ئەم خوداوەندە لە تێکستێکی سەردەمی ئاشووری کۆتایی (سەردەمی ئاشووری نوێ)دا هاتووە. ئەم تێکستە مێخییە لە بنەڕەتدا باسی چۆنییەتی ئەنجامدانی مەراسیمەکانی پێشکەشکردنی قوربانی بۆ خوداوەند نەرگال دەکات. ئەم تێکستە بۆ شاری خوبشەل یان خوبشەلوم دەگەڕێتەوە. ئەم شارە کۆنە دەکەوێتە دەوروبەری شاری دیاربەکری ئێستا.

ناوی خوداوەند نەرگال لەو تێکستە حیسی و خوریانەی کە لە خاتووشا دۆزراونەتەوە بەشێوازە ئاساییەکەی خۆی نەهاتووە. شێوازە ئاساییەکەی ناوی خوداوەند نەرگال لە تێکستە

مێخییەکان ئەمانەن : {ger8 (IR.GIR) – ،geri-gal ،ger- ri8،(UNUG) - gal ri8 – gal }[٨٢]. تێکستە مێخییەکانی ناوچەکانی ڕۆژئاوا گرنگی ئەم خوداوەندە بەدەرناخەن. بەڵام ئەوەی لێرەدا کە پێویستی بەدیراسەتکردن و لێکۆڵینەوەیەکی تەواو بێت ئەوەیە : ئایا ئەو هێمایەی نووسینی سۆمەری (U.GUR) دەلالەت لە سەر ناوی خوداوەند نەرگال دەکات لە ناوچەکانی خاتوشا هەروەك چۆن ئەم مانایەی دەدا لە سەردەمی بابلی ناوەڕاست (زۆربەی توێژەرەکان ئەمەیان پێ ڕاستە و پالپشتی ئەم لێکدانەوەیە دەکەن)، یان ئایا مەبەست لەم وشەیە هەمان ناوی(ئوگور ـــ ugur)ە کە لەتێکستە مێخییەکانی مەملەکەتی ئارابخا زۆر ئاماژەی پێکراوە.

لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە لە ماوەی سەدەکانی (١٤ ـــ ١٥ پ.ز) خوداوەند نەرگال پیرۆزی و قودسیەتێکی تایبەتی خۆی هەبوو.خوداوەند نەرگال سەرۆکی پانسیۆنی شاری ئازۆخینۆ بوو لەگەڵ خوداوەند شاووشکا (عەشتار). واتە(ئەم دوو خوداوەندە بەگەورەی هەموو خوداوەندەکانی تر دادەنران). خوداوەند شاووشکا لەم شارەدا بە (خومێللا) ناودەبرا. هەردووخوداوەندی نەرگال و شاووشکا لە ژمارەیەك لە شارەکان لەڕووی پێگە و گرنگیانەوە لەدوای خوداوەند تیشووب و شاووشکای شاری نەینەوا دەهاتن. لە ساڵنامەی ئاینی تایبەت بە مەملەکەتی ئارابخا ناوی دوو مانگی هاوشێوە هەیە، بەڵام ئەم دوو مانگە لەیەکتری جیا دەکرانەوە بەوەی کە یەکێکیان تایبەت بووە بە خوداوەند تیششووب و ئەوەکەی تریان تایبەت بووە بە خوداوەند نەرگال. هەروەها یەك لە دەرگاکانی شاری ئارابخا بەناوی خوداوەند نەرگال کراوە. کاروباری ئایینی تایبەت بە پەرستگای خوداوەند نەرگال لە شاری کورروخەننی لە لایەن کاهنێکی ئافرەتی پایە بەرز و پلەدار لەڕووی ئایینییەوە بەڕێوە دەبردرا. ئەم ئافرەتە بە (entu) ناودەبرا. ئەمەش لە بنەرەتدا ناوێکی سۆمەرییە کە بەگەورەی هەموو کاهنە ئافرەتەکانی ناو پەرستگا دەگوترا.

خوداوەند ئەیا (EA) هەر لە ماوەی سەردەمی ئەکەدییەکانەوە گواستراوەتەوە بۆ ناو کۆمەڵگەی ئایینی خورییەکان (پانسیۆنی خورییەکان). هەرچەندە ئێمە بەڵگەی نووسراومان لەسەر ئەمە نییە لە نێوان بەڵگەنامە کۆنەکانی خورییەکان. بەڵام بەئاشکرا دەتوانین ئەمە بسەلمێنین، ئەویش لە شێوازی ناوی خوداوەندەکە خۆی دەردەکەوێت (أ - آ، A'a). کە ئەمەش

---

(٨٢) پیتی (g) لیرەدا بە پیتی (گ) دەخوێنرێتەوە. لەگەڵ پێوە نووسانی پیتی (ن) واتە (نگ) دەخوێنرێتەوە.

ناوێکی زۆر زۆر کۆن و باوبووه له ئاسیای بچووك. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیە لەسەر گواستنەوەی ئەم خوداوەندە بۆ ناوچە خوریەکان هەرلەکاتێکی زووەوە. خوداوەندی ئەیا لە ولاتی بابل هاوشێوەی خوداوەندی سۆمەری ئەنکی بووە. ئەم خوداوەندەش بەرپرس بووە لە ئاوی سازگار و ئاوی ژێر زەوی (ئەبزۆ) و سەرەڕای ئەوەی کە ئەم خوداوەندە دەورێکی بالای هەبووە لە کاری نووشتەکاری (تعویذات). هەروەها ئەم خوداوەندە بە خوداوەندی زیرەکی و دانایی ناوبانگی دەرکردبوو. بەمەش ئەم خوداوەندە هاوشانە لەگەڵ خوداوەندی خووری ئەییا (آ آ)، ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی لە سروودێکی ئایینی شاری نوللی کومی ڕەنگ دەداتەوە و بەدەردەکەوێت.کە تیایدا لەم سرووده ئایینییەدا دەبینین ئەم خوداوەندە زۆر جار بە (خەسیسی) ناودەبرێت. ئەم وشەیەش لە بنەرەتدا وشەیەکی دارێژراوە لە وشەی (خەسیسۆ)ی ئەکەدی کە بەمانای زیرەکی و دانایی (الحکمة) دێت. سەرەرای بوونی ئەم نازناوەش خوداوەند ئەنکی نازناوێکی تریشی هەبووە ئەویش نازناوی (شەرری) یە. ئەم نازناوەش وشەیەکی دارێژراوە لە وشەی (شەڕڕوو) ی ئەکەدی کە بەمانای مەلیك دێت. سروشتی ئەم خوداوەندە وایکردبوو کە پیرۆزییەکی تایبەتی هەبێت لە لای دانیشتوانی مەملەکەتی میتانی.خوداوەند ئەنکی پەرستگایەکی تایبەتی هەبووە لە شاری ئاشوور. بەلام ئێمە بەتەواوەتی بۆچوونی دانیشتوانی ناوچە خوریەکان سەبارەت بە لە قەلەم دانی خوداوەند ئەنکی بە مەلیك نازانین. ڕەنگە بۆ چوونی خوریەکانیش هەمان بۆ چوونی سۆمەرییەکان بێت کە خوداوەند (ئەنکی) بە مەلیکی ئاوی سازگاری ژێر زەوی (کەبە ئەبزۆ ناودەبرا) لەقەلەم دابوو. تێبینی دەکەین کە خوداوەند ئەییا (شەرری) بەنازناوی گەورەی داناکان یان زیرەکەکان ناودەبرێت لە یەکێك لەو پەیماننامانەی کە مەلیکی میتانی (شەتتی وازا) سوێندی پێخواردوون. ئەمەش هیچ جیاوازییەك لە سرووشتی ئەم خوداوەندە درووست ناکات.

تازەترین هەڵکۆڵینە شوێنەوارییەکان دەریان خستووە کە لە سەرەتای هەزارەی سێهەمی پێش زایین پەیوەندییەکی شارستانی پتەو هەبووە لە نێوان هەریەکە لە دانیشتوانی ناوچە شارستانییەکانی باشووری ولاتی دوو رووبار و ناوچەکانی فوراتی ناوەڕاست و ناوچەکانی کوردستانی سووریا (باکووری سووریا). ئەمەش بووە هۆی ئالوگۆڕکردنی بیروباوەڕی ئایینی نێوانیان. هەروەك چۆن پێشتر ئاماژەمان کرد بە چۆنییەتی گواستنەوەی خوداوەندی مانگی سۆمەری (نەن ــ گال) لە ماوەی سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم بۆ ناوچە خوریەکانی

سووریا، که بووه هۆی ئەوەی خوریەکان ئەم خوداوەندە وەربگرن و لە پانسیۆنی (کۆمەلگەی خوداوەندەکان)ی خۆیان دایبنێن.

لە ژێر ڕۆشنایی لیستە (خووری ــ حیسی)ی تایبەت بە پێشکەش کردنی قوربانی، خوداوەندە خوریەکانی تایبەت بە دانیشتوانی بەشی ڕۆژئاوا بۆمان ئاشکرا دەبێت. ئەم لیستە(خووری ــ حیسی)یە لە ولاتی کیزۆفەتنا دۆزراوەتەوە. هەروەك ئەمە بەشێوەیەکی ئاشکراتر و ڕوونتر بۆمان دەردەکەوێت ئەویش لەئەنجامی دۆزینەوەی پەرستگایەکی حیسییەکان لە ناوچەی یازیلی کایا.لەڕاستیدا وێنەی سەردیوارەکانی ئەم پەرستگایە لە بنەرەتدا بریتین لە داب ونەریت و بیروباوەڕی ئایینی خوریەکانی کوردستانی سووریا (باکووری سووریا). تێکستە دۆزراوەکانی ناوچەی ئیبیللا بەڵگەی تەواوی بەدەستدا سەبارەت بەوەی کە خوداوەندە ناسراوەکانی سنووری خوریە نیشتەجێبوەکانی بەشی ڕۆژئاوا و خوداوەندە نەناسراودکانی بەشی ڕۆژهەلات هەموویان لە بنەڕەتدا بۆ یەك شارستانییەت دەگەڕێنەوە. بەهۆی بەلگەنامەکان و تێکستە مێخییەکانی ئیبیللا توانیمان کۆمەلگەی خوداوەندە خوریەکانی (پانسیۆنی خووری) لە کوردستانی سووریا (باکووری سووریا) لە ماوەی سەردەمی پێش سەرجۆنی ئەکەدی دیاریبکەین[٨٣]. (سەیری وێنەی ژمارە ٤ بکە)

لە نێوان ئەو خوداوەندانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ باکووری سووریا (کوردستانی سووریا) خوداوەند (ئەشتەپی ــ Ashtabi )ە. ئەم خوداوەندەش خوداوەندی تایبەت بە جەنگ بووە. ئەم خوداوەندە بە گوێرەی ناوەکەی بە خوداوەندێکی خووری دادەنرێت. ئەمەش لە برگەی (بی) دەردەکەوێت.چونکە زۆربەی ناوە خوریەکان بەم برگەیە کۆتاییان دێت وەك ناوەکانی :(کوماربی، نەبەربی.....هتد) بەلام ئەو خوداوەندانەی کە لەپێش خوریەکان لە کوردستانی سووریادا هەبوون، بریتین لە خوداوەند(ئەدەمما ــ Adamma) و( ئیشخارا ــ Ishkhara). خوداوەند ئیشخارا دواتر لە ولاتی ئاسیای بچووك بووە بە خوداوەندی تایبەت بە سوێند خواردن و نەخۆشی.

تاکە خوداوەندی ناسراو لە بەشی ڕۆژئاوا خوداوەند (ئەللانییە ــ Allani) یە. ئەمەش خوداوەندی جیهانی خواروو (العالم السفلی) بووە. ئەم خوداوەندەش هەمان خوداوەندی (ئەلللاتوم)ە کە پێشتر لە سەردەمی بنەمالەی ئووری سێهەم ئاماژەی پێکراوە. گومانی تێدانییە کە ناوی ئەللانی پەیوەندی هەیە بە وشەی خووری (ئەللای) کە بەمانای خانم دێت.

---

(٨٣) مێژووی تێکستە مێخییەکانی ئیبیللا بۆ سەرەتای سەدەی (٢٤ پ.ز) دەگەڕێتەوە.

بەڵام ناوی ئەڵلاتوم تاکو ئێستا لە زمانی ئەکەدی شیکردنەوەیەکی گونجاوی بۆ نەکراوە. بوونی پەیوەندی نێوان ناوی هەردوو خوداوەندی خووری (Allani) و (Allatum ) تاکە بەڵگەیە کە دەلالەت لەسەر بوونی خوریەکان دەکات بەوەی کە لە ماوەی (٢٢٠٠ پ.ز) لە باکووری سووریا بوونیان هەبووە..خوداوەند ئەڵلانی لە سەرەتادا سەر بە پانسیۆنی شاری خەششۆ بوو. بەڵام دواتر مەلیك خاتوشیلی یەکەم پەیکەری ئەم خوداوەندەی بۆ شاری خاتووشای پایتەختی مەملەکەتی حیسی گواستەوە.خوداوەند ئاللانی بە دایکی خوداوەند خیپات دادەنرێت. خوداوەند خیپات لە ناوچە خوریەکانی کوردستانی سووریا (باکووری سووریا) دەپەرسترا. دواتر خوداوەند خیپات کرا بەخێزانی خوداوەند تیششوب لە پانسیۆنی خوریەکانی بەشی ڕۆژئاوا. خوداوەند خیپات لە وڵاتی کیزۆفەتنا خوداوەندێکی زۆر پیرۆز بووە، ئەمەش وایکردووە کە بەشێوازی جۆراوجۆر بەدەربکەوێت. کاتێك حیسییەکان بیروباوەڕی ئایینی خوریەکانی وڵاتی کیزۆفەتنایان وەرگرت ئەوا خوداوەند خیپاتیان لەگەڵ خوداوەندی خۆری تایبەت بەشاری ئارینا هاوشێوە کرد. کە ئەو کات بە یەکێك لە گەورەترین خوداوەندەکان لە نێوان پەرستراوە خوریەکان دادەنرا. خوداوەند خیپات لە مەملەکەتی میتانی و ناوچە خوریەکانی ڕۆژهەڵاتی مەملەکەتەکە لە ڕیزی خوداوەندە گەورەکان دانەنراوە، ڕەنگە هەر شوێنی پەرستنی تایبەتی خۆیشی نەبوبێت. بەڵام دواتر لە سەدەی (١٤ پ.ز) ناوی چەندین ئافرەت دەبینین کە وشەی خیپات لە پێکهێنانی ناوەکانیاندا هەیە. ئەم ئافرەتانەش سەر بەچینی دەسەڵاتدار بوونە. وشەی خیپات لە پێکهێنانی ناوی ئەم ئافرەتانە بەزۆری برگەی دووەمی پێکدەهێنا واتە (......... ـــ خیپا)، لەنێوان ئەوانەش ناوی هەردوو شاژنی میتانی کە هەردووکیان لەلایەن فیرعەونەکانی میسرەوە داخوازی کرابوون، ئەوانیش : (کیلو ـــ خیپا، تاتۆ ـــ خیپا)یە. بەهەمان شێوەش لە شاری نووزی دوو ناومان بەدەست گەیشتووە کە خیپات لە پێکهاتنیان دا هەیە ئەوانیش (شووەر ـــ خیپا، شەتتو ـــ خیپا)یە. ئەمەش ناوی دوو ئافرەتن کە خزمی یەك لەمیرەکانی مەملەکەتی میتانین. هەروەك دواتر هەندێك ناومان بەدەست گەیشتووە کە وشەی خیپات برگەی یەکەمی پێکدەهێنێت واتە:(خیپات ـــ.....) ئەمەش لە ناوی شاژنەکانی بنەماڵەی دەسەڵاتداری حیسییەکان دەردەکەوێت.

لە ئەفسانەو مەراسیمە ئایینییەکان و پەیماننامە نێودەولەتیەکانی حیسییەکان ناوی کۆمەڵێك لە خوداوەندەکانی جیهانی خواروو (العالم السفلی) دەبینرێت. ئەم خوداوەندانەش بێجگە لە تێکستە مێخییەکانی خاتووشا ناویان لە هیچ تێکستێکی تر نابینرێت. ئەم

خوداوەنـدەش بەشـێوەیەکی ئاشـکرا دەگەڕێتـەوە بـۆ بیروبـاوەڕی ئـاینی خوریـەکان. ئـەم خوداوەندانەش بە (خوداوەندە زۆر کۆنەکان) ناسراون کە بنەچە و ڕەچەلەکی خوداوەندەکانی تـر پێکدەهێنن. ئەم خوداوەندانەش لەلایەن خوداوەندی کـەش (تیشـشووب) دوور خرابوونـەوە بـۆ جیهانی خواروو. هەروەك چۆن لە بەشی ئەفسانەکان ئاماژەمان پێکردووە.

لە یەکێك لە تێکستە نووسراوەکان کە بـەراوردێك دەکـات لـەنێوان هـەردوو دەسـتەواژەی سیحری سپی و سـیحری ڕەش[*] بۆمـان دەردەکـەوێت کـە خوداوەنـدەکانی جیهـانی خـواروو ئەوانەی کە بە (خوداوەندە زۆر کۆنەکان) ناسـراون ڕووی سـەلبی خوداوەنـدە دەسـەڵاتدارەکانی جیهانی سەروو واتە(خوداوەنـدە سـەماوییەکان) پێکـدەهێنن. لەبـەر ئـەوەی خوداوەنـدەکانی جیهانی خواروو دەسـەڵاتی خۆیـان لەدەسـت داوە بۆیـە وەك خوداوەنـدەکانی جیهـانی سـەروو سیفەتە ئیجابیەکانیان تێدانییە. واتە ئەم خوداوەندانەی جیهانی خواروو سیفەتی پاکیـان تێـدا نییە وەك خوداوەندەکانی جیهانی سەروو. بوونی ئەم پاکیـەش مەرجێکـە بـۆ کاریگەریـەکانی خوداوەندەکانی جیهانی سەروو. لەدەست دانی ئـەم پاکییـە بـەهۆی ئـەنجامادانی خراپەیـەکی ئایینی دەبێتە هۆی وەستانی فەعالیەتی خوداوەندەکان، کە لەئەنجامی ئەمەشدا کاریگەریەکی خراپی دەبێت بۆ سەر خۆشگوزەرانی ژیانی مرۆڤ.

بەپێی ئەم بیروباوەڕانەی دانیشتوانی خووری بۆمان دەردەکەوێت کە خوداوەندەکانی جیهانی خواروو ڕووی پێچەوانە یان دژ (نقـیض) ی خوداوەندەکانی جیهانی سـەروو پێکـدەهێنن.کـاری خراپ و پیس کار لە خوداوەندەکانی جیهانی خواروو ناکات چونکە پیسی بریتییە لـە جیهـانی ڕاستەقینەی خۆیان. بۆیە مرۆڤەکان لەم خوداوەندانە دەپاڕێنەوە بۆ ئـەوەی لـە کـاری خـراپ و پیس بەدووریان بگرن. ئەم جۆرە پیسیەش کە خوداوەندەکانی جیهانی خـواروو بەسـەر مرۆڤـی دەهێنێت لەسـەر شـێوەی جـۆراو جـۆر بەدەردەکـەوێت وەك: (سـاڵێکی کـەم بـەرووبووم یـان نەهامـەتی لەڕووی ئابوورییەوە، کوشـتنی مـەلیك، هـاتنی پەتایـەکی کوشـندە، یـان سـوێند خواردنی بەدرۆ). بۆ دوورخستنەوەی ئـەم نەهامـەتیانـە لەسـەر ڕووی زەوی و هێـشتنەوەی لـە

---

(*) مەبەست لە سیحری سپی ئەوەیە کە بۆ مەبەستی دوورخستنەوەی مرۆڤ لە کارەسات و نەخۆشی و....هتد بەکاردەهێنرا بەڵام سیحری ڕەش بەکاردەهێنرا بۆ ئەنجامدانی کاری خراپ و زیان گەیاندن بە مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتی ئەمەش بەپێی بیروباوەری دانیشتوانی کۆن.هەریەکێك بەئەنجامدانی سیحری ڕەش تۆمەتبار بکرابایە ئەوا دەست و قاچەکانی دەبەسترایەوەو فرێی ناو ڕووباریان دەدا واتە دەکوژرا.

جیهانی خواروو دەبێت هەوڵبدرێت خوداوەندەکانی جیهانی خواروو رازی بکەن ئەویش بە پەرستن و پێشکەشکردنی قوربانی بۆیان. بەشێوەیەکی تر واتە پەرستنی خوداوەندەکانی جیهانی خواروو لەلایەن دانیشتوانی خوریەکان بۆ ئەوە بووە کە تاکو نەهامەتی و ناخۆشیان بەسەر نەهێنن، واتە لەترسان بووە. چونکە خوداوەندەکانی جیهانی خواروو تەنها توانای ڕاگرتنی کاری خراپیان هەبووە. بەڵام پەرستنی خوداوەندەکانی جیهانی سەروو لەلایەن دانیشتوانی خوریەکان دەپەرستران بۆ ئەوەی نیعمەت و بەرەکەتی خێر و خۆشیان بەسەردا ببارێنن و لێیان تووڕە نەبن چونکە خوداوەندەکانی جیهانی سەروو سەرچاوەی دابینکردنی هەموو خۆشییەك بوونە بەپێی بیروباوەڕی خوریەکان. هەربۆیەش لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لەسەر خوریەکان پێویست بووە هەردوو جۆرە خوداوەندەکان بپەرستن واتە(خوداوەندەکانی جیهانی سەروو، خوداوەندەکانی جیهانی خواروو) ئەمەش چونکە ڕازی کردنی کۆمەڵەی یەکەمیان هۆکارێکە بۆ هێنا خۆشگوزەرای بۆ سەر زەوی و بۆ مرۆڤ وەك: باران بارین و زۆری بەرهەم...هتد، بەڵام ڕازی کردنی کۆمەڵەی دووەم هۆکارێکە بۆ ڕاگرتنی ناخۆشییەکانی سەر زەوی وەك هاتنی پەتای کوشندە و کوشتنی مەلیك و کەمی باران و کەمی بەرهەمی زەویەکان.... هتد.

ناتوانین ناوی (خوداوەندە زۆر کۆنەکان) بگەڕێنینەوە بۆ هیچ زمانێکی ناسراو. هەندێك لە توێژەرەکان هەوڵیاندا بیگەڕێننەوە یان نزیکی بکەنەوە لە ناوی خوداوەندە سۆمەریەکان و سامییەکانی بەشی رۆژئاوا. هەندێکی تر لە توێژەرەکان وتیان ڕەنگە ناوی ئەم خوداوەندانە بگەڕێنەوە بۆ نەتەوەیەك کە لەبەشەکانی سەرووی ڕووباری وڵاتی دوو ڕووبار (کوردستانی عیراق)نیشتەجێ بین. ئەم نەتەوەیەش پێش خوریەکان و سامییەکان لەم بەشەی وڵاتی دوو ڕووبار (میزۆپۆتامیا) نیشتەجێ بوونە. لە ناوی زۆربەی خوداوەندە کۆنەکان تێبینی بوونی وێکچوونێکی مۆرفیمی نێوان هەر دوو ناوێك دەکەین کە ئەمانەن :(نارا ـ نابشارا، مینکی ـ ئامونکی، مونتارا ـ موت مونتارا) سەرەرای ئەوەی ژمارەیەك لە خوداوەندەکانی ئەم کۆمەلەیە جۆرە ناوێکیان هەبوو کە دەلالەتی لەسەر وەسفکردنی تایبەتمەندییەکانی خوداوەندەکە خۆی دەکرد وەك :

١- ئەتون تەرری : واتە ـ پیاوی ئایینی ناوەندێکە بۆ وەرگرتنی ئیلهام ـ (الکاهن وسیط الوحي).

٢- زولکی : واتە ـ شیکەرەوەی خەونەکان (مفسر الأحلام).

٣- ئیربیتیکا : واتە ــ گەورەی داد (سید العدل).

هــەروەها دانیــشتوانی ناوچــە خوریــەکان (چــاڵ، قۆڵــت)[٨٤] یــان بەخوداوەنــدێك لــە خوداوەندەکانی جیهانی خواروو لەقەڵەم دەدا. بەو سیفەتەی کە ئەم چاڵە یـا قۆڵتــە ڕێڕەوێکـە یان دەرگایەکە بۆ جیهانی خواروو، ئەم جۆرە بیرکردنەوانەش تــەنها لــە مــەفهومی سـیحری و ئایینی لای خوریەکان ڕەنگی داوەتەوە. ئەمەش دەورێکــی بــاڵای هــەبووە لــە ڕێوڕەســمەکانی تایبەت بە چاکردنەوە لە لای خوریەکان. دەتوانین ئەمەش لەگەڵ ناوی یەك لەشــارە خوریــەکان بەناوی (ئابی ـ ننە ــ ئاش ــ وی) بەراود بکەین، ناوی ئەم شارەش بــە مانــای شــوێنی چــاڵ دێت. ئەم شارەش دەکەوێتە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە. لەکۆتاییدا بــەپێی ئەفــسانە خوریەکان دەردەکەوێت کە هەموو ئەو خوداوەندە مەزنانەی کە لەسەردەمە زووەکانی تەمــەنی ئەم گەردوونە لەسەر تەختی دەسەڵات لابراون ئەوا لەجیهانی خواروو ژیان بەسەردەبەن. لەنێوان ئەم خوداوەدانەش خوداوەندە گەورەکانی سۆمەری و بابلی وەك ئانۆ و ئەنلیل هەیە. هەربۆیەش ئەم خوداوەندانە هەر بە خوداوەندە زۆر کۆنەکان ناودەبرێن. هەنــدێك جــار بــە وشــە ســۆمەریە بنەرەتیەکە ناودەبرێت ئــەویش (ئــەنوناکی)یــە. بــەڵام لــە زمــانی ئەکــەدی بــە (ئــەنوناککۆ) ناودەبرێت. ئەمەش لە ڕاستیدا دەلالەت لەسەر خوداوەندە گەورەکانی جیهانی سەروو دەکـات. بەڵام دواتر دەبینین ئەم خوداوەندانە بریتین لە خوداوەندەکانی جیهانی خواروو ئەمــەش بــەهۆی لادانیان لەسەر عەرشی دەسەڵات هەروەك چۆن لە ئەفسانەکان ئاماژەی پێکراوە.

گومان هەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو خوداوەندەکانی جیهانی خواروو لە هەموو ناوچەکانی خوریەکان ناسراو بووبن. هەروەك لە تێکستە مێخیەکانی خاتووشا دەردەکەوێت. بەڵام ئــەوەی کە دەلالەت دەکات لەسەر پێچەوانەی ئەم بۆچــوونە ئەوەیــە کــە نــاوی ئــەم خوداوەندانــە وەك پارێزگارێك بەکارهێنراوە لەو هاوپەیمانییەتەی کــە لــەنێوان مــەلیکی حیــسی شــۆبیلۆلیۆما و مەلیکی میتانی شەتتی وازا مۆرکراوە. کە لــەم هاوپەیمانییەتــەدا مــەلیکی حیــسی ســوێندی بەناوی خوداوەندەکانی جیهانی خواروو خــواردووە، بــەڵام نــاوی ئــەم خوداوەندانــە لــە لیــستی مەلیکی میتانیدا نەهاتووە بۆ سوێند پێخواردن. لەم پەیماننامەیەدا تەنها دوعا کراوە بــەناوی هەندێك خوداوەندی هیندۆ ئاری وەك : (میترا، ڤارونا، ئیندرا، ناسەتیا) ئەم خوداوەندانەش بە خوداوەندی پارێزەری کەسێتی مەلیکە میتانییەکان دادەنرێن. بێجگە لــەو خوداوەندانــەی کــە

---

٨٤- قۆلت یان چاڵ بەزمانی خووری پێ ی دەڵێن: ئاپی- api

بەخوداوەندی کەسی و خوداوەندی پارێزەر لەقەڵەم دراون و ناوی دیاریکراویان هەبووە. ئەوا هەندێك خوداوەندی تر پەرستراون لە لایەن خوریەکان کە ناوەکانیان دەلالەتیان لەسەر کەسێتی خۆیان نەکردووە و زۆر جار ئەم خوداوەندانە بەشێوەیەکی دووانەیی لەگەڵ یەکتری ناویان هاتووە وەك :(ئاسمان و زەوی) واتە (ئیشی حەورنی)، (چیا و رووبار) واتە (بەبانا شیینا). سەرەرای ئەمانەش لەنێوان پەرستراوەکانی خوریەکانی بەشی ڕۆژئاوا هەریەکە لە نازناوی خوداوەندەکان، چەکی خوداوەندەکان، هێماکانی خوداوەندەکان، کەرستەی بەکارهاتووی خوداوەندەکان لە ڕێورەسمە ئایینییەکانی تایبەت بە خوداوەندەکان گرنگی تایبەتی خۆیان هەبووە و تەنانەت ئەمانە پەرستراون و قوربانیشیان پێشکەش کراوە. یەکێك لە تێکستە مێخییە نووسراوەکانی خوریەکان ئەمە پشت ڕاست دەکاتەوە کە تیادا ئاماژە بە پێشکەش کردنی قوربانی بۆ تەختی خوداوەند خیپات دەکات. پێشکەش کردنی ئەم قوربانییەش لە ڕێورەسمێکی ئایینی دوورودرێژدا بووە. هەروەها بەهەمان شێوەی پێشوو لە ناوچە خوریەکانی بەشی ڕۆژهەڵات قوربانی پێشکەش بە خەوگەی[85] (سەریر)ی خوداوەند شاووشکای شاری نەینەوا کراوە.

تێکستە مێخییە ئایینییەکانی حیسی و خوریەکان زیاتر لەجارێك باسی حەوت ئەژدیهاکە دەکەن (العفاريت السبعة). ئەمەش لەبنەڕەتدا بۆ کاریگەریەکانی شارستانییەتی وڵاتی دوو رووبار میزۆپۆتامیا دەگەڕێتەوە. کە لەسەر شێوەی ئەستێرەی پێروو (ثريا) دەردەکەوت. خوداوەندەکانی ناسراو بە حەوت خوداوەندەکان (الآلهة السبعة) لەبنەڕەتدا بۆ ژمارەیەك لە خوداوەندە گەورەکانی وەك شیمیك و تیششووب دەگەڕێتەوە. ئەمەش ڕەنگدانەوەی نووسینەکان و بۆچوونەکانی نووسەرە حیسییەکانی سەردەمەکانی دواتر نییە، هەروەك هەندێك لە توێژەرەکانی وایان دادەنا. ئەمەش بەبەڵگەی ناوهێنانی ئەم حەوت خوداوەندە بە حەوت براکەی خوداوەند شیمیك لە یەکێك لە نووسراوە مێخییەکانی تایبەت بە فاڵ گرتنەوە کە بەزمانی خووری نووسرابوو. ئەم نووسراوەش لە شاری ماری دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەی بۆ (١٧٠٠ پ.ز) دەگەڕێتەوە.

تێکستە مێخییە نووسراوە خوریەکانی بەشی ڕۆژئاوا ئاماژە بە خوداوەندی باوباپیران (آلهة الآباء) دەکات (ئیننا ـ ئەتتەنوینا). ئەمەش ڕەنگە بەڵگە بێت لەسەر پەرستنی باوباپیران لەم ناوچە خوریانە. گومانی تێدانییە کە ئەم جۆرە بیروباوەڕە بۆ بیروباوەڕی حیسی و سوورییەکان

---

(٨٥) خەوگە بەزمانی حووری پێی دەڵێن : (نەخی)

دەگەڕێتەوە. یەك لە مانگەکانی سالنامەی شاری نووزی ناوی (ئەتتەنشوی) بووە کە بەمانای مانگی باوباپیران دێت. هەروەها بوونی دیاردەی پەرستنی ڕۆحی مردووەکان لە لایەن کەس وکاری مردووەکان یان خێزانەکانیان کە لە تێکستە مێخییەکانی نووزی ئاماژەیان پێکراوە بەڵگەیە کە خوریەکان بە شێوەیەك لە شێوەکان باوباپیرانی خۆیان وەك خوداوەندەکان پەرستووە(*).

بۆ دراسەت کردنی ئەفسانە خوریەکان دەبێت بەشێوەیەکی تەواو پشت ببەستین بە سەرچاوە مێخییە دۆزراوەکانی خاتووشا. ڕوونکردنەوەی چۆنییەتی گواستنەوەی ئەم ئەفسانە خوریانە بۆ پایتەختی حیسییەکان (خاتووشا) کارێکی ئاڵۆزە. بەجۆرێك کە ناتوانین بە وردی قۆناغەکانی ئەم گواستنەوەیە دیاریبکەین. ئەمەش لەبەرنەبوونی بەڵگەی تەواو پێویست لەبەردەستدا بەجۆرێك کە شیاوبێت بۆ بەراورد کرنیان. ئەوکێشانەی پێشتر ئاماژەمان پێکرد دەربارەی پانسیۆنی خوریەکان بەهەمان شێوەش لەسەر ئەفسانە خوریەکان جێبەجێ دەبێت. دەبێت ئەوەش بزانین کە هەندێك شوێنەواری شارستانییەتی خووری کۆن هەیە لە ئەفسانەکان لە پاڵ بوونی شوێنەواری سۆمەری و ئەکەدی و سامییەکانی بەشی ڕۆژئاوا (سووریا)، ئەمە سەرەرای بوونی کاریگەری حیسی و ئاسیای بچووك. زۆربەی ئەو ئەفسان خوریانەی کە بەدەستمان گەیشتوون بەزمانی حیسی نووسراون. بەڵام هەندێکیان بەزمانی خوری نووسراوە، بەڵام ناتوانین بەشێوەیەکی تەواو تێیبگەین لەبەر ئەوەی نووسینە مێخییەکەی تووشی شێواوی و تێکچوون بووە. توێژەرەکان کۆکن لەسەرئەوەی کە ئەفسانە حیسییەکان لە بنەڕەتدا لە ئەفسانە خوریەکان وەرگیراون. واتە حیسییەکان ئەم ئەفسانانەیان لە خوریەکان وەرگرتووە و جارێکی تر بەزمانی حیسی نووسیویانەتەوە. بەڵام ناتوانین ئەمە بەشێوەیەکی یەکجارەکی تەئکید بکەینەوە چونکە لە هەندێك حاڵەتی زۆر کەم کاریگەری ئەکەدی لەسەر ئەم ئەفسانە حیسیانە دەردەکەوێت. ئەمەش شتێکی ئاساییە بەهۆی ئەوەی شارستانییەتی ئەکەدی کاریگەری لەسەر شارستانییەتی خوریەکان هەبووە و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەم کاریگەریە لە ڕێگەی خوریەکانەوە بۆ ناو حیسییەکان گواستراوەتەوە.

---

(*) ئەم دیاردەیەش تاکو ئێستا لە ئاینی ئێزیدیەکان کاریگەری ماوە ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی لە پەرستگای لالشی ئێزیدیەکان دەردەکەوێت کە گۆری یەکێك لە شێخەکانی خۆیان لە ناو پەرستگای ناوبراو داناوەو دەیپەرستن یان بە پیرۆزی دەزانن و بەدەوری دەسوڕێنەوە. هەروەك لە سەردانێکم بۆ ناوچەکە ئەم بۆ روون بدوەوە و هەروەها پرسیارم لە بەرپرسێکی ناو پەرستگاکە کرد سەبارەت بەم مەسەلەیە ئەویش بەهەمان شێوەی پێشووی وەڵامی دامەوە.(وەرگێر).

یەکێك لەو بەڵگانەی کە ئاماژە بـە گەشەسـەندن و پێـشکەوتنی ئـەدەبی نووسـراو بـەزمانی ئەکەدی لە باکووری سـووریا و مەملەکـەتی میتـانی دەکـات، بریتییـە لـەو تێکسـتە مێخییـە ئەکەدیانەی کە لە گردی عەمارنە لە وڵاتی میسر دۆزراونەتـەوە. ئـەم ئەفـسانانەش لـە بـاکووری سووریاوە (کوردستانی سووریا) ڕەوانەی وڵاتی میسر کراون وەك ئەفـسانەی (مـەلیکی جـەنگ). هەندێکی تری ئەم ئەفسانانە لە مەملەکەتی میتانی ڕەوانەی وڵاتی میسر کراون وەك ئەفسانەکانی (خوداوەند نەرگال و ئیرشی کیگال، ئەفسانەی ئادابا). هـەروەها لـە گـردی عەمارنـە پارچـەیەکی بچووکی ئەو تێکستە نووسسراوە دۆزرایەوە کە چیرۆکی ناسراو بـە (چـیرۆکی کیشـشی) بـەزمانی ئەکەدی لەسەر تۆمارکرابوو. هەروەها تێکستێکی تر هەیە کە باسی هەمان چیرۆك دەکـات بـەڵام ئەمەیان بەزمانی خوری وحیسی نووسراوەتەوە(*). بۆیە لێرەدا دەتوانین بڵـێین ڕەنگـە لـە سـەرەتادا ئەفسانە خوریەکانی مەملەکەتی میتانی و ناوچە خوریەکانی تـری بـاکووری سـووریا لـە سـەرەتا بەزمانی ئەکەدی نووسرابن، ئەمەش لەبەر زاڵبـوونی زمـانی ئەکـەدی کـە ئـەو کـات زمـانێکی ستاندارد بووە. پاشان ئەم ئەفسانە خوریانـە لەسەردەسـتی خوریـەکان خۆیـان گواسـتراونەتەوە بـۆ ناوچەکانی ئاسیای بچووك و لەوێـشەوە وەرگێڕدراونەتـەوە سـەر زمـانی خـوری، ئەمـەش چـونکە لەوکاتدا زمانی خووری لە وڵاتی ئاسیای بچووك بەزمانی ڕۆشنبیری و ئەدەب دادەنرا. هەروەك چۆن زمانی ئەکەدی لە ناوچەکانی بەشی ناوەڕاستی وڵاتـی دوو رووبـار بـەزمانی ڕۆشـنبیری و ئـەدەب دادەنرا. هەرچەندە ئەم بۆچوونە تاڕاددەیەکی زۆر لە ڕاسـتی نزیکـە بـەڵام بـۆ سـەلماندنی بەڵگـەی تەواوی لەگەڵدانییە، ئەمـەش چـونکە ئـەو پارچـە شـوێنەوارییانەی کـە لەئـەنجامی هـەڵکۆڵینی شوێنەوارەکان دۆزراونەتەوە یارمەتیمان نادەن بۆ سەلماندنی ئەم بوارە. بەڵام یارمـەتیمان دەدەن بـۆ دۆزینەوەی سیستەمێکی ئەدەبی بەزمانی خووری نووسراو لـە یـەك لـە مەڵبەنـدە سـەرەکیەکانی مەملەکەتی میتانی کە تاکو ئێستا هەڵکۆڵینی شوێنەواریان تێدا ئەنجام نەدراوە.

ئەفـسانەکان بەشـێوەیەکی گـشتی لەبنەڕەتـدا باسـی بـیرو بۆچـوونێکی ئـایینی یـان مومارەسەیەکی سیحری دەکات، کە هەوڵدەدات ئەم بۆچوونە یـان ئـەم مومارەسـە سـیحرییە

(*) بەشی هەرە زۆری ئەو تێکستانەی کە لە مەملەکەتە خوورییەکان بۆ وڵاتی میسر ڕەوانەکراون بە زمانی ئەکەدی نووسراون ئەمە لەو کاتەی کە ئێمە دەزانین کە زمانی میتانییەکان ئەکەدی نەبووە، بەڵام ئەمە ئەوەمان بۆدەردەخات کە زمانی ئەکەدی ئەوکات زمانی ستاندار بووە و وەك بڵێی زمانەکی جیهانی بوویێت هەربۆیەش زۆربەی نامەکان بەتایبەتی گرنگەکان بەزمانی ئەکەدی نووسراوون.

شـیبکاتەوە و بناغەیـەکی بۆدابنێـت، بنـەڕەتی سـەرهەڵدانی ئەفـسانەش دەگەڕێتـەوە بـۆ تێنەگەیـشتنی مرۆڤـی کـۆن لـە گـەردوون و دیـاردە فیزیـاوی و کیمیاویـەکانی دەوروبـەری. هەربۆیەش پیاوە ئایینییەکانی کۆن ئەم چیرۆك و ئەفسانانەیان دانـاوە وەك وەڵامێـك بـۆ ئـەو پرسیارانەی کە دەربارەی ئەم بابەتـە ئاڵۆزانـە ئاراسـتەیان دەکـرا. خوێندنـەوەی ئەفـسانە لـە ڕێورەسمە ئاینییەکان بێجگە لە بەستانەوەی واقیعی ئێستا بـەرابردوو و زیندووکردنـەوەی ئـەو ڕووداوە ئەفسانەییانەی کە دەبێتە هۆی چاککردنی بارودۆخەکە هیـچی ترنییـە. کـە ئەمـەش بەپێی بیروڕای کۆنەکان دەبێتە هۆی بەیەك بەستانەوەی ئەو ڕووداوە ئەزەلییەی کە ئەفـسانەکە باسیدەکات بە واقیعی ئێستا.

ئەفسانە خوریەکانی ناوچەی (خاتووشا)بە پێـچەوانەی ئەفـسانە جۆربـەجۆرەکانی ناوچـەی (ئەنادۆل) بە پەیوەستی بەڕێورەسمە ئایینەکان نەماوەتەوە. بەڵام ناتوانین ئاستی ئەم پەیوەسـت نەبوونە واتە جیابوونەوەی ئەفسانە خوریەکان لە ڕێورەسمە ئایینییەکان و گۆڕانی بۆ شـێوەیەکی ئەدەبی بە تەواوی دیار بکەین. چونکە ناتوانرێت لێکۆلینـەوە بکرێـت لـە سـەر خوێندنـەوەی نووسراوە ئایینییەکان تەنها لە حاڵەتێکی شاز نـەبێت ئـەویش بـە پـشت بەسـتن بـە بەڵگـەی ناوەخۆی واتە(بەڵگەکە لە ناو تێکستەکە خۆیـدا هـەبێت)، یـان بەڵگـەی دەرەکـی بێـت وەك نامەکانی گردی عەمارنە، کە ئەمەش بەسەر هەموو کەلەپووری ڕۆژهەڵاتی کۆندا دەڕوانێت.

چواچێوەی سەرەکی ئەفسانە خوریـە زانراوەکـان بریتییـە لەباسـکردنی ململانێـی هـاتنی خوداوەندە یەك لەدوای یەکەکان بۆ سەر دەسەڵات لە چاخە ئەفـسانەییەکان. ئەمـەش دەگاتـە لوتکە لەگەڵ وەرگرتنی خوداوەنـدی کـەش (تیشـشووب) بـۆ ئـەم پۆسـتە. تێبینـی دەکـەین باسکردنی بنەڕەت و ئەسلی خوداوەندەکان (سیۆگۆنیا) لە ئەفسانەکان تاراددەیـەك فـەرامۆش کراوە بە بەراورد لەسەر تەئکیـدکردن لەسـەر شـەرعیەتی دەسـەڵات و سـەرکردایەتی کردنـی خوداوەند. هەروەها تێبینی ئەوەش دەکەین کە ئەفسانەکانی خوریەکان بەشـێوەیکی پـەراوێزی نەبێت باس لە چۆنییەتی پێکهاتنی بنەماکانی گەردوون(کۆسمۆگۆنیا) ناکەن.

ئەفـسانەیەکی خـووری هەیـە بەناونیـشانی (سـروودی مەملەکـەتێك لـە ئاسمانـدا). ئـەم ئەفسانەیە باس لە هاتنی سێ سەردەمی یەك لە دوای یەك دەکات لە پێش هاتنی خوداوەنـدی کەش و وەرگرتنی دەسەڵات. ئەمەی خوارەوەش بەشێکی ئەفسانەکەیە(٨٦) :

---

(٨٦) لە لیستی سەرچاوەکان سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە : . Guterbock 1946,/f

لـە چـاخە زۆر کۆنەکانـدا خوداوەنـد (ئـالالۆ) مـەلیکی هـەموو خوداوەنـدەکان بـوو لـە ئاسماندا.خوداوەند ئالالۆ لەسەر عەرشەکەی خۆی دانیـشتبوو، لـە بەرامبـەریـشی دا خوداوەنـد (ئـانۆ)ی بـەهێز وەسـتا بـوو. خوداوەنـد ئـانۆ بـەهێزترینی خوداوەنـدەکان بـوو لـە نێـوان خوداوەندەکانی تردا، خوداوەنـد ئـانۆ کڕنۆشـی بـۆ خوداوەنـد ئـالالۆ بـرد و کاسـەی شـەرابی پێشکەش دەکرد بۆ ئەوەی خوداوەند ئالالۆ تیایدا بخواتەوە. خوداوەند ئالالۆ بۆ ماوەی نۆ سـاڵ مەلیکی ئاسمان بوو. بەڵام لە.نۆیەمین ساڵی حوکمکردنیدا خوداوەنـد ئـانۆ دژایـەتی خـۆی بـۆ خوداوەند ئالالۆ ڕاگەیاند. بـەم جـۆرە خوداوەنـد ئـانۆ سـەرکردایەتی شـەڕێکی کـرد لـە دژی خوداوەند ئالالۆ کە توانی لەم شەڕەیدا بەسەر خوداوەند ئـالالۆ زاڵ بێـت. دوای دۆڕانـدنی لـە شەرەکەدا خوداوەند ئالالۆ ڕایکرد بۆ زەوی تاریك، بەڵێ هاتە خوارەوە بۆ زەوی تاریـك (الأرض المظلمة). بەڵام خوداوەند ئانۆ هاتە سەر عەرشی دەسـەڵات وەك مـەلیکی ئاسمـان لـە شـوێنی خوداوەند ئالالۆ حوکمی کرد.

خوداوەند ئانۆ لە ئاسماندا وەك مەلیك لەسـەر عەرشـی دەسـەڵات دادەنیـشت و خوداوەنـد (کومماربی)ی بەتوانا خزمەتی دەکرد. خوداوەند کومماربی کڕنۆشی بـۆ خوداوەنـد ئـانۆ دەبـرد و کاسەی شەڕابی پێشکەشدەکرد بۆ ئەوەی تیایدا بخواتـەوە. خوداوەنـد ئـانۆ بـۆ مـاوەی نـۆ سـاڵ مەلیکی ئاسمان بووە. بەڵام لە ساڵی نۆیەمدا خوداوەند کومماربی دژایەتی خۆی بۆ خوداوەنـد ئـانۆ ڕاگەیاند و لـە دژی خوداوەنـد ئـانۆ سـەرکردایەتی شـەڕێکی کـرد. خوداوەنـد کومـماربی تـوانی لەشەڕەکەدا بەسەر خوداوەند ئانۆدا سـەرکەوێت. لەئـەنجامی ئەمەشـدا خوداوەنـد ئـانۆ لەترسـی خوداوەند کومماربی ڕایکرد و بۆ ئاسمان هەڵفری بەڵام خوداوەنـد کومـماربی بـەدوای کـەوت و لێـی نزیك بووەوە و توانی هەردوو قاچی خوداوەند ئانۆ لە ئاسماندا بگرێت و ڕای بکێشێت بۆ خـوارەوە. لە ئەنجامی ئەم ململانێیەی نێوان هـەردوو خوداوەنـد، خوداوەنـد کومـماربی هەسـتا بەگەسـتنی ئەندامی نێرینەی خوداوەند ئانۆ ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە تۆوی خوداوەند ئـانۆ لەگـەڵ سـکی خوداوەند کومماربی وەك برۆنز یەك بگرن. کاتێك خوداوەند کومماربی کە شلەی نێرینـەی خوداوەنـد ئانۆی خوارد دەستی بەپێکەنین کرد و ڕۆیشت. بەڵام لەم کاتەدا خوداوەند ئانۆ هەڵگەڕایـەوەو بـە خوداوەند کومماربی گوت: تۆ بەسگت پێدەکەنی لەبەر ئـەوەی شـلەی نێرینـەی منـت خـواردووە. بەسگی خۆت پێمەکەنە چونکە من چەند گرانییەك و زەحمەتێکم لەناو سگت دانایە کە ئەمانەن:

یەکەم: من وام لێکردی کە هەڵگری گەورەترین خوداوەندی کەش بیت لەناوسگتدا (لێـرەدا مەبەستی خوداوەند تیشوویە)

دووەم: من رووباری دیجلەم لەناو سگت داناوە کە هیچ کەسێك ناتوانێت بەرگەی بگرێت.

سێهەم: خوداوەندی (تەشمیش)ی گەورەم لەناوسگتدا داناوە، هەروەها دوو خوداوەندی ترسناکی تریشم لەناوسگتدا داناوە کە بەجۆرێك بێزارت دەکەن تا دەگاتە ئەو رادەیەی کە لەبەر ئازارا سەرت بە بەردی چیاکان دابدەیت.

بەشی سێهەمی ئەفسانەکە کە باس لە هاتنی خوداوەندی کەش دەکات بۆ سەر عەرشی دەسەلات لە تێکستەکەدا تووشی شکان هاتووە. بەلام ئێمە لە یەکێك لە تێکستە نووسراوەکانی تایبەت بەیەکێك لە مەراسیمە ئایینەکان بۆمان دەردەکەوێت کە خوداوندی کەش بەهەمان شێوە خوداوەندی پێش خۆی (خوداوەند کومماربی) دەرکردووە بۆ زەوی تاریك.

لە نێو ناوی ئەو خوداوەندانەی کە بوونەتە مەلیك لەئاسماندا ناوی شاری نیپووری(٨٧) سۆمەری هاتووە. لەمەوە بۆ مان دەردەکەوێت کە ئەفسانە خوریەکان کاریگەری کەلەپووری سۆمەری و ئەکەدی و بابلیەکانیان بەسەر بووە.دیاردەی هاتنی نەوە یەك لەدوای یەکەکان بۆ سەر عەرشی دەسەلات دیاردەیەکی زۆر باو بووە لەنێو ئەفسانە سۆمەری و ئەکەدی و بابلیەکان، ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەم دیاردەیە لەنێوان ئەفسانە خوریەکانیش سەرهەڵبدات. ئەمەش بۆ بوونی پەیوەندی شارستانییەتی نەتەوەکانی ناوەڕاست و باشووری وڵاتی دوو رووبار لەگەڵ خوریەکانی باکووری وڵاتی دوو رووبار دەگەڕێتەوە. هەرچەندە دووبارە نووسینەوەی بابلیەکان بۆ ئەفسانەی(ئینۆما ئیلیش) کە تایبەتە بە چۆنییەتی درووستکردنی گەردوون لە کاتێکی درەنگ بووە کە مێژووەکەی بۆ هەزارەی دووەمی پێش زاین دەگەڕێتەوە.

هەروەها ئێمە بەشێوەیەکی ئاشکرا تێبینی بوونی ئەم دیاردەیە دەکەین لە نێوان ئەفسانە خوریەکان و نووسینەکانی شاعیری یۆنانی هزیوود Hesiod (ئەم شاعیرە لە بۆتین لە دەوروبەری ٧٠٠ پ.ز ژیاوە) دەکەین دەربارەی نەسلی خوداوەندەکان. کە چۆن ئەفسانە خوریەکان باس لەهاتنی خوداوەندەکان دەکات بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەکی وەك لەناوبردنی خوداوەندی ئاسمان (ئانۆ) لەلایەن کوڕەکەیی و جێگرتنەوەی، پاشان ئەمەی دوایش بەهەمان شێوە لەسەر دەسەلات لادەبردرێت لە لایەن خوداوەندی کەش (تیششووب)، ئەوا ئەم دیاردەیەی ئەفسانە خوریەکان بەهەمان شێوە لەلایەن شاعیری یۆنانی هزیوود رەنگی داوەتەوە، کە دەبینین

---

(٨٧) نیپوور شارێکە لە باشووری وڵاتی نێوان دوو رووبار بە مەڵبەندی پەرستنی خوداوەندی کەش (ئەنلیل)ی سۆمەری دادەنرا.خووریەکان بەم خوداوەندەیان گوتووە تیشووب.

کرۆنۆس دەبێتە مەلیکی ئاسمان دوای ئەوەی کە باوکی خۆی (ئۆرانۆس) لەم پۆستەی لادەبات. پاشان خوداوەند کرۆنۆس خۆیشی ئەم پۆستەی لە دەست دەدات و خوداوەندی کەشی یۆنانی (زیۆس) شوێنەکەی دەگرێتەوە.

ناتوانین چۆنییەتی گواستنەوەی ئەم ئەفسانە خوریانە بۆ لای یۆنانییەکان بزانین. بەڵام دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە سەرچاوەی ریوایەتەکەی هزیۆد لە ناوچەکانی ئاسیای بچووکە. لەلایەکی ترەوە ڕەنگە ئەم ئەفسانە خوریانە بۆلای یۆنانییەکان گواسترابنەوە لە ئەنجامی بوونی پەیوەندی شارستانییەتی نێوان یۆنانییەکان وفینیقییەکان.

دوو ئەفسانە هەیە کە هەردووکیان لەگەڵ یەکتری هاوشێوەن لە رووی بابەتەوە. ناوەڕۆکی ئەم دوو ئەفسانەیە باس لە هەوڵەکانی خوداوەند کومماربی دەکات بۆ هاتنەوەی جارێکی تر بۆ سەر عەرشی دەسەڵات و لابردنی خوداوەندی کەش (تیشووب) لە پۆستەکەی. یەکێك لەم دوو ئەفسانەیە بە ناونیشانی (خیدەممۆ)یە. بەداخەوە ئەم ئەفسانەیە بە شکاوی وپارچە پارچەیی بەدەستمان گەیشتووە. لە ناوەڕۆکی ئەم ئەفسانەیە دەردەکەوێت کە خوداوەند کومماربی لە کچی خوداوەندی دەریا کەناوی (شیرنەب شوورخی) واتە (کچە زەبەلاحەکە) منداڵێکیان دەبێت بەناوی خیدەممۆ. ئەم منداڵەش (خیدەممۆ) بەپێی ئەفسانەکە بریتییە لە ئەژدیهایەکی زۆر گەورە. خیدەممۆ بەشێوەیەکی نهێنی لە ناو شاراوگەیەك بەخێودەکرا. خیدەممۆ زۆر حەزی بەکاولکاری و تێکدان بووە. دوای ئەوەی کە خیدەممۆ گەورە دەبێت بەپێی ئەفسانەکە لەلایەن خوداوەند شاووشکا (عەشتار) دەبینرێت. خوداوەند شاووشکا (عەشتار) بە دیتنی خیدەممۆ زۆر دەترسێت و بەخێراییی دەچێتە لای براکەی (خوداوەند تیششووب) کە گەورەی هەموو خوداوەندەکان بوو. کاتێك خوداوەند شاووشکا (عەشتار) ئەم هەواڵەی بەبراکەی رادەگەیەنێت، ئەوا براکەی (خوداوەند تیشووب) لەناو گریان وفرمێسکی خۆیدا نوقم دەبێت بەهۆی پێ ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە ناخۆشە، هەروەك ئەفسانەکە ئاماژەی بۆ دەکات.

لە درێژەی ئەفسانەی خیدەممۆی ئەژدیها دەردەکەوێت کە خوداوەند ئەیا (خوداوەندی زیرەکی و دانایی) لەلایەن کۆمەڵگەی خوداوەندەکان شکایەت لەم کارە خراپەی خوداوەندەی کومماربی دەکات کە ناردنی خیدەممۆی ئەژدیها بوو. خوداوەند ئەیا هەڵدەستێت بە تۆمەتبار کردنی خوداوەند کومماربی بەوەی کە دەیەوێت مرۆڤایەتی لەسەر رووی زەوی نەهێڵێت و لەناویان ببات. ئەم کارەش زیانی بۆ خوداوەندەکان هەیە، چونکە بە لەناوبردنی مرۆڤەکان چیتر قوربانی پێشکەش بە خوداوەندەکان ناکرێت.

لەم بەشەی ئەفسانەی خیدەمۆ بۆمان دەردەکەوێت کە مەبەستی سەرەکی خوداوەند کومارببی لە دروستکردنی خیدەمۆی ئەژدیها بریتییە لە لەناوبردنی مرۆڤایەتی و نەهێشتنی، نەك هەوڵدان بۆ گەڕانەوەی جارێکی تری بۆ سەر عەرشی دەسەڵاتی خوداوەندەکان. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم ئەفسانە خوریە کاریگەری ئەو ئەفسانە سۆمەری و بابلیانەی لەسەرە کە باس لە هەوڵەکانی لەناوبردنی مرۆڤایەتی دەکات لەرێگەی خوداوەند ئەنلیل. واتە لە ئەفسانە سۆمەریەکان خوداوەند ئەنلیل بەم کارە هەڵستاوە بەڵام لە ئەفسانەی خوریەکان خوداوەند کومارببی شوێنی گرتۆتەوە. هەروەها ئەفسانە بابلیەکان لەبنەڕەتدا لە ئەفسانە سۆمەریەکان وەرگیراون و جارێکی تر لە لایەن بابلیەکان نووسراونەتەوە. ئەمەش بەشێوەیەکی ئاشکرا لە چیرۆکی تۆفانەکە(تۆفانی نوح پێغەمبەر د.خ) کە لەئەفسانەی گەلگامێش لە تابلۆی ژمارە یازدەی ئاماژەی پێکراوە، هەروەها لە ئەفسانەی ئەتراخاسیسی بابلی بەهەمان شێوە ئاماژەی پێکراوە.

لەکۆتایی ئەفسانەی خیدەمۆ (هەرچەندە تێکستەکە لێرەدا تووشی تێکچوون بووە)بۆمان دەردەکەوێت کە خوداوەندەکان توانیویانە بەسەر خیدەمۆی ئەژدیها زاڵبن. ئەمەش دوای ئەوەی کە خوداوەند شاووشکا ــ عەشتار خۆی رازاندەوە بە خشڵ و زێڕ و بە بۆن خۆشکردنی لاشەی توانی بەو هەموو جوانییەی خۆی خیدەمۆی ئەژدیهاك هەڵبخەڵەتێنێ و سەرنجی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و بەدوای خوداوەند شاووشکا بکەوێت وەك چۆن سەگێك بەدوای خاوەنەکەی دەکەوێت، هەروەك ئەفسانەکە ئاماژەی پێکردووە. بەم جۆرە خوداوەند شاووشکا توانی بە جوانییە سەرنج راکێشەکەی خیدەمۆی ئەژدیها لەناو دەریا دەربهێنێت و دواتر خوداوەندەکان بەسەری زاڵبوون و توانیان لەناوی ببەن.

ئەفسانەی دووەم کە بە سروودی (ئوللی کومی) ناسراوە بەهەمان شێوە باس لە هەولێکی تری خوداوەند کومارببی دەکات بۆ زاڵبوون بەسەر خوداوەندی کەش (تیششووب). لەئەفسانەکەدا هاتووە کە خوداوەند کومارببی هەڵدەستێت مەخلوقێك لە تاشەبەرد دروستدەکات. ئەم مەخلوقەش ناودەنێت بە ئوللی کومی (واتە : تێکدەری شاری کومی). شاری کومی شاری خوداوەندی تیششووب (کەش) بووە. خوداوەند کومارببی جارێکی تر لەگەڵ خوداوەندی دەریا رێکدەکەوێت بۆ ئەوەی ئەم مەخلووقە لەلای خۆی بەشێوەیەکی نهێنی بەخێویکات. بەپێی ئەفسانەکە ئەم مەخلوقە سەیرە لەسەر خوداوەند ئوبوللوری وەستاوە، خوداوەند ئوبوللوری ئاسمان و زەوی هەڵگرتبوو. دوای ئەوەی کە ئوللی کومی گەورە دەبێت و

لەناو دەریا دێتە دەرەوە خوداوەندی خۆر دەبینێت. خوداوەندی خۆر دەچێتە لای خوداوەند تیششووب ئەم هەواڵە ناخۆش و ترسناکەی پێ رادەگەیەنێت. هەروەك چۆن خوداوەند شاووشکا بەدیتنی خیدەمۆ تووشی ترسان دەبێت، بەهەمان شێوە خوداوەندی خۆر بەدیتنی خوداوەند ئوللی کومی توشی ترسان دەبێت و توانای جوولەی نامینێت. بەجۆرێك کە خوداوەندی خۆر ناتوانێت لە شوێنی تایبەتی خۆی لە کۆشکی خوداوەندی کەش (خوداوەند تیشووب) دابنیشێت وبخوات و بخواتەوە. خوداوەندی خۆر دوای ئەوەی کە ئەم بوونەوەرە ترسناکەی بینی نەیدەتوانی هیچ شتێك لە خۆشترین خواردن وخواردنەوە بخوات.

چۆنییەتی نووسینی ئەم ئەفسانەیە گرنگی تایبەتی و ئامانجی خۆی هەبووە. کە تیایدا وادەردەخات خوداوەندی تیششووب کرنگییەکی زۆر بە میوانان دەدات و خزمەتێکی چاکیان دەکات، بەجۆرێك کە خوداوەندی خۆر بەجێی دەهێڵێت بەبێ ئەوەی ئەم هەواڵە ترسناکەی پێ رابگەیەنێت. خوداوەند تیششووب هەست بەبوونی شەڕ خوازان دەکات، هەربۆ ئەم مەبەستەش خوداوندی تیشووب لەگەڵ براکەی خۆی خوداوەند تەشمیش بەخێرای دەچن بۆ چیای خەززی. ئینجا لەوێ ئەم مەخلوقە بەردینە لە ناو دەریا دەبینن، بۆیان دەردەکەوێت کە چەند ترسناکە.دوای دیتنی خوادوەند تیششووب بۆ ئەم دیمەنە، خەم دایدەگرێت.خوداوەند تیششووب نوقمی ناو فرمێسك وگریانی خۆی دەبێت هەروەك چۆن لە ئەفسانەی خدەمۆ توشی بوو.خوداوەند شاووشکا (عەشتار) دووبارە دەیەوێت بەجوانی لەشی ئەم بوونەوەرە بەردینە ترسێنەرە هەڵبخەڵەتێنێت، بەڵام ئەم مەخلووقە خۆی کوێر و لاڵ دەکات بۆیە خوداوەند شاووشکا لە هەوڵەکەی سەرکەوتوو نابێت. هەروەها دواتر خوداوەند تیششووب و هاورێکانی هەوڵیاندا کە ئەم مەخلوقە (ئوولی کومی) لەناوببەن ئەویش لە جەنگێکی کراوەی نێوان هەردوو لادا بەڵام لەم شەڕەیاندا لە دژی ئوللی کومی تووشی دۆڕان هاتن لەدوای دۆڕانی ئەم شەڕەش براکەی خوداوەندی کەش تووشی بێ ئومێدی دەبێت و دەڵێت : (چیتر لەئاسمان مەلیك نامینێت). بەڵام دواتر بە هاتنی خوداوەند ئەیا (خوداوەندی زیرەکی و دانایی) توانی گۆڕانکاری لەم بارودۆخە ناهەموارەی خوداوەندەکان بکات. سەرەتا خوداوەند ئەیا هەڵستا بە پشکنینی خوداوەند ئەبەللوری کە بینی ئەم مەخلوقە بەردینە لە شانی ڕاستەی گەشەی کردووە بۆیە خوداوەند ئەیا چووە لای خوداوەندە زۆر زۆر کۆنەکان (الآلهة الموغلة في القدم) داوای لێکردن کە ئەو داسەی پێبدەن کە لە کاتی خۆی لە چاخە زۆر کۆنەکاندا ئاسمان و زەویان پێ شەق کردووە و لەیەکتریان جیا کردۆتەوە. ئینجا خوداوەند ئەیا بەم داسە هەستا بە برینی

ئوللی کومی لە شوێنی شین بوونی، بەمەش توانی سەرچاوەی هێزەکەی لێ بسەنێت (هەروەك ئەوەی کە خوداوەند شاووشکا کردی لەگەڵ خیدەمۆ کە دوای ئەوەی توانی خیدەمۆ لەناو ئاو دەربهێنێت کە بەسەرچاوەی هێزەکەی دادەنرا)، ئینجا خوداوەندەکان توانیان لە دوای چەندین شەڕی یەك لەدوای یەك ئەم مەخلوقە بەردینە لەناوببەن و بەسەریدا زاڵبن.

خوریەکان باوەڕیان وابوو کە بەرد توانای زۆربوونی (منداڵ بوون) ی هەیە ئەمەش بەشێوەیەکی ئاشکرا لە ئەفسانەی ئوللی کومی دەردەکەوێت. ئەو بیروباوەڕەی کە لەئەفسانەی ئوللی کومی دا هەیە بریتییە لە توانای بەرد بۆ منداڵ بوون، ئەفسانەیەکی تریش هەیە کە بەشێوەیەکی ناتەواو بەدەستمان گەیشتووە کە تیایدا ئاماژە دەکات بەوەی کە خوداوەندی چیا (خوداوەند وەشیتتا)منداڵێکی بووە. ئەم جۆرە بۆچوونە لە بنەڕەتدا بۆ بیروباوەڕی سەرەتایی خوریەکان دەگەڕێتەوە.خوریەکان ئەم جۆرە بیروباوەڕەیان لەناوچەکانی بنەڕەتی خۆیان (ناوچە چیاییە کوردییەکان)هەبووە.

یەکێك لە بیروبۆچوونەکانی تری خوریەکان کە لەم ئەفسانانەدا ڕەنگی داوەتەوە کە تاکو ئێستا هاوشێوەی ئەم بیروباوەڕە لە نێوان بیروباوەرەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن نەبینراوە، بریتییە لە هەوڵدانی ئەو خوداوەندانەی کە لەسەر دەسەڵات لابردراون (هەروەك پێشتر لە ئەفسانەکان ئاماژەمان پێکرد) بۆ گەڕانەوەیان بۆ سەردەسەڵات جارێکی تر. بێگومان شوێنی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە بیرو باوەر و ئەفسانانە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەکانی کوردستانی سووریا. ئەمەش چونکە لەیەکێك لە ئەفسانەکانی لەم جۆرە باس لە چیای خەززی دەکات. هەروەك بەپێی ناوهێنانی چیای خەززی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەفسانەی ئوللی کومی لە ناوچەکانی کەنداوی ئەسکەندەرونەوە سەری هەڵداوە.

خوریە نیشتەجێبووەکانی کوردستانی سووریا بیروباوەریان وابووە کە هەردوو خوداوەندەی دەریا و خوداوەندی کەش دوژمنی یەکترن. لە ئەفسانە ئۆغاریتیەکان (لێرەدا مەبەستمان ئەو ئەفسانەیە کە لە ئۆغاریت دۆزراونەتەوە) جۆرە پەیوەندییەك هەیە لەنێوان خوداوەندی دەریا (یەم) خوداوەندی (ئیل) (خوداوەند ئیل لە ئۆغاریت هاوشێوەی خوداوەندی (کومماربی)یە لە ناوچە خوریەکان) ئەم پەیوەندییەی نێوان ئەم دوو خوداوەندەش بریتییە لە دوژمنایەتی هەردووکیان بۆ خوداوەندی بەعل. ــ خوداوەندی بەعل لەناوچەکانی ئۆغاریت بریتییە لە خوداوەندی کەش(تیششووب) ناوچە خوریەکان ــ. لە ئەفسانە ئۆغاریتییەکان ریزبەندی ئەو رووبارانە کراوە کە لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خوداوەندی دەریا دان. خوداوەندی دەریا

لەرێگەی ئەم رووبارانـەوە بەشـێوەیەکی نهێنـی دەچـێت بـۆ لای خوداوەنـد کومـاربی. ئەمـە هەرچەندە لە بیروباوەڕی ئایینی خوریەکان دەریا هیچ دەورێکـی نـەبووە بـەڵام رووبارەکـان بـە بەردەوامی بە چیاکانەوە پەیوەست کراون.

خوداوەند ئەیا بەپێی بیروباوەڕی سۆمەریەکان لە ناوچـەی ئـەبزۆ(واتـە : ئـاوی ژێـر زەوی) دەژیا. باسکردنی خوداوەند ئەیا بە خوداوەندی ژیـری و دانـایی لـە ئەفسانەی ئـوللی کـومی دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری شارستانییەتی وڵاتی دوو رووبار لە سەر شارسـتانییەتی خوریـەکان. بەڵام لە ئەفسانەی ئوللی کومی باس لە ئەبزۆ دەکات وەك شارێکی بزری نادیار. هۆی ئەمـەش دەگەڕێتەوە بۆ دژیەکی بیروباوەری سۆمەریەکان و خوریـەکانی کوردسـتانی سـووریا دەربـارەی خوداوەندی سەرچاوەکانی تایبەت بەدەریا و رووبارەکان.

فکرەی بوونی خوداوەنـدی دژ بـە خوداوەنـدی کـەش لـە رێگـەی ئەفسانەکانی باشـووری رۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ و بـاکووری سـووریا گواسـترایەوە نێـو ئەفسانە یۆنانییـەکان. ئەفسـانە یۆنانییەکان بەشێوازی جیاجیـا چـیرۆکی (تیفـون)ی زەبـەلاح دەگێڕنـەوە. کـە دەڵێـت تیفـون زیندەوەرێکی زەبەلاحە لەلایەن هەردوو خوداوەندی یۆنانی جیا و تەرتەرووس دروستکراوە بەڵام لە هەندێك ئەفسـانەی تری یۆنانییەکان دەڵێن کە ئـەم بوونـەوەرە لەلایـەن خوداوەنـد کرۆنـۆس درووستکراوە. تیفوون ترسێکی زۆری درووستکرد و تەهدیدی خوداوەند زیۆسـی دەکـرد، بـەڵام دواتر خوداوەند زیۆس توانی لەناوی ببات.

ئەفسانە خوریەکان کاریگەریـەکی زۆریـان هـەبووە لەسـەر بیروبـاوەڕی ئـایینی جوولەکـە بەجۆرێك کە کتێبی تەوراتی ئەمڕۆ کاریگەری ئەفسانە خوریەکانی بەشێوەیەکی ئاشکرا پێـوە دیارە. ئەمەش بەشێوەیەکی باشـتر دەردەکـەوێت لـە ئەفسـانەی(ئـەرمیلۆس ـــ Armilus) دوژمـنی پێغەمبەر مەسیح(د.خ). کـە شـەیتان هەڵدەسـتێت بەدروسـتکردنی ئـەرمیلۆس لـە پەیکەرێکی مەرمەری بۆ کچێکی زۆر جوان.

چیرۆکی پاڵەوان (کورب ئەرەنزەخ) لە بنەڕەتدا بۆ کەلەپووری کۆنی خوریەکان دەگەڕێتـەوە. ئەم چیرۆکە بەچەند بەش و پارچەی جیاجیا بەدەستمان گەیشتووە (واتە ئەو تابلۆیانەی کە ئـەم چیرۆکەیان لەسەر نووسرابوو تووشی شکان وپارچە پارچەبوون بووە). هەر لەبەر ئەمـەش ناتوانین بەشـێوەیەکی تـەواو چـۆنییەتی رووداوەکـان و بەلگـەکانی نـاو ئەفسـانەکە روونبکەینـەوە. رووداوەکانی ئەم ئەفسـانەیە لـە شـاری (ئەکـەد)ە. ئـەم شـارە لەلایـەن دانیـشتوانی دەوڵەتـە خوریەکان بە مـەڵبەندێکی سیاسی و شارستانی دادەنرا. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە شاری ئەکەد

لە بنەڕەتدا پایتەختی مەملەکەتی ئەکەدی بووە. مەسەلەی دیاریکردنی رووباری دیجلە یەکێکە لەو بابەتانەی کە گفتوگۆ و موناقەشەیەکی زۆری لەسەرکراوە لە ئەفسانەکەدا. رووباری دیجلە لەلای خوریەکان پێی دەگوترا ئەرەنزەخ[88] بەڵام رووباری فورات هەر بەناوە کۆنەکەی خۆی (پوراتۆم)ناودەبرا. ئەو ئەفسانانەی کە لەبنەرەتدا خورین ئەوا بەجۆرێك لەجۆرەکان پیشەی ڕاوکردن دەورێکی باڵا لەڕووداوەکانیدا دەبینێت. ئەمەش لە ئەفسانەی ئەرەنزەخ رەنگ دەداتەوە کە پاڵەوانی ئەم ئەفسانەیە راوچی بووە. لە ئەفسانەکەدا باسدەکات کە ئەم پاڵەوانە توانی ئاژەڵێکی کێوی و دڕندە بکوژێت، هەروەها لە پێشبرکێیەکی تیر هاوێشتن زۆر شارەزاو کارامە بەدەرکەوتووە.

دانەیەکی تر لە چیرۆکی خوریەکان لە شاری خاتووشا دۆزراوەتەوە. رووداوەکانی ئەم چیرۆکە لەسەر ١٤ تابلۆ (تاتە قوڕ) تۆمارکرابوو. ئەم چیرۆکەش بە چیرۆکی (کیششی راوچی) ناودەبرێت. ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە باس لە ڕاوچیەك دەکات کە ناوی کیششی بووە کە هەڵدەستێت بەخواستنی کچێکی جوان بەناوی (مینی) یان (شەنتالی مینی). ئەم خێزانەی جموجۆڵەکانی کیششی زۆر سنووردارکرد بەجۆرێك کە کیششی نەیتوانی ئەرکەکانی خۆی بەرامبەر بەخوداوەندەکان وەك جاران جێبەجێ بکات. نەیتوانی وەك جاران نان و ئارەق پێشکەش بە خوداوەندەکان بکات و چیتر بۆ ڕاوکردن نەچووە چیا. لەکۆتایی ئەفسانەکە بۆمان دەردەکەوێت کە ئاگادارکردنەوە یەك لەدوا یەکەکانی دایکی هانی کیششی دەدات بۆ ئەوەی بچێتە چیاو دڕندەیەك راوبکات، بەڵام هیچ نێچیرەکی تووش نابێت بۆ ئەوەی ڕاوی بکات. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خوداوەندەکان لێی توڕەبوون. بەدەست نەکەوتنی نێچیرەك بۆ ڕاوکردن کیشی ڕاوچی زۆر بێزارکرد، بەجۆرێك تووشی برسێتی بوو وپێش ئەوەی کیششی لەبرسان بمرێت خوداوەندی باوکایەتی (الألوهیة الأبویة) بەزەیی پێدادێتەوە و رزگاری دەکات لەمردن. پاشان چیرۆکەکە باس لە زنجیرەیەك خەونی کیششی دەکات کە لەلایەن دایکی بۆی تەفسیر دەکرێت. بەشێك لە خەونەکان پەیوەندی بە ڕاو هەیە، هەرلەبەر ئەمەشە کە چیرۆکی کیششی بە چیرۆکی ڕاوچییەکان یان ئەفسانەی ڕاوچییەکان دادەنرێت.لە یەکێك لە پارچە شکاوەکانی دانە خوریەکەی تایبەت بەم چیرۆکە ناوی هەردوو خوداوەند کومماربی و ئەیا (شەرری) هاتووە. بەڵام دەوری ئەم دوو خوداوەندە لە ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکە دیارو روون نییە.

---

(٨٨) رووباری دیجلە لە سەرچاوە ئەکەدیەکان بە Idiglat و رووباری فورات بە Purattum ناودەبرێت.

سەرەڕای ئەوەی کە مرۆڤەکان لەرێگەی ئەم ئەفسانانەوە وەڵامی پرسیارەکانیان دەدرایەوە کە پەیوەندی هەبووە بە چۆنییەتی دروستبوونی گەردوون و خوداوەندەکان و مرۆڤەکان.....هتد. ئەوا لەهەمان کاتدا ئەفسانەکان پەیوەندی رۆژانەی نێوان مرۆڤەکان و خوداوەندەکان پتەو تردەکات، ئەویش لەرێگەی جێبەجێکردنی پرەنسیپە ئایینییەکانی رۆژانەی مرۆڤەکان بۆ خوداوەندەکان ئەویش بە خوێندنەوەی ئەم ئەفسانانە و پێشکەشکردنی قوربانی بۆ خوداوەندەکان لە لایەن مرۆڤەکانەوە.

کەسایەتی خوداوەندەکان لە ئایینی خوریەکان و هەموو ئایینەکانی تری رۆژهەڵاتی کۆن بەوە دیاریدەکرێت کە خوداوەندەکان بە پێچەوانەی مرۆڤەکان پێداویستیەکانی خۆیان لە خواردن و خواردنەوە و جل وبەرگ بۆخۆیان دابیناکەن، بەڵکو لەلایەن مرۆڤەکانەوە بۆیان دابیندەکرێت. هەر لەبەر ئەم هۆیەش خوداوەندەکان مرۆڤەکانیان درووستکردوە، ئەمەش بۆ ئەوەی کە پێداویستییەکانیان بۆ دابینبکەن و خزمەتیان بکەن.

ئەفسانەی ئەتراخاسیس ئەفسانەیەکی بابلییە. ئەم ئەفسانەیە لە بنەڕەتدا ئەفسانەیەکی سۆمەرییە کە بە ناوی زیۆسیدرا (زیوسیدرا واتە : پیاوە تەمەن درێژەکە کە مەبەستی نوح پێغەمبەرە کە هەروەك دەزانین بۆماوەیەکی زۆر ژیاوە) (*) ناسراوە. ئەم ئەفسانەیە باس لە چیرۆکی لافاوەکەی نووح پێغەمبەردەکات. ئەم ئەفسانەیەش لەلایەن خوریەکانی بەشی رۆژئاوا ناسراو بووە. لە ناوەڕۆکی ئەفسانەکە بۆمان دەردەکەوێت کەهۆی دروستکردنی مرۆڤ لەلایەن خووداوەندەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووی خوداوەندەکان بۆ درووستکردنی زیندەوەرێك بۆ ئەوەی خزمەتی خوداوەندەکان بکات و خوداوەندەکان لە کارکردن دوور بخاتەوە. چونکە هەروەك لە ئەفسانەکە بۆمان دەردەکەوێت لە پێش دروستکردنی مرۆڤەکان خوداوەندەکان خۆیان خزمەتی خۆیان کردووە. بەدروستکردنی مرۆڤ خوداوەندەکان چیتر کاریان نەکرد، بەڵکو مرۆڤیان لەسەر زەوی دانا بۆ ئەوە خزمەتی خوداوەندەکان بکات و پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکات. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤەکان لەژێر فەرمانی خوداوەندەکان کاریان دەکرد، هەروەك چۆن کرێکار لە ژێر فەرمانی گەورەکەی کاردەکات. ئەم دەربڕینەش لە تێکستێکی تری حیسییەکان

---

(*) نوح ئەو پێغەمبەرەیە کە لە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکراوەو بەڵام لە تێکستە سۆمەریەکان بەناوی (زیۆ سیدرا)لە تێکستە بابلیەکان بەناوی (ئەترا خاسیس)ناسراوە. زیۆسیدا ووشەیەکی سۆمەریە بە واتای ــ پیاوە تەمەن درێژەکە ــ دێت.

ئاماژەی پێکراوە. بەم پێیەش لەسەر مرۆڤەکان فەرز بوو کە هەموو شتێك بکەن لە پێناو بەدیهێنان و دابینکردنی ژیانێکی باش وخۆشگوزەران بۆ خوداوەندەکان. بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە مرۆڤەکان چیتر خوداوەندەکانیان نەپەرستن و قوربانیان بۆ پێشکەش نەکردن، ئەوا لەوکاتە خوداوەندەکان دەبێت خۆیان بۆ خۆیان خواردن و خواردنەوە دابینبکەن کە ئەمەش زیان بە سەرکردایەتی ڕەهای خوداوەندەکان دەگەیەنێت ئەو کاتە خوداوەندەکان تووشی توورەبوون دەبن لە مرۆڤەکان و کارەساتی جۆراوجۆریان بەسەردا دەهێنن. ئەفسانەی ئەتراخاسیس هەوڵدەدات ئەم خاڵە بخاتە ڕوو واتە هەوڵ دەدات مرۆڤەکان ئاگادار بکاتەوە کە بەهیچ شێوەیەك نابێت خوداوەندەکانیان فەرامۆش بکەن، ئەگەر نا کارەساتی لافاوەکەی سەردەمی ئەتراخاسیس جارێکی تر بەشێوەیەك لە شێوەکان دووبارە دەبێتەوە و مرۆڤەکان تووشی لەناوچوون دەکات.

ئەفسانەی خیدەمۆ کە ئەفسانەیەکی خورییە و پێشتر ئاماژەمان پێکردووە زۆر کاریگەری بیروبۆچوونی بابلیەکانی پێوە دیارە.لە بەشێکی ئەفسانەی خیدەمۆ هەندێك وشە ئاراستەی خووداوەندەکان دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

﴿واپێدەچێت کە مرۆڤەکان چیتر خوداوەندەکانیان ناپەرستن و ئاهەنگیان بۆ ناگێڕن هیچ کەسێکیان قوربانی و نان وخواردن وخواردنەوە پێشکەش بەخوداوەندەکانیان نەکردووە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوداوەندی شاری کەش و مەلیکی شاری کومیای بەرز و بەڕێز خۆی داس هەلبگرێت دەست بەکارکردن بکات، خوداوەند شاووشکا و خیپات خۆیان بەردی دەستار هەڵبسوڕێنن. ﴾.

پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان و خوداوەندەکان بریتییە لە پەیوەندی بەخشین و وەرگرتن. واتە مرۆڤەکان خواردن و خواردنەوە (قوربانی)پێشکەش بە خوداوەندەکان دەکەن. پێشکەش کردنی ئەم قوربانییەش لە شێوەی مەراسیمێکی ورد و ڕێکوپێکدا ڕێکدەخرێت کە تیادا بەرهەمەکان(قوربانییەکان) پێشکەش بە خوداوەندەکان دەکرا. ئامانج لە ئەنجامدانی ئەمەش دوورکەوتنەوەیە لە توڕەبوونی خوداوەندەکان. ڕێکخستن وجێگیرکردنی ئەم کارەش لە سێ خاڵدا دەردەکەوێت کە ئەمانەن:

١- دیاریکردنی کاتی دیاریکراو بۆ ئەنجامدانی مەراسیمە ئایینەکان.

٢- دووبارە ئەنجامدانەوەی مەراسیمە ئایینەکان لەکاتی خۆی لە هەر ساڵێکدا.

٣- دیاریکرنی مەراسیمە ئایینەکان لە چواچێوەی ساڵنامەیەکی ئاینی گشتی.

تاكو ئێستا هیچ بەڵگەیەكی وامان لە بەردەستدا نییە سەبارەت بەئەنجامدانی مەراسیمە ئایینەكان لە ناوچە خوریەكان بەشێوازێكی جیاواز لە مەراسیمە ئایینەكانی رۆژهەڵاتی كۆن. بەڵام لەلایەكی ترەوە ئەگەری ئەوە هەیە كە مەراسیمە ئایینەكان لە رووی چۆنییەتی ئەنجامدان و كاتی ئەنجامدانەكەی لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی تر بەشێوازێكی جیاواز ئەنجام درابێت. هەربۆیەش ناتوانین دووبارە چۆنییەتی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم مەراسیمە ئایینیانە جارێكی تر دیاریبكەین. بەڵام ئەگەر لە داهاتوو بەڵگەنامەی تەواو لەپەرستگا ئایینەكان سەبارەت بەو مەراسیمە ئایینیانە دۆزرایەوە ئەوكات بێگومان دەتوانین بەشێوەیەكی تەواو روونیان بكەینەوە. تاكو ئێستا بەڵگەنامەی تایبەت بەو مەراسیمە ئایینیانە لە شاری خاتووشا نەبێت لە هیچ شوێنێكی تر نەدۆزراوەتەوە. ئەم بەڵگەنامانەش سنووردارن. هەربۆیەش هیچ رێگەیەكی ترمان لەبەردەستدانییە تەنها هەوڵدان نەبێت بۆ كۆكردنەوەی زانیاریە پچرپچرەكان لەناوچە شوێنەواریەكان لەرێگەی هەلكۆڵینە شوێنەواریەكانەوە.

لە كۆندا بەشێوەیەكی رۆژانە قوربانی پێشكەش بە خوداوەندی سەرەكی شار یان مەملەكەت دەكرا. بڕی ئەم قوربانییەش جۆراوجۆربوو و لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی تر جیاواز بووە. بڕی قوربانی رۆژانەی پێشكەش كراو بۆ خوداوەند لە شاری خاتووشا بریتی بوو لە پارچەنانێك. بەڵام بەپێی لیستێكی نووسراوی شاری نوزی دەردەكەوێت كە بڕی ئەم قوربانییە لە شاری نووزی بریتی بووە لە برێك ئارد كە پێشكەش بەخوداوەند شاووشكا كراوە. ئەم بڕە ئاردەی كەپێشكەش بەخوداوەند شاووشكا ـــ عەشتار ـــ كراوە لەشاری نووزی بەشی دوو رۆژی كردووە. پێشكەشكردنی ئارد وەك قوربانی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە دانەوێلەش وەك قوربانی پێشكەش بە پەرستگا كراوە. بەڵام لە شاری ئارابخا لە یەكەم رۆژی هەر مانگێك ئاهەنگێكی ئایینی ئەنجامدەدرا. ئەو ئاهەنگەش بەناوی ئەو مانگە ناودەبرا كەتیایدا ئەنجامدەدرا، بۆنموونە وەك ئاهەنگی مانگەكانی كینونو، ئاهەنگی میترونینی، ئاهەنگی شێخەلی... هتد.[٨٩]

یەكێك لە تێكستە مێخییە نووسراوەكان، ناوەڕۆكەكەی باس لە گرێبەستێكی نێوان پەرستگا و ئافرەتێك دەكات. ئەم ئافرەتە پاككەرەوەی ناو ساحەی پەرستگا بووە. كە تیایدا لەم تێكستەدا بۆمان دەردەكەوێت كە گرێبەستی پەرستگا لەگەڵ ئافرەت بۆ مەبەستی شۆردن و پاككردنەوەی ساحەی ناو پەرستگا بووە، كە هۆیەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە لە (١٥) ی مانگ ئاهەنگێك

---

(٨٩) ئەمانەش ناوی هەندێك مانگەكانن لە شاری ئارابخا و ناوچەكانی دەوروبەری. ناوی مانگەكان بەپێی سەردەمەكان لە رۆژهەلاتی كۆندا، بەپێی شوێنی جوگرافی و زمانەكان دەگۆرێت

لەناو پەرستگا ئەنجامدەدرا. ئەم ئاهەنگەش بەبۆنەی پاككردنەوەی پەرستگای خوداوەند شاووشـكا ــ عەشتاری نەینەوا لە شاری ئارابخا ئەنجامدەدرا. ئەم ئاهەنگەش لە هەردوو ڕۆژی یەكی مانگ و پانزەی مانگ ئەنجامدەدرا. لە شاری ئالالاخ بەهەمان شـێوە ئاهـەنگی مانگانـە دەگێـڕدرا. ئـەو ئاهەنگانەی كە لە ئالالاخ ئەنجامدەدرا تارادەیەك هەمان ناوی ئەو ئاهەنگانـەیان هـەبوو كـە لـە ئارابخا بەئەنجام دەگەیەنرا، وەك ڕۆژی ئاهەنگی مانگی خەیاری. لەگشت ناوچە خوریەكان ئاهەنگی سالانە ئەنجامدەدرا. بەلام بێجگە لە خاتوشا لەهیچ ناوچەیەكی تر تێكستی نووسراو نەدۆزراوەتـەوە كە باس لە ڕێورەسمی چۆنییەتی ئەنجامدانی ئەم جۆرە ئاهەنگانـە بكـات. لەسـەر دوو تـابلۆدا كـە بەشێكی بەزمانی خـوری نووسـراوەتەوە بـاس لـە ئاهـەنگی وەرزی زسـتان دەكـات. كـە تیایـدا دەردەكەوێت ئەم ئاهەنگە بۆماوەی (٤) ڕۆژ بەردەوام بووە. ئەم ئاهەنگەش بۆ خوداوەند شاووشـكا ــ عەشتاری نەینەوا تەرخانكرابوو.

ئاهەنگێكی تری گەورەی خوریەكان هەیە(بەداخەوە تاكوئێستا نازانین كە ئـەم ئاهەنگـە بـە چ بۆنەیەكەوە ئەنجامدراوە) كە جارێكی تر سەر لەنوێ بەفەرمانی شاژنی حیسی(بـودو ــ خیپـا)لـە دەوروبەری (١٢٥٠ پ. ز) لە خاتووشا نووسراوەتەوە. نوسخە ئەسلییەكەی ئەو تێكستەی كە باس لەم ئاهەنگە دەكات بەفەرمانی شاژن لەولاتی كیزۆفەتناوە بۆ خاتووشا هێنرابوو. ئەو تابلۆیانەی كە چۆنییەتی ئەنجامدانی ڕێوڕەسمەكانی ئەم ئاهەنگەیان لەسەر نووسرابوو بەفەرمانی شاژن شـێوازێكی تری نوێیان لەخۆ گرتبوو. ئەمەش وایكرد كە ئەم ئاهەنگە جارێكیتر لەسـەر (١٢) تـابلۆی قـوڕین بنووسرێتەوە. هەرتابلۆیەكیش بۆ (٦) ستوون بەشكرابوو. ئەم ئاهەنگەش بەئاهەنگی خیشووا یـان تیششووا ناسراوە. وادیارە ئەم ئاهەنگەش لەبنەڕەتـدا پەیوەنـدی بـە شـاری تیششـووا هەیـە كـە دەكەوێتە ڕۆژهەلاتی ئەنادۆل. بـەلام لەبنەڕەتـدا ئەسـلی ئاهەنگەكـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ناوچـەكانی كوردستانی سووریا.كە تیایدا گواستراوەتەوە بۆ ولاتی كیزۆفەتنا.

ناوی هەندێك شوێن لە تێكستە مێخییەكانی تایبەت بەم ئاهەنگـەدا هـاتووە وەك : ڕوویـاری بوورەننا یان ڕووباری بەرەننا، چیای ئەدەللور، خوداوەند لیلووری. هـەروەها ئـەم ناوانـە بەهـەمان شێوە لە ڕاپۆڕتەكەی مەلیك خاتووشیلی یەكەمدا هاتووە كاتێك باس لە دووبارە گەڕانەوەی شـاری خەششۆ بۆ ژێردەسەلاتی خۆی دەكات. ئەم ڕاپۆڕتەش بەزمانی حیسی نووسـراوەتەوە بێجگـە لـە هەندێك بەشی نەبێت كە بەزمانی خوری نووسـراوەتەوە. ناتوانین تەئكید لەسەر ئەوە بكەین كە ئایا دانە ئەسلییەكەی كیزۆفەتنا بەشی هەرە زۆری بەزمانی حیسی نووسراوەتەوە یان دواتر لەپایتەختی حیسییەكان خاتووشا تێكستەكانی ئەم ئاهەنگە لـەزمانی خوریـەوە وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی

حیسییەکان، یان ڕێوڕەسمەکانی تایبەت بەم ئاهەنگـە پـێش ئەمـە نەنووسـراوەتەوە بـەڵکو تـەنها بەشێوەیەکی زارەکی بووە، دواتر بۆ یەکـەم جـار لەشـاری خاتووشـشا نووسـراوەتەوە؟!. هـەروەها هەندێك گومان دەبەن کە ئەم ئاهەنگـە سـەرەتا بەشـێوەیەکی زارەکـی بووبێـت، دەڵـێن لەچـەند برگەیەکی حیسی زیاتر هیچی تری لەخۆ نەگرتووە. ئەمەی خوارەوەش بەشێکە لە تابلۆی پێنجەمی تایبەت بەئاهەنگی خیششوا (٩٠) :

﴿...... دواتر مەلیك لەپەرستگای خوداوەند ئیشخارا دێتە دەرەوە و بەرەو پەرستگای خوداوەند ئاللانی دەچێت، هەروەك چۆن مەلیك باڵندەیەك لە جۆری ئەمبەششی و بزنێك لەجۆری کیلدی کرد بە قوربانی بۆ خوداوەند ئیشخارا، ئەوا بەهەمان شێوە باڵندەیەك لەجۆری ئەمبەششی و بزنێك لە جـۆری کیلدی دەکاتە قوربانی بۆ خوداوەند ئاللانی. بەوشێوەیەی کە هەموو شتێك ئامادەکرابوو، ئافرەتێك لە چینی تەبرییا ئاو لەگەڵ برنج لە پێش خوداوەندەکان دەرێژێت. بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە لەم چینەدا نەبوو ئەوا کاهنی تایبەت بە خوداوەند ئەم کارە لەجیاتی ئافرەتەکە بەشـەنجام دەگەیـەنێت. پاشـان مـەلیك بەهەمان شێوەی پێشوو خوێنی بزنێکی تازە سەربڕاو وەك قوربانی پێشکەش بەخوداوەندەکان دەکات. هەر لەوێشەوە مەلیك هەڵدەستێت بەشکاندنی نانی ڕۆژانەی خوداوەند (کەککەری)کـە لـە دانەوێڵـەی وردکراو دروستکراوە، مەلیك نانەکە پارچە پارچە دەکات، بەجۆرێك کە قەبارەی هـەر پارچـەیەك نیـو (ئوبنی) بێت، پاشان گۆزەیەك دێنن کە پڕیەتی لە ئارەق، ئینجـا دووکاسـەی زیـوی لێ پردەکـەن لـە ئارەق بۆخوداوەند ئاللانی، هەروەك کاسەیەکی زیـوی تریـشی لێ پردەکـەن لـە ئـارەق بـۆ خوداوەنـد کورری، کاسەیەکی تری زیویش بۆ خوداوەنـد ئیـشووی، هـەروەها کاسـەیەکی زیـویش بـۆ هـەردوو خوداوەند خوتینا وخوتیللوررا. پاشان دوای ئەمە کاهنێك هەڵدەستێت بـە ڕژانـدنی برێـك ئـارەق لـە قاپێکی زیوینەوە، لەدوای ئەویش مەلیك هەڵدەستێت بە ڕژاندنی ئـارەق لـە دوو قـاپی زێـڕ. پاشـان مەلیك لەدوای ئەمانە لەپەرستگای خوداوەند ئاللانی دەردەچێت و بەرەو پەرستگای خوداوەند نوتیـك بیبیتخی بەرێدەکەوێت لەوێش بەهەمان شێوە.............. ﴾.

لەم برگەیەی تایبەت بەم ئاهەنگە بۆمان دەردەکەوێت کـە لـە پەرسـتگای هـەر خوداوەنـدێك سەرەرای پەرستنی خوداوەندی سەرەکی چەندین خوداوەنـدی تـری مامناوەنـدی دەپەرسـتران. ئـەم

(٩٠) لەنێوان تێکستەکانی مێخییە ئەکەدییەکانی ناوچەی ئیمار (گردی مەسکەنە) هەندێك تێکستی مێخی هەیە کە باس لە ڕێوڕەسم و ئاهەنگێکی تایبەت دەکەن، رەنگە هاوشێوەی ئەم ئاهەنگانە لە نێوان تێکستە مێخییە خوورییەکان وحیسییەکانی ناوچەی ئیمار هەبێت، کە تاکو ئێستا بڵاونەکراونەتەوە.

خوداوەندە مامناوەندیانەش بەجۆرێك لە جۆرەكـان پەیوەندییـەكیان لەگـەڵ خوداوەنـدی سـەرەكی پەرستگاكە هەبووە، جا چ پەیوەندی خزمایەتی یان ڕەچەڵەك یان هاوبەش بـوون لـەو ئەركـەی كـە هەیان بووە یان ئەو شتەی كەلێی بەرپرسراو بوونـە. هەرئەمـەش بووەتـە هـۆی كۆكردنـەوەیان لـە پەرستگاكە.

لەرێوڕەسمەكانی تایبەت بە پەرستنی خوداوەند تیششوب لە شاری حەلەب(ئەم خوداوەنـدە لـە وڵاتی كیزۆفەتنا زۆر گرنگی پێدراوە، پاشان لەوێشەوە گواسترایەوە بۆ شاری خاتوشـای پایتـەختی مەملەكەتی حیسییەكان) بۆمان دەردەكەوێت قوربانی پێشكەش بەهەموو خوداوەنـدە گرنگـەكانی پانسیۆنی خوریەكان كراوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە قوربانی پێشكەش بەشێوە ناوەخۆییەكانی تری خوداوەند تیششوب و دیاردەكانی و نازناوەكانی خوداوەند تیـشوب كـراوە. بەشـێوەیەكی گـشتی پێشكەش كردنی قوربانی بۆ ئەمانـە لـە ریزبەنـدێكی یەكگرتوانـە كـە بـە (كـەللووتی) نـاودەبرا ئەنجامـدەدرا. سـەرەڕای ئـەوەی كـە هەنـدێك جیـاوازی سـادە هـەبوو لـەنێوان ریزبەنـدەكانی پێشكەشكردنی قوربانی بۆ نازناو سیفەتەكانی خوداوەند تیشووب. هەرچی خوداوەنـدە ئافرەتـەكان بوون ئەوا بەپێی ریزبەندی كەللووتی رێكخرابوون. كە بەپێی ئەم ریزبەندییە خوداوەنـد خیپـات بـە پێوانەیەك دادەنرا بۆ ریزبەندكردنی خوداوەندەكانی تر.

لیستی ریزبەندی كەللووتی تەنها تایبەت نەبووە بە هەردوو خوداوەنـد تیشـشووب و خیپـات، بەڵكو رێوڕەسمی پێشكەشكردنی قوربانی بۆ هەندێك خوداوەندی تریشی لەخۆگرتبوو وەك خوداوەند شاووشكای تایبەت بەكێلگەكان (شاووشكا الحقل) لە شاری شاموخا. ئەمەش بەشێوەیەكی گـشتی بریتییە لە دەربڕینێكی تایبەت بەیەكگرتنێكی رەهای هەموو پەرستراوەكانی مەملەكـەتی حیـسی لەكاتێكی دیاریكراودا. ئەمەش ڕەنگدانەوەی كاریگەری بیروباوەڕی ئایینی خوریەكانی پێوە دیارە.

لای خوریەكان پەرستن تەنها بریتی نەبووە لە پێشكەشكردنی خواردن و خواردنەوە بەڵكو چـەند لایەنێكی تریشی گرتۆتەوە. وەك چەوركردنی پەیكەری خوداوەندەكان بـەزەیت لـە چـەند كـاتێكی دیاریكراودا. ئەمەش لە لیستەكانی تایبەت بە بەكارهێنانی زەیت لە ژمارەیەك لە شارەكانی وڵاتی ئارابخا دەردەكەوێت.

لەم برگەیەی تایبەت بەئاهەنگی خیششوا بۆمان دەردەكەوێت كە لەچوارچێوەی ئەم ئاهەنگـە ئایینییە قوربانی بۆ پاككردنەوەی ڕۆح پێشكەشكراوە، ئەم جۆرە قوربانییـەش بـە (ئومبەشـشی و كیلدی) ناسراوە كە بەمانای پاككردنەوەی رۆح دێت. ئامانج لە ئەنجامـدانی ئـەم جـۆرە قوربانییـە بریتییە لە دووبارە پاك كردنەوەی پەیكەری خوداوەندەكان.

شتێکی نامۆ نییە کە لـە تێکـستە مێخییـەکان ڕێنمـایی تایبـەتی هـەبێت بـۆ چـۆنییەتی بەکارهێنانی کەلوپەلە مۆسیقاییەکان و ئەودەنگەی کەلێیانەوە دەردەچـن. بـەڵام ئەمانـە لـەڕووی گرنگیانەوە بۆ ڕێورەسمە ئایینەکان تاکو ئێستا بەشێوەیەکی تەواو دیراسەت و لێکۆڵینەوەی لەسـەر نەکراوە. هەندێك لەو سروودە ئایینە خوریانەی کە لە ئۆغاریت دۆزراونەتەوە زانیاری تێدا هـاتووە دەربارەی ئەو ئامێرە مۆسیقاییانەی کە لـەکاتی ئەنجامـدانی ڕێورەسمـە ئایینـەکان بەکارهاتوونـە. ئەمەش تاکو ئێستا بەکۆنترین بەڵگـەی نووسـراوە دادەنرێـت لەسـەر نووسـینەوە و بـوونی پارچـە مۆسـیقاییەکان (نۆتە). سەرەڕای برینی چەند قۆناغێکی گرنگ بۆ شیکردنەوەی ئـەم تێکـستانە و نووسراوە مۆسیقاییەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لایەنی هەر نەتوانراوە بەشێوەیەکی تەئکید شیبکرێتەوە. گرنگترین شوێن بۆ پەرستنی پەرستراوەکان بریتی بـوو لـە پەرسـتگا، کـە بـەزمانی خـووری پێـی دەگـوترا (بـورلی یـان بـورولی). لـە نـاو سـاحەی سـەرەکی پەرسـتگا پەیکـەری خوداوەندەکانیان دادەنا. ئەو پەرستگایانەی کە شوێنەوارناسەکان لە ناوچە خوریەکان دۆزیویانەتەوە هیچ تایبەتمەندییەکی بیناسازی تایبەت بەپەرستگای خوریەکانی تێدا بەدەرناکەوێت، تاکو بتـوانین بە یەکێك لە جیاکەرەوکانی تایبەت بەپەرستگای خوریەکانی لەقەڵەم بدەین. زۆربەی کات نموونـەی ناوەخۆیی جیاجیا هەیە بەپێی ناوچەکان. پەرستگای نووزی لەو جۆرە پەرستگایانەیە کە بەتەوەرەی چەماوە (المعبد ذي المحور المنكسر) ناودەبرێت. نموونەی ئەم جۆرە پەرستگایانەش لە ماوەی هەزارەی سێهەمی پێش زاین لە وڵاتی دوو ڕووبار (میزۆپۆتامیا) زۆر باوبووە. بەڵام لـە ئـالالاخ لـە چـینی چوارەم پەرستگاکەی لەو جۆرەیە کە بە پەرستگای باکووری سووریا(کوردستانی سووریا) ناسـراوە. ئەم جۆرە پەرستگایەش پێکدێت لە : بوونی هۆڵێکی گەورە لە بەشی پێشەوەی پەرستگاکە و پاشان مەمەرێك دێت کە بەرامبەر بە ساحەکەیە و دوای ئەمـەش ساحەی سـەرەکی پەرسـتگاکە دێـت و دواتر میحرابی خوداوەند دێت کە دەکەوێتە ئەو دیـوارەی کـە لەپێـشەوەی سـاحەکە دایـە. لـەناو پەرستگا شوێنێك هەبوو کە پێی دەوترا (خەمرۆ) کە ئەم شوێنەش دەورێکـی گرنگـی دەگێـڕا لـە ئەنجامدانی ڕێورەسمە ئایینەکانی تایبەت بەخوداوەند تیششوب. ئەم شوێنەش لە تێکستە مێخییە نووسراوەکانی نشینگە کۆنـەکانی بازرگانـە ئاشـوورییەکان لـە وڵاتـی ئاسـیای بـچووك ئامـاژەی پێکراوە.دواتر لە گشت ناوچەکانی خوریـەکان بەدەرکـەوتووە. پاشـان ئەمـە لـەڕێی خوریەکانـەوە گواستراوەتەوە بۆ وڵاتی بابل.[٩١] هەروەها ئاماژە بەنموونەی بەرجەستەی ئەمە دەکرێت لەنێوان ئەو

---

(٩١) لە تێکستەکانی ناوچەی گردی لەیلان (تل ليلان) کە ناوە کۆنەکەی (شەخنا ــ شوبەت ئینلیل) زیاتر

شتومەکانەی کە خاتووشیلی یەکەم لەکاتی داگیرکردنی شاری خەششوو بەتاڵانی برد و گواستییەوە بۆ پایتەختەکەی (خاتووشا).لە یەکێك لە تێکستەکانی نووزی باس لە باخچەیەکی بچووکی پیرۆز دەکرێت، کە تیایدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە هەندێك بۆنەی تایبەتی پەیکەری خوداوەندەکانیان بۆ ئەم باخچەیە دەبرد. ئەم جۆرە مەراسیمە بۆ ماوەیەکی زۆر لە وڵاتی ئاشوور باوبووە. هەروەها بەهەمان شێوە سەرچاوە حیسییەکان ئاماژیان بە بوونی ئەم جۆرە باخچانە کردووە.

ئەو کۆمەڵە تاوێرانەی کە لە ناوچەی یازیلی کایا لەنزیك خاتووشای پایتەختی حیسییەکان دۆزرایەوە بە پاشماوەی پەرستگایەکی تایبەتمەند و قەشەنگ دادەنرێت. ئەم تاوێرانە نووسینی مێخی لەسەر کراوە و ئێستا ئەمانە دەکەونە کوردستانی توورکیا. ئەم پەرستگایە لەسەردەمی مەلیك توتخالیای چوارەم بووە لەکۆتاییەکانی سەدەی (١٣ پ.ز). پەرستگاکە (٣) ژووری گەورەی هەیە کە لەناو تاوێرەکان هەڵکەندراون ئەم ژوورانە بەشێوەیەکی ستوونی لە دیوی ژوورەوە هەڵکەندراون. لەسەر دیواری ئەم ژوورانە بەشێوەی دوو شەریتی درێژ وێنەی خوداوەندەکان هەڵکەندراون. لەلای چەپی دیوارەکە وێنەی خوداوەندە نێرەکان (پیاوەکان) هەڵکەندراون بەڵام لەلای ڕاست وێنەی خوداوەندە مێیەکان(ئافرەتەکان) هەڵکەندراون. هەردوو چینی خوداوەند بەشێوەیەکی وا هەڵکەندراون کە وەك بڵێی سەیری هەردوو خوداوەندی کەش و خێزانەکەی بکەن کە ئەم دوو خوداوەندە لە ناوەراستی هەردوو چینی خوداوەندەکان هەڵکەندراون. لەپاڵ وێنەی ئەم خوداوەندانە نووسینی مێخی و هیرۆغلیفی هەیە. ناوەرۆکی ئەم نووسینانە بەدەریان خست کە وێنەی ئەو خوداوەندە هەڵکۆڵدراوانەی سەر دیوارەکانی ئەم پەرستگایە بریتییە لە پانسیۆنی خووری (مجمع الآلهة الخورية) کە لە سەردەمی ئیمبراتۆریەتی گەورەی حیسییەکان جێگیرکرابوو، ئەمەش بەپشت بەستن بەنموونەی هاوشێوەی ئەم پانسیۆنە لە وڵاتی کیزۆفەتنا.

لەسەر دیواری یەکێك لە ژوورەکانی لاتەنیشت هەندێك هەڵکۆڵدراو هەیە کە ئاماژە بەهێزی ژێرزەوی دەکات (واتە : هێزی ئەو خوداوەندانەی کەلەژێر زەوی دەژین بەپێی بیروباوەری دانیشتوانی کۆن). هەڵکۆڵدراوەکەش لە خوداوەندێك پێکدێت کە لە سەر شێوەی شمشێرێکە، کە دەسکی

---

لە جارێك ئاماژە بە شوێنی (خەمرۆ ـ Khamro) کراوە، کە تیایدا لەم شوێنەدا ئاردق پێشکەش بە مەلیك دەکرا.بەتایبەتی لە بەرەبەیاندا.ئەمەش هەروەك لە تێکستە مێخییە نووسراوەکانی سەردەمی ئاشووری نوێ بۆمان دەردەکەوێت کە لەشاری ئاشووریش باوی ئاردق خواردنەوە (خەمرۆ)هەبووە، هەروەها بەشوێنی ئاهەنگ گێرانیش دانراوە.ئەم شوێنەش بەزۆری لە دەوروبەری شارەکاندا هەبووە.

شمشێرەکە لەسەر شێوەی سەرێکی مرۆڤە کە کڵاوێکی هێلکە شێوەی لە سەرکردووە (        ).
ئەم جۆرە کڵاوە بەزۆری لەسەری خوداوەندەکان دەبینرا لەو سەردەمەدا) لەگەڵ بوونی شێوەی چوارشێر. ئەم هەڵکۆڵدراوەی سەر شمشێرەکە بەخوداوەند نەرگال دادەنرێت. بەڵگەش لەسەر ئەمە ناوی ئەم خوداوەندەیە کە نووسراوە و هێماکەیەتی کە دەلالەتی لە شمشێر کردووە..لەهەڵکۆڵدراوێکی تردا نزیکەی وێنەی ١٢ خوداوەند بەدەردەکەوێت ئەمانەش دەکەونە کۆتایی ئەو زنجیرە خوداوەندانەی کە لە ژوورە سەرەکییە گەورەکە دان. ئەم خوداوەندانەش بریتین لە خوداوەندەکانی جیهانی خوارەوە (العالم السفلی). پەرستن و پێشکەش کردنی قوربانی بۆ خوداوەندەکانی جیهانی خواروو بەمەبەستی لابردنی هەموو پیسییەك و سیحرێکی خراپ (لابردنی کاری راپ و سحری رەش) بووە.[*] لە ناوچەی یازیلی کایا لە ناو تاوێرێکی شەق بوو لەنزیك ئەو دەرگایەی کە بەژووری سەرەکیمان دەگەیەنێت شوێنەوارو پاشماوەی هەندێك مادە دۆزراوەتەوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەنجامدانی هەندێك رێورەسمی ئایینی لە ناوچەکەدا کە مەبەست تیایدا بریتی بووە لە پاککردنەوەی سیحری شوێنەکە لە هەموو شەڕێك و خراپەیەك. هەر لەبەر ئەمەش هەندێك لەتوێژەرەکان وا دادەنێن کە ئەم شوێنە تەنها پەرستگایەکی پیرۆز نەبووە کە رێورەسمە ئایینە باوەکانی تێدا ئەنجامدرابێت. بەڵکو ئەم پەرستگایە شوێنەك بووە بۆ ئەنجامدانی رێورەسمە ئایینییەکانی تایبەت بەپاککردنەوەی رۆح. ئەم جۆرە رێورەسمە ئایینییەی تایبەت بە پاککردنەوەی رۆح لە زمانی خووری بە (ئیکتەلزی) ناسراوە. بەڵام ئەم جۆرە بیرو بۆچوونەی ئەم کۆمەڵە توێژەرانە رای گشتی لەسەر نەبووە. زۆر جار پەیکەری خوداوەندەکان لە زێڕ دروستکراوە. ئەم پەیکەرانە بەجۆرێك دروستکراون کە شێوەیەکی تەختیان هەبووە دیوارەکانیان پێ دادەپۆشرا. هەروەك ئەم پەیکەرانە بە بەردی بەنرخ و گرانبەها دەڕازانرانەوە، ئەمە سەرەرای ئەوەی کە ئەم پەیکەرانە بە هێما و نیشانەی تایبەتیەکانی خوداوەندەکە دەرازێنرایەوە وەك: کەل و پەلە جەنگییەکان، تەشی. هەروەها ئەم هێمایانە بەهەمان شێوەش رێورەسمی ئایینی تایبەت بەخۆیان هەبووە. (سەیری وێنەی ژمارە ٤ بکە)

لە پاشماوەی شوێنەوارە ماددی و نووسراوەکان زانیاری تەواومان بەدەست کەوتووە دەربارەی ئەو کەل و پەلانەی کە لە کاتی ئەنجامدانی رێورەسمە ئایینییەکان لە ناوپەرستگا بەکاردەهاتن. بۆ نموونە

---

(*) خوداوەندەکانی جیهانی خواروو بەرپرس بوونە لە کاری خراپ وسیحری رەش، هەربۆیەش مرۆڤی کۆن ئەم خوداوەندانەیان پەرستووە بۆ ئەوەی لێیان توورەنەبن و کارەساتی خراپیان بەسەردانەهێن.

له پەرستگای ناسراو بە (بیت نەرمـەککی واتـە ـــ خـانووی پاککردنـەوە ـــ) لـە واشـشووکانی پایتەختی مەملەکەتی میتانی گۆزەی زیوی بەکارهاتووە چونکە بەپێی بیروباوەری خوریـەکان زیـو توانایەکی پاککردنەوەی تایبەتی هەبووە. هەروەها لە پەرستگای خوداوەند شاووشکا ـ عەشتار لـە شاری نووزی پەیکەری شێر و قاپ و قاچاخی دروستکراو لەسەر شێوەی شێر هەبووە. ئەم قاپانـەش لەکاتی ئەنجامدانی ڕژاندنی شلەمەنییەکان بەسەر ئاژەڵە ئامادەکراوەکان بۆ قوربانی بەکاردەهاتن. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە پەیکەری بچووك لە شاری نووزی دۆزرانەوە کە لەسەر شێوەی ئـافرەتی رووت دروستکرابوون. لەکاتی دروسـتکردنی ئـەم پەیکەرانـە زۆر تەئکیـدکرابووە سـەر روخـساری ئەندامەکانی مێینەی ئافرەتەکە. ئەمەش لەو کەل وپەلانەی کە لە ڕێوڕەسمە ئایینییەکانی تایبـەت بە خوداوەند شاووشکا ــ عەشـتار بـەکاردەهاتن ڕەنگـی داوەتـەوە. ئـەرکی سـەرەکی خوداوەنـد شاووشکا ــ عەشتار بریتی بـووە لـە خوداوەنـدی جـەنگ و خۆشەویـستی. ئەمـەش لەتێکـستە نووسراوەکان ئاماژەی پێکراوە. لەپەرستگای تایبەت بە خوداوەند (شاووشکا ــ عەشتار)ی نەینەوا لە خاتووشای پایتەختی حیسییەکان قاپێکی دروستکراو لەسەر شێوەی ئاژەل دۆزرایەوە، قاپەکە لە جۆری(RHYTA) بوو کەدواتر لە چاخی کلاسیکی زۆر باو بووە.

لەزۆربەی پەرستگا خوریـەکان کۆگـای سـتوونی پێـچکەدار (بخـوردان) لـە پـاڵ ئاگردانـەکان دۆزراونەتەوە. ئەم جۆرە کۆگایەش بەمانا خوریەکەی پێی دەڵێن (خوبروشخی). هەندێك لەم جـۆرە کۆگایانە بە خوداوەند لە قەڵەم دراون و قوربانیان پێشکەشکراوە. لە تێکستە نووسـراوەکانی چـینی حەوتەمی ئالالاخ کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی شانزەی پێش زاین زیاتر لە جارێك ئاماژە بە جۆرە قاپێك دەکات کەبە ئەخروشخی ناوی دەبات. لە ناو ئەم جۆرە قاپانەدا ئـەم جۆرە بەرهەمانە دادەنرا کە دەسوتێنران لەبەر بۆنە خۆشەکەی. ئەم بەرهەمانەی کە لە ناو ئەم جۆرە قاپە دادەنرا بەمەبەستی سووتاندنی بەزمانی خووری پێـی دەگـوترا : (ئـەخری) یـان (ئەخـەرری). (سەیری وێنەی ژمارە - - بکە)

لەناو پەرستگا کەل و پەلی تەواو بۆخوداوەندەکان دادەنرا. ئەمەش بـۆ مەبەسـتی دابینکردنـی ئیسراحەتی تەواو بۆ خوداوەندەکان بووە.گرنگترینی ئەو کەل و پەلانەش بریتین لە : کورسی عـەرش (کیشخی)، خەوگە (نوتخی)، کورسی بێ پشت (تونی)، کورسـی ئـاسایی (تەبری).لـە شـاری قـەتنا (گردی مەشرەفەی ئێستا) کە دەکەوێتە ناوەڕاستی سووریا ژمارەیەکی زۆر لـە لیـستمان بەدەسـت گەیشتووە. ئەم لیستانەش تایبەتن بە جەردکردنی کەل و پەلەکانی تایبەت بەناو مـاڵی خوداوەنـد.

هەرچەندە ئەم لیستانە بەزمانی ئەکەدی نووسراون بەڵام ناوی کەل و پەلەکان هەمووی خورینە، کـە ئەمەش بۆمان دەردەخات کە ئەم شارە سەر بەشارستانییەتی خوریەکان بووە.

مامەلەکردن لەگەڵ خوداوەندەکان بەدوور لەو شێوازەی کە وەسفدەکرێت دەبێتە هۆی شـکاندنی سنووری نێوان چوارچێوە ئایینییە پیرۆزەکە (کە هەردەم بەهۆی ئەنجامدانی رێورەسمـە ئایینییـەکان پەرستنی خوداوەندەکان نوێ دەبێتەوە) و جیهانی ژیانی مەدەنییەت. ئەمەش دەبێتە هـۆی ئـەوەی کە هێزە رۆحییەکەی زیانی بەربکەوێت ئەویش بەهۆی ئەو پیسییەی کە لەکردەوە خراپەکانەوە سەر هەڵدەدات. بەمەش ناتوانێت پاڵپشتی بـەردەوام بـوون و رێکخـستنە سـەرکەوتوانەکەی گـەردوون بکات. ئەو بارودۆخەی کە هێزی خوداوەندەکان پێیدەگات لەلایەن بەندەکانی ئەم خوداوەندانـە بـە تورەبوونێکی خودای لەقەلەم دەدرێت، کە لەئەنجامدا مرۆڤەکان تیایدا سزا دەدرێـن. بـەڵام دەبێـت چارەنووسی ئیرادەی رەهای خوداوەندەکان لە تێروانینی مرۆڤەکانەوە چۆن بێت؟.

تێگەیشتنێکی زۆر کۆن هەیە کە چەندین جار لە سەرچاوە ئەنادۆلیەکان ئاماژەی پێکراوە، کـە تیایدا بۆمان روون دەبێتەوە کە هێزی خوداوەندەکان کاریگەرە بۆ دابینکردنی ئاشـتی و بەرەکـەت، بـەڵام هەنـدێك جـار ئـەم هێـزەی خوداوەنـد تووشـی شـێواوی و تێکـچوون دەبێـت. تورەبـوونی خوداوەنـدەکانیش لەوکاتـدا لەسـەر شـێوەی دووکـەڵێك کـە لەئـەنجامی مومارەسـەی سـیحری بڵاودەبێتەوە دەردەکەوێت. دیاریکردنی هۆکارەکانی تێکچوون و شێواوی کاریگەری خوداوەندەکان و ئەنجامەکانی کارێکی ئاسان نییە. هەربۆیەش پێویستە نیشانەی خودایی هەبێت کە یارمەتیدەربێت بۆ بەدەرخستنی سروشتی ئەم سنوور بەزاندنـەی کـە ئەنجامـدراوە. ئـەو هێمایانـەش رەنگـە لـە خوداوەندەکە خۆی بەدەربکەوێت. بۆنموونە هێمای هەردوو خوداوەنـدی خـۆر و مـانگ بریتییـە لـە خۆگرتنی گەردوون. بەڵام هێمای خوداوەندی کەش بۆ تۆبـەکردن و گەرانـەوە بـۆ لای بریتییـە لـە روودانی باو بۆران (عاصفە). ئێمە ئەو دیاردانـە بەپێـشبینی کردنـی خـراپ نـاودەنێین (omina) ئەگەر ئەمە روویدا بەبێ ئەوەی کە رەنگدانەوەیەکی واقیعـی هـەبێت ئـەوکات تـەنها دەبێـت بـە پێشبینی کردن (orakel). لە نموونەی ئەمەش کاهنەکان هەڵدەستن بە هەڵفراندنی باڵندەیەك پاشان لە لایەن کاهنەکانەوە چاودێری فرینەکەی دەکرێت، چۆنییەتی فرینەکەی شیدەکرێتەوە. پاشان بزنێك سەردەبرن و دەیکەنە قوربانی ئەمەش بۆ بەدەستهێنانی هەندێك راستی ئەویش بەپشت بەسـتن بـە فالگرتنەوە لەسەر هەناوی بزنەکە.

جیاوازی نێوان هەردوو وشەی پێشبینی کـردن (omina) و فالـچیاتی(orakel) تارادەیـەك شتێکی دروستکراوە، جیاوازی نێوانیان وەك ئەو جیاوازییە کە مرۆڤ خـەونێکی بینـیبێ وحـەزی

بەبینینی نەکردبێ. بەڵام ئەوەکەی تریان وەك ئەوەیە کە مرۆڤ خەونێکی دیتبێ و ئارەزووی بینینی کردبێ. بۆ ئەمەش شەوێك دەچێتە پەرستگا و تیادا دمێنێتەوە بۆ ئەوەی ئەم خەونە ببینێت.

خوریەکان لەرووی پێشبینی کردن و فاڵچیاتییەوە دەورێکی مامناوەندیان هەبووە، چونکە خوریەکان هەڵستاون بە وەرگێڕانی تێکستەکانی تایبەت بەم لایەنەوە (فاڵچیاتی و پێشبینی کردن)بۆ سەر زمانی خۆیان. هەروەها لەرێگەی وڵاتی دوو رووبارەوە خوریەکان فێری ئەو جۆرە فالآنە بوونە کە لەرێگەی پشکنینی پێکهاتەکانی ناوەوەی ئاژەڵ وەك : (جگەر، دڵ) ئەنجامدەدرا. پاشان حیسییەکا لەرێگەی خوریەکانەوە ئەم جۆرە فالآنە فێربوون.

تێروانینی بابلیەکان لە شەرح کردن و باسکردن و تۆمارکردنی پێشبینییەکان بەپشت بەستن بە پشکنینی بەشەکانی ناوەوەی ئاژەڵەکان (جەرگ، دڵ) پێی دەگوترا (باروتو ـــ barutu)[٩٢]. هەروەها تەفسیرکردنی حاڵەتی لەبارچوونی منداڵ پێی دەگوترا (شوما ئیزبوو ـــ summa izbu)[٩٣]، هەروەها بنەماکانی زانستی فەلەك ناسی کە بابلیەکان پێیان دەگوت (ئینۆما ئانۆ ئەنلیل ـــEnuma Anu Enlil)[٩٤] (بەشێوەیەکی وردتر مەبەستی دەربڕینی بنەما کۆنەکان بووە پێش ئەوەی شێوازێکی ئاینی وەربگرێت). مەبەست لە نووسینەوە و تۆمارکردنی ئەم جۆرە فالآنە زیاتر بۆ خۆ شارەزاکردن بووە نەك بۆ چۆنییەتی بەکارهێنان و جێبەجێکردنی بەشێوەیەکی پراکتیکی.

تێبینی دەکەین کە کاهنە خوریەکان لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانیان بەشێوەیەکی پراکتیکی هەڵدەستان بە ئەنجامدانی پشکنینی هەناوی ئاژەڵەکان لەگەڵ دیاریکردنی حاڵەتە دیاریکراوەکان. ئەمەش کارێکی زۆر باو بووە لەلای خوریەکان (ئەمەش کۆنترین شێوازی سەرەکی ئەو کاهنانە بووە کە بەیارمەتی پشکنینی جەرگ فالەکانیان دەگرتەوە لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا). ئەم جۆرە پەیوەندییەش بەهەمان شێوە لە وڵاتی دوو رووبار دەبینرێت. بەتایبەتی لەو کۆمەڵە نووسراوە ئەکەدییەی کە بە تەمیتۆ (واتە سوێند خواردن ـــTameto )[٩٥] ناسراوە دەردەکەوێت. کاهنەکان ڕوویان لە هەردوو خوداوەندی شەمش (خۆر) و ئەدەد (خوداوەندی کەش) دەکرد بۆ پرسیار کردن لە

---

(٩٢) ئەم وشەیە بەمانای مەبەست لەپێشکەشکردنی قوربانی یان پێشکەشکردنی قوربانی چ دانایەکی تێدایە دێت.

(٩٣) ئەمەش واتە :ئەگەر حاڵەتی لەبارچوون رووبدات.

(٩٤) ئەمەش واتە :کاتێك خوداوەند ئانۆ و ئەنلیل.

(٩٥) واتە : سوێند خواردن.

پێشهاتەکان (تکهنات) وەڵامەکانیشیان لەرێگەی پشکنینی جگەری بزنێـك وەردەگرتـەوە. پـێش چەند ساڵێکی کەم تێکستێکی مێخی لەم جۆرە لە شاری کوروخەننی سـەر بەمەملەکـەتی ئارابخا دۆزرایەوە، کە مێژووەکەی بۆ سەدەی (١٤ پ.ز) دەگەرێتەوە.

کۆمەڵێك لە تێکستە مێخییەکانی حیسییەکان هەیـە کـە بـە (تێکـستی کاهنـەکانی سـوو) ناسراون. ئەم تێکستانە پەیوەندی نێوان چۆنییەتی پشکنینی جگەر و بەدەستهێنانی پێشبینییەکان روون دەکاتەوە. ئەو زاراوانەی کە لەم تێکستانەدا بەکارهاتوون بۆمان دەردەخەن کە حیسییەکان لە پشکنینی جگەردا پشتیان بەشێوازی بابلیەکان بەستووە، ئەمە سەرەڕای بوونی کاریگەری شـێوازی خوریەکان تیایدا. کە خوریەکان وەك ناوەندێك بوونە بۆ گواستنەوەی ئـەم جـۆرە فالگرتنەوانـە لـە وڵاتی دوو رووبارەوە بۆ ناو مەملەکەتی حیسییەکان.

شاری ئیمار کە بەیەکێك لە گرنگترین مەڵبەنـدە بازرگانییـەکانی ناوچـەی فـوراتی ناوەڕاسـت دادەنرێت.لەم دواییەدا لـەم شـارە هەنـدێك تێکـستی مێخـی دۆزرایـەوە.لـەم تێکـستانە بۆمـان دەردەکەوێت کە ئەم شارە ناوەندێك بووە بۆ فالگرتنەوە لەسەر شـێوازی فالگرتنـەوەی خوریـەکان. ئەویش بریتییە لەفالگرتنەوە بەیارمەتی پشکنینی جگەر. هەروەها لە زۆر ناوچەکانی وەك خاتووشا و سووریا و فەلەستین نموونەی دروستکراوی جگـەر لـەقور دۆزرایـەوە. لەسـەر ئـەم نموونانـە خاڵـە گرنگەکانی پێشبینی کردنەکان بـە وێنـە دیـاریکرابوون، هەنـدێك جـار بەنووسـینی مێخـی ڕوون کرابوونەوە. گومانی تێدانییـە کـە جـۆرە پەیوەندییـەك هەیـە لـەنێوان چـۆنییەتی فالگرتنـەوەی ئەتروسکە رۆمانییەکان و نموونەی ئەو جگـەرەی کـە لـە ئیتالیـا دۆزراوەتـەوە لەگـەڵ رێگـەکانی پشکنینی هەناوی ئاژەل بۆ مەبەستی فالگرتنەوە لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا. بەڵام تاکو ئێـستا نـاتوانین بڕیارێکی تەئکید کراو بدەین سەبارەت بـە چـۆنییەتی گواسـتنەوەی ئـەو شـێوازەی فالگرتنـە بـۆ ئیتالیا.

تێکستەکانی خاتووشا باسی جۆرە فالگرتنەوەیەك دەکەن کە بەیارمـەتی باڵنـدە ئەنجامـدەدرا. ئەم جۆرە فالگرتەنەوەیە لەبنەڕەتدا بۆ خوریەکان دەگەرێتەوە.چۆنییەتی زانینی زانیارییەکان بـەپێی ئەم جۆرە فالگرتنەوەیەش بەوردی تاکوئێستا نازانرێت.لەم جۆرە فالگرتنەوەیـەدا جـۆرە باڵندەیـەك بەکاردەهات کە بەزمانی ئەکەدی پێی دەگوترا (موشین ــ ئیـسوور ـــ خـورری) واتـە : باڵنـدەی ئەشکەوت (رەنگە مەبەستی شەمشەمە کوێرە بێت). ناوی ئەم باڵندەیە بێگومان ناوی خوریەکانمان بەیاد دێنێتەوە، هەروەها لەناوچەکانی ئاسیای بچووك هەر بەو مانایە لێکدراوەتـەوە. واتـە : ئـەم باڵندەیە بەناوی باڵندەی خوریەکان ناسراوبووە.

بۆ روونکردنەوەی چۆنییەتی جێبەجێکردنی ئەم جۆرە فالگرتنەوەیە بەشێوەیەکی پراکتیکی ئەوا بەشێك لەتێکستێکی مێخی تایبەت بەم لایەنەوە دەخەینە روو بەم شێوەیەی خوارەوە :

﴿ خوداوەندی کەشی بەهێز لەناو پەرستگاکەی دانیشتبوو و لەحاڵەتی توورەبوون دابوو. هەربۆیە ئێمە لە خزمەتکارەکانی ناو پەرستگامان پرسی کە هۆکاری توورە بوونی خوداوەند چییە؟ ئەوانیش وەڵامیان داینەوە و گوتیان: لەبەرئەوەی پێشکەشکردنی قوربانی ساڵی حەوتەم پشتگوێ خراوە بۆ خوداوەند، کاتی خۆی کەلوپەلە پێشکەشکراوەکان کانزاپۆش کرابوون، بەڵام ئێستا کانزا پۆش نەکراون.کورسی تایبەتی خوداوەند پێشتر بەشی پێشەوەی زیو پۆش کرابوو، بەڵام ئێستا زیو پۆش نەکراوە. پێشتر دانیشتوانی گوندی (کوریشییا)ی سەر بە وڵاتی نیشووا پێشکەش بەخوداوەند کرابوون. بەڵام ئێستا مەلیکی ئیشووا ئەوانی بۆخۆی بردووە. پێشتر ئارەق لە هەردوو گوندی (نەخیتا) و(خیلیتا) بۆ خوداوەند دەهێنران بەڵام ئێستا ئارەق ناهێنن پشتگوێیان خستووە. پێشتر لە گوندی (توختوشنا) خوێیان بۆ خوداوەند دەهێنا بەڵام ئێستا دانیشتوانی ئەم گوندە بەباروودۆخێکی ناهەموارردا دەڕۆن بەهۆی کەمی زێڕ بۆیە چیتر خوێ بۆ خوداوەند ناهێنن. پێشتر یەکێك لە بازرگانەکان جلێك و........ زێڕی کە کێشەکەی یەك مسقال زێڕ بوو، ....... زیوی کە کێشەکەی سێ مسقال بوو پێشکەشی بەخوداوەند کردبوو. بەڵام ئێستا ئەم شتانە بەتاڵان براون بۆ باوباپیرانی کاربەدەستانی کۆشك و ئەم کارەش پشتگوێ خراوە.خزمەتکارەکانی پەرستگا پێشتر بەردەوام کچی ناوچەکانیان بۆ خوداوەند دەرفاند، بەڵام ئێستا واناکەن.

ئایا خوداوەندی کەش توورەیە بەهۆی ئەم هەڵانە ؟ ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کەباڵندەی فالگرتنەوە سوودی نییە؟(ئەنجام) بەسوودە.

ئەگەر خوداوەندی کەش توورە بێت بەهۆی هەڵەی تردوە ئەوە مانای وایە کە باڵندەی فالگرتنەوە بێ سوودە ؟(ئەنجام) بێسوودە............﴾

ئەگەر هۆیەکانی توڕەبوونی خوداوەند دیاریبکرێت ئەوکات دەتوانرێت لابدرێت، ئەویش بە سووتاندنی ماددەیەکی سیحری لەمەبخەرە. ئەنجامی ئەمەش دەبێتە هۆی چاکبوونەوەی سیستەمی ئایینی. بەڵام بەشکردن بۆ مادەیەکی پاك یان پیس دیارینەکرێت لە ڕێگەی گەیشتن بەمادەیەکی پاك یان پیس بەڵکو لە کاتی نەمانی پیسی دیاریکراو لە هزر یان لە بووندا دیاریدەکرێت.

ئەو کەلەپوورەی کە ئێمە باسی لێوە دەکەین هەروەها لەگەڵ ئەوەی کە لە کەلەپووری کۆنی ئاسیای بچووك (کوردستانی تورکیا) دا هەیە پێچەوانەن. رووخسارەکەشی بریتییە لە بیرێکی تاك ڕەوی کە تێڕوانینێکی گشتگیری هەیە. بۆ نموونە : دیاریکردنی لایەنی سەلبی پاکی تەنها بریتییە

له سنوور دانان. هەروەها مومارەسە کردنی سیحر بەپێی بیروباوەڕی کۆن بریتییە لە لادانی پیسییەکان واتە(کاری پاککردنەوەیە). بەپێی ئەمە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو کەسەی کاری جادووی دەکات پێی دەڵێن جادووگەر(ساحر) و تەنها خۆی مەبەستەکانی دیاریدەکات. واتە تەنها هەرخۆی دەتوانێت دوو شتی دژیەك لە یەکتری جیا بکاتەوە. واتە هەرخۆی دەزانێت کە چ جۆرە سیحرێك کە ئامانجەکەی لەعنەتە و شەرخوازییە و چ جۆرە سیحرێك ئامانجەکەی خێر و بەرەکەتە. واتە ساحر تەنها خۆی دەتوانێت سیحری رەش و سیحری سپی لێك جیا بکاتەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بنەماکانی جێبەجێکردنی هەردوو جۆری سیحر وەك یەکن. ئەوەش یەك ئامانجی هەیە ئەویش بریتییە لەناوبردنی کاری خراپ و دژایەتی کردنییە. لێرەدا پێویستە دوو شێوازی تایبەتی جادووی (سیحر) لەیەکتر جیابکەینەوە ئەوانیش:

١- جادووی هاوشێوەیی ـ سحر متماثل ــ Anologie (٩٦)

٢- جادووی بەرجەستەیی ــ سحر ملامس ــ kontak. (٩٧)

لەجۆری یەکەمیان باس لە شتێك یان کارراییەکانی یان تایبەتمەندییەکانی دەکرێت، وجێبەجێکردن و بەدەستهێنانی ئەنجامەکانی بەپێی سروشتی کارەکە دەبێت. ئەوەش مەبەستی سەرەکی کاری جادوویە.

بەڵام لە جۆری دووەمیان پیسی و شتە خراپەکان لەناو بوونەوەرەکە لادەبرێت لەرێگەی دەست لێدانی بوونەوەرەکە بەمادەیەکی سیحری پاك، بەم جۆرەش ئەم پیسییە کە لەگەڵ مادده سیحرییەکە تێکەڵ دەبێت هیچ زیانێکی نابێت، ئەمەش بەپێی بیروباوەڕی دانیشتوانی کۆن. لەم جۆرە جادووییەش هەندێك جۆری دیاریکراوی ڕووەك یان کانزا بەکاردەهاتن.

هەرچی ئەو ووشانەیە کە لەکاتی ئەنجامدانی جادووەکە دەگوترا دەتوانین بە دیاردەیەکی پارانەوەی لە قەڵەم بدەین. بەتایبەتی کاتێك کەرەستە پیسبووەکانی خوداوەندەکانیان بۆ خوداوەندەکانی جیهانی خواروو (جیهانی کاری خراپ و شتی پیس) بەمەبەستی کۆکردنەوەیان لەوێدا دەنارد.

---

(٩٦) واتە ئەم جۆرە جادووییە شت دەبەستێت بە دەست لێدانی ناراستەوخۆ ئەمەشیان زیاتر پێویستی بە ئیجراناتی عەمەلی نییە.

(٩٧) واتە ئیێشەکی و ئیجراناتەکانی لەگەڵ ئەنجامەکانی وەك یەك دەبێت.

لەسەردەمی بابلی کۆندا هونەری فالگرتنەوەی خوریەکان گرنگیەکی زۆری هەبوو لە باشووری وڵاتی دوو رووبار. هەندێك تێکستمان بەدەست گەیشتووە کە بەزمانی خووری نووسراونەتەوە کە بەهەمان شێوە مێژووەکەیان بۆ سەردەمی بابلی کۆن دەگەڕێتەوە. لە پەراوێزەکانی ئەم تێکستە خوریانە هەندێك شەرحکردنی بەزمانی سۆمەری و نووسینی مێخی بۆ کراوە، کەتایدا بۆمان دەردەکەوێت نووسینەکانی ئەم تێکستە خوریانە بریتییە لە فاڵ. ئەم فاڵانەش بۆمەبەستی جیاجیا بەکاردەهاتن بۆ نموونە (وەك ئەو جۆرە فاڵەی کە دژی پێوەدانی مار بەکاردەهات). هەرچەندە بەشی زۆری نووسینە مێخیەکانی ئەم تێکستانە ماناکەی نازانرێت. بەڵام لەنێوانیاندا هەندێك وشە هەیە کەماناکەی زانراوە وەك: (چیا ـــ رووبار، ئاسمان ـــ زەوی) بەشێوەیەکی گشتی ئەمە بۆمان دەردەخات کە ئەم تێکستە خوریانە زۆر لە تێکستە ئایینییەکانی تری خوریەکان دەچێت کە لە دوای چەندین سەدە نووسراونەتەوە و لە ناوچەکانی خاتووشا و ئۆغارین دۆزراونەتەوە. ئەم تێکستە خوریانە لە سەردەمی بنەماڵەی ئووری سێهەم بۆ باشووری وڵاتی دوو رووبار لەرێگەی ناوچە خوریەکانی باکووری وڵاتی دوو رووبار و رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە گواستراونەتەوە. ئێمە وادانانێین ـــ هەروەك هەندێك لە توێژەرەکان ئاماژەی پێدەکەن ـــ کە هەندێك لە خوریەکان چوونەتە ناوچەکانی شارستانییەتی سۆمەریەکان (باشووری وڵاتی دوو رووبار) بەڵکو لەرێگەی بوونی پەیوەندی شارستانییەتی و داگیرکردنی مەلیکەکانی بنەماڵەی ئووری سێهەم بۆ ناوچە خوریەکان ئەم تێکستانەی تایبەت بە فالگرتنەوەی خوریەکان گواستراونەتەوە بۆ ناوچەکانی سۆمەر.

لە شاری ماری کە دەکەوێتە کوردستانی سووریا بەهەمان شێوە هەندێك فاڵ دۆزرایەوە کە بەنووسینی مێخی و بە زمانی خوریەکان نووسرابوون کە مێژووەکەیان بۆ (١٧٠٠پ.ز) دەگەڕێتەوە. لەپاڵ ئەم فاڵانەی کەبەزمانی خووری نووسرابوون هەندێکی تر هەن کە بەزمانی ئەکەدی نووسراونەتەوە. بەڵام ناوەرۆکی ئەم فاڵانە لەیەکتری جیاوازبوون. تێکستە نووسراوەکانی خاتووشا باسێکی تەواوی زۆر لەو رێورەسمە جادوویانەی کە لە ناوچەکانی شارستانییەتی خوریەکان ئەنجامدراون پێشکەش کردووین. هەندێك لەم تێکستانە قۆناغەکانی ئەنجامدانی جادوویەکەی بەزمانی حیسی تێدا باسکرابوو. بەڵام تێکستەکانی تایبەت بەفاڵەکان بەزمانی خووری نووسرابوون. ئەگەر سەرنج بدەین کە ئەو تێکستانەی کە بەزمانی حیسی نووسرابوون ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم تێکستانە لەبنەڕەتدا خوری بوونە. ئەمەش لەژێر رۆشنایی بەراوورد کردن و شوێنی ئەنجامدان و هەندێك لەو زاراوانەی کەتیایدا بەکارهاتووە. هەرچەندە ئەم تێکستانە بەزمانی حیسی نووسراونەتەوە.

لەناوەڕۆکی فیکری و دەربڕینی وشەکان لە تێکستەکانی ئەم فاڵانە بۆمـان روون دەبێتـەوە کـە ئەدەبی جادووی (خووری ــ حیسی) بەشی هەرەگەورەی بۆ وڵاتی کیزۆفـەتنا دەگەڕێتـەوە. وڵاتـی کیزۆفـەتنا دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ. ئـەم وڵاتـە ناوچـەیەکی گـرنگ بـووە و شارستانییەتی خوریەکانی کوردستانی سووریای لە سەدەی شانزەی پێش زاین تێـدا بڵاوبووەتـەوە. ئەم شارستانییەتەی تایبەت بە خوریەکان لەسـەردەمی سـەربەخۆیی مەملەکـەتی میتـانی زیـاتر کرانەوەی بەخۆیەوە بینی، ئەمەش لە کۆتایی سەدەی پانزە و سەرەتای سەدەی چواردەی پێش زاین بوو. بەڵام تەوژمی گەورەی یەکەمی گواستنەوەی پەرسـتراوە خوریـەکان و کـرداره جادوویـیـەکانی خوریەکان بۆ وڵاتی کیزۆ فەتنا لە ماوەی فەرمانڕەوایی مەلیکی حیـسییەکان ئەرنۆفەنـدای یەکـەم (١٣٧٠پ.ز) دا بووە. واتە ڕاستەوخۆ دوای ئەو ماوەیەی کە وڵاتی کیزۆ فەتنا بـوو بەبەشـێك لـە مەملەکەتی حیسییەکان. واتە کرداری گواستنەوە کە لەسەردەمی مـەلیك توتخالیـای دووەم (یـان سێهەم) بووە لە دەوروبەری (١٣٨٠ پ.ز).

وڵاتی کیزۆفەتنا وەك کۆگایەك بووە کە ئـایین و بیروبـاوەڕی جیـاوازی تێـدا کۆبوویتـەوە. لـە کوردستانی سووریا داب و نەریت و ئایینی شاری خەششۆ کەپێشتر باسمانکرد تێدا باوبووە.کـاهنی تایبەت بە فاڵەکان(فاڵچی) (ئەللەیتورەخخە) لەبنەرەتدا هی ناوچەی ئالالاخ بووە. هەروەك (کیزبیا) نووسەری ڕێوڕەسمە ئایینییەکان لەبنەڕەتدا هی ناوچەی ئالالاخ بووە. بەڵام (ئیخلی تیششووب) کـە نووسـەری کورتەیەکی تەواوی ڕێوڕەسمە ئایینییـەکان بـووە لەبنەڕەتـدا هـی شـاری حەلـەب بـووە. ئەمانەی پێشوو هەموویان هاتبوونـە کیزۆفـەتنا. هەرچـی داب و نەریتـە ناوەخۆییـەکانی شـاری کیزۆفەتنایە کە لە بنەرەتدا خوری نییە ئەوا ناتوانین بیانخەملێنین، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا گومانـان نییە لەوەی کە بەریەککەوتنێك هەیـە لـەنێوان داب ونـەریتی نـاوەخۆی کیزۆفـەتنا لەگـەڵ داب و نەریتی ناوچە شارستانییەکانی زمانی لوفی کە دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوایەوە.

تێکەڵاوییەك هەیە لەنێوان کارە سـیحرییەکانی لوفییـەکان وخوریـەکان لەگـەڵ ڕێورەسمـەکانی تایبەت بەفاڵەکانی حیسییەکان. ئەمەش بۆمان روون دەکاتەوە کـە ئـەم تێکەڵاوییـە بریتییـە لـە بەرهەمی قۆناغێکی شارستانی کە پایتـەختی حیـسییەکان(خاتووشـا) لەسـەردەمی مەملەکـەتی گەورەی حیسییەکان پێیدا تێپەڕبووە.لەئەنجامی ئەوەش توانراوە گونجاندنێکی سەرکەوتووانە لەنێوان ئەم داب و نەریتە جیاوازانە ئەنجامبدرێت. بەڵام ئەوەی کە پەیوەسـتە بـە کاریگـەری ڕاسـتەوخۆی خوریەکانی دانیشتووی ڕۆژهەڵاتی رووبـاری فـورات (وەك : ئیـشووا، ئەلـشی، میتتـانی) لەسـەر پایتەختی حیسییەکان ئەوا حاڵی حازر ناتوانرێت دیاریبکرێـت. لـەگرنگترین زنجیـرە تێکـستەکانی

تایبەت بەرێوڕەسمە ئایینییەکانی پاککردنەوە خوریەکان(شعائر الطهارة الخورية) کە لەخاتووشای پایتەختی حیسییەکان دۆزراونەتەوە بریتییە لە دوو زنجیرە تێکست کە بەناوەکانی (ئیتکەلزی) و (ئیتکەخخی) ناسراون. ئەم دوو ناوەش لەبنەڕەتدا لە وشەی خووری (ئیتکی) دارێژراون، ئەم وشە خوریەش (ئیتکی) بەمانای پاکی دێت. هەندێك لە ریزبەندییەکانی ئەم دوو زنجیرەیە (ئیتکەلزی، ئیتکەخخی)لە بۆ هەندێك کەسایەتی مێژووی ناسراو دەگەڕێتەوە وەك :

* ئەشمۆ ــ نیگگال : ئەمەش حاکمی تەوەننا و خوشکی مەلیك ئەرنۆفەندای یەکەمە.

* تاتۆ ــ خیپا: ئەمەش خێزانی ئەرنۆفەندای یەکەمە، ئەم شاژنە بەردەوام بووە لە حوکمکردندا تەنانەت لەسەردەمی مەلیك شۆپیلۆلیۆمای یەکەم کە جێنشینی ئەرنۆفەندای یەکەم بووە.

* تەشمی ــ شەرری: ئەمەش ڕەنگە ناوی دووەمی مەلیك ئەرنۆفەندای دووەم بێت.

بێگومان ئەمانەش بۆ قۆناغەکانی سەرەتای وەرگرتنی تێکستە خوریەکان لەلایەن حیسییەکانەوە دەگەڕێتەوە. ئەم دوو زنجیرە تێکستە(ئیتکەلزی، ئیتکەخخی) لە خاتووشا بەچەند قۆناغێکدا تێپەریون. ئەمەش لەتێبینییەکانی نووسەرەکان لە پەراوێزەکانی سەر تێکستەکان خۆی دەردەکەوێت و ڕەنگدەداتەوە.

زنجیرە تێکستی ئیتکەلزی چەندین دانەی هەبووە. دانەیەکیان لە سەر ١٠ تابلۆ نووسراوەتەوە. هەر لەم دانەیەش باس لەدانەیەکی کۆنتر لە خۆی دەکات لە شاری (شەبینوا) کە لە ٢٢ تابلۆ پێکهاتووە. بە چاوپۆشین لەو جیاوازییەی کە لە ژمارەی تابلۆکان بەرچاودەکەوێت، ئەوا زنجیرەی ئیتکەلزی لە بنەڕەتدا لەیەك پێکهاتەی یەکگرتوو خۆی نواندووە، کە تیایدا پشت بەمادەی پاککەرەوە دەبەستێت. لەتابلۆی ژمارە ١٠ ی یەك لەم نوسخانەی کە هەیە دەبینین وشەی زیو لەدوای وشەی زەیت دێت و لەتابلۆکانی تر وشەی ئاو پاشان بەردی لازوورد پاشان داری ئیرز پاشان دارخوورما لەخۆدەگرێت. نووسەری حیسی لە پەراوێزی یەك لەتێکستەکان باسی ئەم رێورەسمە دەکات بە رێورەسمی (دەم شۆرین) (غسل الفم) ناوی دەبات. هەروەها بەهەمان شێوە لە تێکستێکی ئاشووری و یەکێکی تری میسری ئاماژە بەم جۆرە رێوڕەسمە کراوە. بەلام تاکو ئێستا هیچ وێکچوونەك لەنێوان ناوەرۆکی تێکستە خوریەکە و تێکستە ئاشوورییەکە و تێکستە میسریەکە بەدەرنەخستراوە.

فاڵەکان زۆر گونجاون لەگەڵ ئەو جۆرە جادووەی کە بە جادووی هاوشێوە(متماثل) ناومـان بـرد. ئەمەش هەروەك لە فاڵی ناسراو (بەحوکمی زیو) یان فاڵی ناسراو بە (حوکمی ئاو) بە دەردەکەوێت. دەتوانین برگەیەکی ئەم فاڵەی دوایی (حوکمی ئاو) بەم شێوەی خوارەوە بخەینە روو:

﴿ هەروەك ئاو پاکە.........، بەم شێوەیە دەخوازم کە تاتۆ خیپا ــ ناوی خاوەنی قوربانییەکە ــ پاك بێت لە بەرامبەر خوداوەند و مرۆڤەکان.﴾[٩٨]

بەڵام ئەو رێورەسمە ئایینییـەی کـە پەیوەنـدی بەمـەوە هەیـە بـەزۆری بەشـێوەیەکی زارەکـی دەگوترێت، بۆ ئەوەی کاریگەریەکەی زیاتر بێت.

ئەم برگەیەی سەرەوە وەسفی رێورەسمی خۆ شۆشتنی پاککردنەوە دەکات، کە بەیارمەتی ئـاوی پاککردنەوە ئەنجامدەدرا. کە تیایدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو کاهنەی کـە تایبەتـە بـە پاراسـتن و هەڵگرتنی (ئاوی پاك) ئەوا لەسەری پێویستە گرنگیەکی تایبەتی بە پاکی خـۆی بـدات. ئەمـەش هەروەك لەم برگەیەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت :

﴿ خاوەنی قوربانییەکە دەمی خـۆی دەشـوات، دوای تـەواو بـوونی دەم شوشـتنەکەی کـاهنی تایبەت بە هەڵگرتنی ئاوی پاك دێت بۆ شوێنی خۆ شوشتن، دوای ئەوەی کە خاوەنی قوربانییەکە لە شووشتنەکەی تەواو دەبێت ئینجا یەکێکیان ئاوی پاکبوونەوەی (ماء الطهـارة) بەسەردا دەکات لە جامێکی دروستکراو لە مس یان برۆنز. هەرچی ئەو کاهنەیە کە ئاوی پاکبوونەوە هەڵناگرێت دوای ئەمە دێت بەهەردووکیان شوشتنەکە ئەنجامدەدەن بەیارمەتی کەل و پەلی تر کـە بـۆ کـاری پـیس بەکاردێت. هەروەها کاهنی دووەم بەهۆی ئەنجامـدانی کـاری پاککردنەوەکـە پـیس نابێـت بـەڵکو ئەویش پاك دەبێت بەپێی بیروباوەری خۆیـان. خـاوەنی قوربانییەکـە ئـاوی پاکبوونـەوەی بەسـەری دادەکات، بەڵام دواتر لە ئاوێکی تر ئاو بەخۆیدا ناکات، بەڵکو لەو ئـاوەی کـە بەخۆیـدا کـردووە لەخوارەوە لە جامێك کۆدەبێتەوە هەر ئەو ئاو بەخۆی دادەکاتەوە.﴾

هەروەها لەهەمان تێکست باس لە رێورەسمی یاری تیرهاوێشتن دەکرێـت. کـە ئەمـەش بـەپێی بیروباوەریان بۆ دوورخستنەوەی پیسایی و کاری خراپ بەکاردەهات.

بەڵام لە زنجیرەی (ئیتکەخخی) کە لەسەر (٢٤) تابلۆ زیاتر نووسراوەتەوە. ئەمەشـیان هەنـدێك وشە لەخۆدەگرێت کە بەشێوازێکی جوان و رێکوپێك تەرتیب کراون و دارێژراون، بەجۆرێك کـە ئـەم

---

(٩٨) ئەو وشانەی کە هێلیان بەژێرداهاتووە ئەوا لەبنەرەتدا تووشی شێواوی هاتووە لەناو تێکستەکەدا.بۆیە ئەمانە بەشێوەیەکی گریمان دانراون.

ڕێکخستنە جوان و ڕێکوپێکە لە زنجیرەی ئیتکەلزی نابینرێت. ئەمەی خوارەوەش برگەیەکە لە زنجیرەی ناسراو بە ئیتکەخخی:

﴿ خوداوەندی تیشووب و دەربازکەرو (مەلیکی) خوداوەند، حاکمی ئاسمان، مەلیکی حاکمی زەوی، حاکمی رووبارەکان. خودای مەلیکی چیا، خودای مەلیکی خوداوەندەکانە، حاکمی.......، مەلیکی............، حاکمی ولاّتەکانە.﴾

ئەو کاهنەی کە سەرپەرشتی ڕێوڕەسمەکانی پاککردنەوەی (ئیتکەلزی، ئیتکەخخی) دەکرد بە (ئازۆ) ناودەبرا. ئەم وشەیەش لە بنەڕەتدا سۆمەرییە کە بەمانای کاهنی سەرپەرشتیار لەسەر قوربانییەکان دێت. بەڵام ئەم وشەیە لە تێکستەکانی خاتووشا بەمانای کاهنی تایبەت بەفالگرتنەوە (کاهن التعاویذ) دێت. لەپاڵ ئازۆ قالچییەکی تر هەبوو کە بە (پیرەمێرد) ناودەبرا کە ئەمەش دەورێکی گرنگی دەگێڕا لە ڕێوڕەسمە سیحرییەکانی یان جادوویەکانی خوریەکان لە ئاسیای بچووکدا.

ئەوەی تاکو ئێستا بۆمان ڕوونبۆتەوە ئەو ڕێورەسمانەی کە لە لایەن فالچی ناسراوبوو بە (پیرەمێرد) ئەنجامدەدرا لە رووی شێوازو پێکهاتن و داڕشتنەوە وشەی زمانەوانی و هەندێك کاری سیحری و هاندانی ئەفسانەی لەگەڵ ئەو ڕێوڕەسمە ئایینیانەی کە لەلایەن کاهن ئازۆ ئەنجامدەدران جیاواز بوون.

زنجیرەیەکی تر هەیە کە نزیکەی لەسەر (٦) تابلۆی نووسراوەتەوە. کە لەلایەن فالچی شاری موکیش (ئالالاخ) نووسراوەتەوە. ئەمەش بە(ئەللای تورەخ) ناودەبرێت. ئەمەش تایبەتە بە رزگارکردنی مرۆڤێك کە سیحری لێکرابێت. هەروەها زنجیرەیەکی ترمان هەیە کە نزیکەی لەسەر (٨) تابلۆ نووسراوەتەوە، ئەمەش بەزنجیرەی(شەلەششۆ)ناسراوە کە سەر بەشاری کیزۆفەتنایە. لە تێکستەکانی ئەم زنجیرەیە بۆمان روون دەبێتەوە کە چۆن تێکستە خوریەکان بەرەبەرە دەگۆردرێت بۆ سەر زمانی حیسی لە ناوچەکانی ئاسیای بچووك لەسەردەمی مەملەکەتی حیسی گەورەدا.لە سەرەتادا نووسەرە حیسییەکان بەشێکی تێکستە خوریەکانیان وەرگێڕدراوە، بەڵام دواتر بەتێپەڕبوونی کات بەجۆرێك تێکستە خوریەکان وەرگێڕدران کە هیچ شوێنەوارێکی وشەی خووری تێدا نەما، بەڵکو هەمووی بۆ سەر زمانی حیسی وەرگێڕدراوە.

ڕێوڕەسمێکی ترهەیە کە (بەشوو ــ جی) ناودەبرێت. دەورەکانی ئەم ڕێوڕەسمە لەلایەن ئەو مەلیکانەوە ئەنجامدەدرا کە خۆیان کردبوو بەخوداوەند. لەم ئاهەنگەدا هەندێك کەسی مێژووی بەناوبانگ دەبینرێت لەسەردەمی ئەکەدی وەك : سەرجۆنی ئەکەدی، مانیشتوسوو، نەرامسین،

شارکەللی شاری، ئەمە سەرەڕای بوونی هەندێك کەسی نەناسراو کە ئەم کارەیان ئەنجامـداوە وەك : (ئەوتەلوما) لە ولاتی عیلام، (ئیممەشکۆ) لە ولاتی لوللـو، (کیکلیـب ئەتـەل) لـە تـوکریش، لـە شێوازی ناوی نووسینی ئەم ناوانە بۆمان دەردەکەوێت کە ئـەم تێکـستە بریتییـە لـە تێکـستێکی خووری زۆر کۆن.کە لەبنەرەتدا تەنها بەشـێوەیەکی ســەر زارەکـی گـوتراوە، کـە مێژووەکـەی بـۆ سەردەمی ئەو دەولەتە خوریانە دەگەڕێتەوە  کە لەدوای ڕووخـانی مەملەکـەتی ئەکـەدی سـەریان هەلّداوە.

لەپالّ ئەو تێکستانەی تایبەت بە ڕێورەسمەکانی فالگرتنەوە کە هەندێك بڕگە و وشـەی خـووری تێدا بەکارهاتبوو (کە پێشتر ئاماژەمان پێ کردبووە)، ئەوا ژمارەیەکی زۆر تێکستی ترمان بەدەست گەیشتووە کە تایبەتن بەو ڕێورەسمانەی کەلـە بۆنـە جیاجیاکـان بـەکاردەهاتن. ئـەم تێکـستانەش بەزمانی حیسی نووسراونەتەوە. بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا بەئاسانی دەتوانین تێبینـی ئـەوە بکـەین کـە ناوەڕۆکی ئەم تێکستانە لەبنەڕەتدا بۆ ئەو ناوچانە دەگەڕێتەوە  کە شارستانییەتی خوریەکانی تێـدا بالاّدەست بووە. هەروەها تێبینی دەکرێت کە نووسەرەکانی ئەم جۆرە تێکستانە کـە هەنـدێك جـار ناویان نووسراوە بەزۆری لە ولاّتی کیزۆفەتنا کاهن یان فالّچی بوونە.

ئەم کۆمەلّە تێکستانەی کە تایبەتن بـەم بۆنـە ئاینیانـە بـە ڕێورەسـمە ئاینییـەکانی ولاّتـی کیزۆفەتناوە ناودەبرێن. هەندێك لەم تێکستانە لە کۆتای سـەردەمی مەملەکەتی حیسی گـەورە لـە خاتووشای پایتەخت نووسراونەتەوە.

لەنێوان ئەو کۆمەلّە تێکستانەی کە بە ڕێورەسمەکانی کیزۆفەتناوە ناسراون تێکستێك هەیە کـە بەناوی (بەللیبا) پەیوەستە. بەللیبا ناوی یەك لە مەلیکەکانی ولاّتی کیزۆفەتنایە.کـە تیایـدا لـەم تێکستەی باس لە دروستکردنی پەیکەرێك بۆ خوداوەند کەش دەکات لەشـاری کومـەنی. ئەمـەش گونجاوە بۆ ئەوەی بە یەکێك لە ڕێورەسمەکانی پاککردنـەوە لـە قەلّـەم بـدرێت. چـونکە پەرسـتگاو پەیکەری خوداوەند لە ئەنجامی ئەم بۆنەیەوە دەگۆردرێت بۆ باری خاوێنی پـیرۆز (الطهـارة المقدسـة) ئەمەش بۆ ئەوەی کە خوداوەندی تیادا بێت.

ڕێورەسمێکی تری ئایینی هەیە کە چەندین نوسخەی بەدەستمان گەیشتووە.کە تیایدا سـنوورێك بۆ ئەم بارودۆخە دادەنێت. ئەم ڕێورەسمەش لە بنەڕەتدا بۆ سەردەمی توتخالیای دووەم دەگەڕێتەوە. کە تیایدا لەم تێکـستەی باس لە چۆنییەتی گواستنەوەی خوادوەندی ڕەش (ئەمەش یەك لە نازناوەکانی خوداوەند شاووشکایە) بۆ پەرستگایەکی تری نوێ دەکات. لەم ڕێورەسمەی تایبەت بـە گواسـتنەوە، خوداوەندێتی دەجولێنرێت بۆ ئەوەی لە پەیکەر و شێوە نوێکەی جێگیر بکرێت. ئەم جۆرە تەقلیدەش

بە كرۆكی هەندێك ڕێورەسمی ئاینیی تر دادەنرێت. کەتیایدا هاتووە : چۆن دەبێت ڕێچکەیەك لە شت و مەکەکانی قوربانی پێکبهێنرێت، دواتر چۆن داوا لە خوداوەند دەکرێت بۆ تێپەڕینی بەم ڕێچکانە، ئایـا ئـەم ڕێورەسمانـەی تایبـەت بـە خاوێنکردنـەوە چـین کـە پێویـستە ئەنجامبـدرێت لـە پێنـاو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوداوەنـدەکان. ئـەم جـۆرە ڕێوڕەسمـە لـەکاتی گواسـتنەوەی پەیکـەری خوداوەندەکانی شاری دوژمن بۆ لای خۆیان ئەنجامدراوە. هەر بۆیەش ئەم جۆرە تێکستانەی تایبەت بەم جۆرە ڕێوڕەسمە ئایینیانە بەرێورەسمی بەهاناچوون ناودەبرێت. ئەمەش بەپشت بەستن بە هەنـدێك نموونەی کۆنی ڕۆمانییەکان کە هاوشێوەی ئەم جۆرە تێکستانەبوون..

تێکستە خوریەکانی تایبەت بە ڕێوڕەسمی خاوێنکردنەوە بـەوە جیادەکرێتـەوە کـە شـێوازێکی پێشکەشکردنی قوربانی تایبـەتی هەیـە. کـە ئـەم جـۆرە شـێوازە لـەناو تێکـستەکانی خاتووشـا بەدەرناکەوێت. هەروەها ئەم شێوازە زۆر بەکەمی لە تێکستەکانی وڵاتی دوو ڕووبار بەدەردەکەوێت. ئەم شێوازە خوریەش بریتییە لە پێشکەشکردنی باڵندە وەك قوربانی بۆ خوداوەندەکان.کە تیایدا ئەم باڵندانە لەکاتی قوربانیکردنیاندا دەسوتێنران یان سـەردەبڕان. لـەکاتی جێبـەجێکرنی مەراسـیمی قوربانیکردنەکەش هەندێك وشەی خووری دەگوترایـەوە کـە دەتـوانین بـە زاراوەکـانی تایبـەت بـە قوربانیکرنی لەقەڵەم بدەین، هەروەك دەتوانین ئەم زاراوانە لە ڕیزی ئەمانە تەسنیف بکەین : پیسی، تاوان، سەرکردایەتی، سەلامەتی.... هتد.

باڵندە وەك قوربانی پێشکەش بەخوداوەندەکانی جیهانی خواروو دەکـرا. ئەمــە هەرچـەندە لـە تێکستەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا ئاماژەی بۆ نەکراوە. کە تیایدا لە ڕێوڕەسمی خاوێنکرنەوە بـەهۆی ئەم قوربانییەوە پیـسی و خراپـە ڕەوانـەی جیهـانی خـواروو دەکـرا.(ئەمــەش بـەپێی بیروبـاوەڕی دانیشتوانی کۆن).

لە یەکێك لەو ڕێوڕەسمانەی کە تایبەت بوون بەلابردنی کاری خراپە لە ماڵێك کە کاری خوێناوی و سوێندخواردنی بەدرۆ و شتی تری خراپی تێدا ئەنجام درابوو. لەم ڕێوڕەسمە دا لە خوداوەنـدێك کـە ناوی لە ناو تێکستەکەدا هاتووە دەپاڕێنەوە بـۆ ئـەوەی خـوێنی شـەڕخوازەکە(تاوانبارەکـە)ی نـاو خانووەکە، بگوازێتەوە بۆ لای خوداوەندی خوێن کە ئەویش بەش بـەحاڵی خـۆی دەیگوازێتـەوە بـۆ جیهانی خواروو لەوێ جێگیری دەکات. هەروەك لەم تێکستەدا هاتووە بەم شێوەی خوارەوە[٩٩] :

(٩٩) سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە لە لیستی سەرچاوەکان :Otten 1961, 13th .

﴿ پاشان سێ باڵندە دەبەن، دوانیـان دەکرێنـە قوربـانی بـۆ خوداوەنـدەکانی ژێـر زەوی، بـەڵام ئەوەکـەی تـر بـۆ خوداوەنـدی چـاڵ (قۆڵـت) دەکرێنـە قوربـانی. پاشـان دەڵێـت: سـەیر کـەن ! ئەی............ [*]، زۆر کۆنەکان چێل یان بزنتان وەك قوربانی پێشکەش ناکرێـت، کاتێـك کـە خوادوەندی کەش (تیشووب) ئێوەی بۆ جیهانی خواروی تاریك دوور خـستەوە، تـەنها ئـەو جـۆرە قوربانییەی بۆ ئێوە دیاریکردووە ئەویش باڵندەیە.﴾.

پێش ئەمەش پێشکەشکردنی باڵندە وەك قوربانی بۆ خوداوەندەکان زانـراو بـووە. هـەروەك لـە یەکێك لە مەراسیمەکانی سوێند خواردن کە لە ئالالاخ دۆزراوەتـەوە و مێژووەکـەی بـۆ سـەردەمی بابلی کۆن دەگەڕێتەوە، کەتیایدا هەندێك زاراوەی خووری تایبەت بە قوربانی تێدا بـەدی دەکرێـت، پاشان ئەمە گواسترایەوە بۆ نێو مەراسیمەکانی خاتووشا. هەربۆیەش لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە مەراسیمی پێشکەشکردنی باڵندە وەك قوربانی بۆ خوداوەندەکان عادەتێکی کۆنی خوریەکان بـووە. بەڵام ناتوانین بڵێین کە ئەمـە عـادەتێکی زۆر بـاو بـووە لـەلای خوریـەکان پـێش گەیـشتنیان بـۆ کوردستانی سووریا، یان هەر لە کوردستانی سووریاوە ئەم عادەتەیان وەرگرتووە. ئەمـەش چـونکە لەناوچە خوریەکانی رۆژهەڵات[**] بەڵگەی تەواومان لەبەردەست دانییە. هەر بۆیە لێرەدا ناچـارین ئاماژە بە مەراسیمی چۆنییەتی پێشکەشکردنی باڵندە وەك قوربانی بکەین لە کتێبی تـەورات لـە (سفر اللاويين : ١٤:١ـ٨) کە تیایدا هاتووە :

﴿ خوداوەندی چاڵ کە لە تێکستەکانی تایبەت بە فاڵـەکانی خوداوەنـدەکانی جیهـانی خـواروو داهاتووە، بریتییە لەو خوداوەندەی کە تەمسیلی چاڵ (قۆڵت) دەکات کە لە زمـانی ئەکـەدی پێـی دەڵێن (ئابی) کە ئەمەش دەرگای خوداوەندی پێکدەهێنا کە لێیەوە بـۆ جیهـانی خـواروو دەچـێت (واتە دانیشتوانی کۆن بیروباوەڕیان وابوو کە چاڵ دەرگایەکە مرۆڤ بەجیهانی خـواروو دەگەیـەنێت). هەڵکۆڵینی ئەم جۆرە چاڵانەش ئەرکی کاهن بووە. ئەمەش بەپێی ئەو زانیارییـانەی کە لە ژمارەیەك لە مەراسیمەکانی (خووری ــ حیسی)دا هاتووە. مەبەست لە هەڵکۆڵینی ئەم جۆرە چاڵانەش بریتی بووە لە ئاسان کردنی گەیشتنی قوربانییەکان بۆ خوداوەندەکانی جیهانی خواروو کۆکردنەوەی کـاری

---

(*) لەم بەشەدا تێکستەکە تووشی تێکچوون بوە بۆیە ئەم خاڵانە دانراوە.

(**) ئەمەش چونکە ناوچە خوورییەکانی رۆژهەڵات بەشی هەرەزۆری لە کوردستانی عێراقە کە رژێمی بەعس بەڵگەکانی لەناو بردووە یان شێواندوویەتی هەربۆیەش بەڵگەکانی تایبەت بە خوورییەکان ژمارەیان کەمە یان هەرنییە.

خراپ وپیس لەناویاندا. چونکە هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە جیهانی خـواروو تـەنها شـتی خراپ و پیسی تێدایە بەپێی بیروباوەری دانیشتوانی کۆن. لەم چـالآنە هەنـدێك مەراسـیم بەئـەنجام دەگەیەنران کە تیایدا بانگی خوداوەندە ونبووەکانی جیهانی خواروو دەکرا. ئەم وشە خوریەی کە بـە مـانای چالْ وخوداوەندی بەرپرس لەچالْ دێت زیاتر لە چەندین شوێن ئامـاژەی پێکـراوە لـە کتـێبی تەوراتدا. هەروەك لە ﴿ سفر صـموئیل الأول ٢٨﴾ کـە تیایـدا باسـی ئامادەکـاری رۆحـەکان لـە شاری(عەین ــ دوور)دەکات بەوەی کە خاوەنی جنۆکەیە. مەبەستی لەمەش ئـەو چـالّەیە کـەوەك ئەلقەی پەیوەندی بێت لە نێوان جیهانی سەروو جیهانی خواروو.

هەندێك رێورەسمی ئایینی تری تایبەت بە خاوێنکردنەوەی خوریەکان هەیە. ئەم رێورەسمانەش لە نێو حیسییەکان گواستراوەتەوە. هەروەها هاوشێوەی ئەم رێورەسمانەش لە تەورات لە سفری (اللآویین ١٦) دا هەیە، کە تیایدا لەچوارچێوەی رێورەسمی چۆنییەتی خاوێنکردنەوەی پەرستگا ئاماژەدەکرێت کە چۆن کاهن دەست لەسەر سەری تەگەیـەك (مـەری نێـر) دادەنێـت. پاشـان لەپەرسـتگا دووری دەخاتەوە و دەیبات بۆ بیابان. لە ئەنجامی ئـەم دەسـت لەسـەردانەش ئاژەڵەکـە دەبێتـە هـەلگری پیسییەکە و ناوچەکەش پاك دەبێتەوە. هەروەك لە رێورەسمـەکانی کیزۆفـەتنا بـە چـەندین شـێوەی جیاجیا ئاماژە بە تەگەی پیس کراوە. هەروەك لەم تێکستانە ئاماژەدەکرێت کە هـەلگری پیسـایی لـــەسەر شێوەی ئاژەلی جۆراو جـۆری وەك : (چـێل، مـەرومالآت، بـزن، گـویْ درێـژ، مـشك) بەدەردەکەوێت. هەلگری پیسی لە زمانی خووری بە (نەککوششی) ئاماژەی پێدەکرا. ئەم وشەیەش لەزمانی خووری بەمانای بەجێهێلْراو دێت. لە کتێبی تەورات لە سفری لاویین کە دەلّێـت : تەگـەی پیس بوو (التیس الأثیم) گواسترایەوە بۆ بیابان ولەویْ بەجێهێلدرا.(یان گواسـترایەوە بـۆ عـەزازیل هەروەك لەتەورات داهاتووە). وشەی عەزازیل تاکو ئێستا نازانرێت ماناکەی چییە. بەلآم بە پـشت بەستن بە رێورەسمی ئایینی خاوێنکردنەوەی خوریەکان هەندێك لە توێژەرەکان ماناکەی بـەم جـۆرەی خوارەوە لێك دەدرێتەوە:

﴿لە رێورەسمەکانی سوێند خواردن ــ شعائر القسم ــ کـە لـە لاپـەرەکانی پێـشوو ئاماژەمـان پێکرد وەسفی قوربانی خاوێنکردنەوە دەکرێت و بە وشـەی (ئـەزەزخوم)نـاو دەبرێـت. هـەروەك لـە رێورەسمە ئایینییەکانی ئیتکەلزی هەمان وشە بەشێوەی (ئازوزخی)دەردەکەوێت لەپالْ هەندێك وشە کەدەلالەت لە پیسی وکاری خراپ دەکات. پاشگری ــ خی ــ لە وشەی ئازوزخی لەزمانی خووری پاشگرێکی زۆر باوە. ئەم پاشگرە دەلالەت لە رێژە دەکات. کەواتە لێرە دا بۆمان دەردەکەوێت کـە رەگی وشەکە بریتییە لە (ئەزەز)یان (ئەزوز). بەلآم لە زمانی سامییەکان ــ دانیـشتوانی دورگـەی

عەرەبی ــ وشەی عەزازیل لەرەگی (ع،ز،ز)دارێژراوە. بەڵام لە زمانی ئەکەدی بەمانای توورەبـوون دێت، بەڵام لەزمانی جوولەکەکان (عبریەکان)بەمانای ـ هێز ـ دێت. لێرەوە دەتوانین بڵێین کە وشەی ئازوزخی خووری لە زمانی ئەکەدییەکان وەرگیراوە.وەدەتوانین برگەی (بـۆ عـەزازیل) بـەمانای (بـۆ توورەبوونی ؟خوداوەند) لێك بدەینەوە. ئەمەش بە پشت بەستن بـە تێروانینێکـی ئـایینی زۆر کـۆن دەردەکەوێت، کە ئەویش دەقـاودەقکردنی (متـابق کردنـی) نێـوان توورەبـوونی خـوادیی و کـاری خراپ(پیسی) جادوویە.

هەروەها لە سەرچاوە کۆنەکانی ئاسیای بچووك هەندێك هاوجووت بوونی جادوویی تر هەیە کـە تەنها لە ژینگە خوریەکان بەکاردەهات وەك : (دڵی ئاژەڵ)کە ئەمەش وەك بەدیلەك بەکاردەهات بۆ لابردنی پیسی و کاری خراپ لە پیاوەك.کە بەمەش پیسی لە پیاوەکە هەڵدەگرێت و پاك دەبێتـەوە لە گوناە.

بەڵام پێویستە لەسەرەخۆ و وردبین بین لە پرۆسەی پۆلین کردنی مومارەسە جادووییەکان لە سەر بنەماکانی ڕەگەز یان زمان یان شارستانییەتی بێت، چونکە بیرۆکەی جادوویی لە گـشت گـەردوون لەسەر بنەمای وێکچوون دەبێت کە لە جێبەجێکردنی پرۆسـە هاوشـێوەکانی دەردەکـەوێت. بـەڵام ئەمە نابێتە بەڵگەیەك لەسەر بونی پەیوەندی مێژووی لەنێوانیان.

دەربارەی ڕێورەسمەکانی ناشتنی مردووەکان لەلایەن خوریەکان زانیاری کەمان لەبەردەست دایە. زۆر لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژە دەکەن کە تەرمی مـەلیکی میتـانی (باراتارنـا) سـوتێنراوە. بـەڵام داواتر بۆمان دەرکـەوت کـە ئـەم بۆچـوونە پـشتی بـە شـیکردنەوەیەکی هەڵـە بەسـتووەو ڕاسـت نییە.چونکە تووشراتا مەلیکی مەملەکەتی میتانی لە نامەیەکمی بۆ فیرعـەونی میـسری ئامـاژە بەوە دەکات کە دەیەوێت (کەرشەك) بۆ باپیری بنیات بنێت. کەرشەك بریتییە لە پەرستگایەك بـۆ مردووەکان یان شێوەیەك لەشێوەکانی گۆڕە کە لە بەرد دروستدەکرێت. هەروەها لە تێکـستێك لـە نووزی باس لەهەندێك پەیکەری بچووك دەکات کە تەمسیلی ڕۆحی مردووەکانی کردووە. ئەمـەش بەڵگەیە لەسەر بوونی گرنگی یان پیرۆزییەکی تایبەتی مردووەکان لەلایەن خوریەکان.

بەڵام ئەوەی کە پەیوەستە بەرێوڕەسمی چۆنییەتی ناشتنی مردووەکان ئەوا ئێمە هیچ زانیارییەکی وامان لەبەردەستدا نییە کە شایانی باسکردن بێت. بەڵام هیواخوازین لە داهاتوویەکی نزیك زانیاری نوێمان بەدەست بگات ئەویش لەئەنجامی ئەو هەڵکۆڵینە شوێنەوارییانەی کە لەناوچەکانی باکووری وڵاتی دوو ڕووبار (کوردستانی عیراق) ئەنجامدەدرێت.

## ئــەدەب

خوریــەکانی وڵاتــی هــیلال خەســیب هــەر لــە کۆنــەوە بەشــداریان لــە تۆمــارکردنی فۆلکلــۆری شارستانییەتی سۆمەری و ئەکەدی کردووە، ئەمەش لەشێوەی ئەو تێکستانە دەردەکـەوێت کـە لێـك جیاکردنەوەیان کارێکی گرانە هەربۆیە گشت ئەم تێکستانە بەتێکستە ئەدەبییەکان وەسفدەکرێن.

لەوەسفکردنی ئەم تێکستانە گرنگ ئەوەنییە کە پشتمان بەستاوە بـەپێوەری نـاوەڕۆك یـان شـێوە شیعرییەکەی ئەم تێکستانە. بەڵام گرنگ لەوەدایە کە ئەم تێکستانە چەندین جار کـۆپی کـراون، کـە ئەمەش بۆ مەبەستی ڕاهێنان بووە. لـەم کۆپیکردنـەدا ڕەنگدانـەوەی تـەیاری فۆلکلـۆری و شـێواوی تەقلیدی نووسینی پێوەدیارە. ئەم کۆمەڵە تێکستە نووسراوانە لیستی هێماکانی نووسین و فەرهـەنگی زمانەوانی و لیستی وشە: مرادفەکان، سەرەڕای کۆمەڵەی تێکسـتەکانی تری تایبەت بە پێشبینی کردن و فالگرتنەوە و ئەفسانە و مەلحەمە وچیرۆکە ئەفسانەییەکان و پەند و........ هتـد لـە خۆدەگرێـت. چینێکی تری ئەم تێکستانە پەیوەندی بە تەیارێکی تری فۆلکلۆری هەیە کـە بەشـێوەیەکی سـنووردار بەدەستمان گەیشتووە. واپێدەچێت ئەم چینە خرابێتە نێو تێکستە ئەدەبییەکان دوای ئـەوەی شـێوازی دەربڕینەکەی ئاڵوگۆڕکراوە.کە لێرەدا مەبەستمان لەو شیعرەیە کە بەزارەکی گوتراوە.

بەشێوەیەکی گشتی تێکستە ئەدەبییەکان پێشکەوتنێکی بەرچاویان بـەخۆوە بینیـوە لـە مـاوەی هەزارەی سێهەم و دووەمی پـێش زایـن. بـەجۆرێك کـە گەیـشتە پلەیـەك کـە خـاوەنی بنەمایـەکی دیاریکراوو پێکهاتەیەکی جێگیر بووە. ئەمەش بەردەوام بوو تاکو کۆتایی هاتنی فۆلکلۆری نووسـراوی شارستانییەتی وڵاتی دوو رووبار.

نووسەرە خوورییەکان بەشێوەی جۆراو جۆر بەشداریان لە دەوڵەمەند کردنی شارسـتانییەتی وڵاتـی دوو رووبار کردووە، لە گرنگترینیان ئەمانەن :

١- ئەو بابەتانەی کە لە وڵاتی دوو رووبار زۆر باو بوو خوریەکان وەریانگرت و جارێکی تـر بەشـێوازی تایبەتی خۆیان دایانرێشتەوە و نووسیویانەتەوە.

٢- خوریەکان چەندین تێکستیان وەرگێرا بۆ سەر زمانی خۆیان (زمانی خووری).

٣- ئەو ڕووداوانەی کە بەشێوەیەکی زارەکی وەك ئەفسانە یان چیرۆك دەگێردرانـەوە، ئـەوا خوریـەکان وەریان گرت وجارێکی تر بەزمانی خووری و بەشێوازێکی تری نویێ نووسیویانەوە.

٤- خوریەکان بە تەواوی چوارچێوەی تێکـستە ئەدەبیـەکانیان فراوانکـرد ئـەویش بـە خـستنە پـاڵی تێکستەکانی تایبەت بەئەفسانە و فاڵ لە فۆلکلۆری تایبەتی خۆیان.

لە پایتەختی مەملەکەتی میتانییەکان تاکو ئێستا هیچ کتێبخانەیەك نەدۆزراوەتەوە. بۆیە ئەوەی ئێمە بۆمان دەرکەوتووە لە وەرگرتنی خوریەکان و گرنگی دانیان بە ئەدەبی سۆمەری و ئەکەدی بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێکستانەی کە لە خاتووشا و ئۆغاریت و ئیمار دۆزراونەتەوە. هەروەك لە گردی عەمارنە لە ولاتی میسر هەندێك تێکستی ئەدەبی نووسەرە خوریەکان دۆزرایەوە. (سەیری وێنەی ژمارە ٩ بکە)

زیاتر لەجارێك تەئکید لە سەر دەوری خوریەکان کراوەتەوە لە سەر گواستنەوەی ئەدەبی سۆمەری ــ ئەکەدی بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت زیادە ڕۆی تێدا بکرێت" لە هەندێك سەرچاوە بۆمان دەردەکەوێت کە قوتابخانەی تایبەت بە فێرکردنی نووسین و خوێندنەوەی زۆر پێشکەوتوو لە کوردستانی سووریا (باکووری سووریا) لەسەردەمی بابلی کۆن هەبووە. ئەم قوتابخانانە هەولیاندەدا کە بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بن. هەروەها ئەم قوتابخانانە پەیوەندییان لەگەڵ پێشکەوتنی ئەدەب لە ولاتی بابل هەبووە.

لەماوەی چاخی برۆنزی کۆتایی پەیوەندییەکی پتەو هەبووە لەنێوان قوتابخانە حیسییەکان و ئەوانەی کوردستانی سووریا و بابل و ئاشوور. تێکستە دۆزراوەکانی ئەو کتێبخانەیەی کە بەم دواییە لە شاری ئیمار دۆزرانەوە تیشك دەخەنە سەر ئەم جۆرە پەیوەندییە و ڕوونی دەکەنەوە[١٠٠].

دەتوانین بلێین کە نووسەرە خوریەکان بەشداریان لە جۆرە ڕۆشنبیرییەك کردووە کە لە گشت سنوورێکی زمانەوانی و سیاسیی و ئایینی دەرچووە. ئەمەش لە تێکستێکدا دەردەکەوێت کە تیایدا لە پاڵ ئەو ستوونەی کە وشە سۆمەریەکانی تێدا نووسراوەتەوە، ستوونەکی تر هەیە کە مانای وشە سۆمەریەکانی بە زمانی خووری تێدا نووسراوەتەوە. ئەو زمانە خوریەی کە لە نووسینەوەی ئەم تێکستە دا بەکارهاتووە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو زمانە خوریەی کە لە تێکستەکانی نیوەی دووەمی

---

(١٠٠) پشکنینەکانی نێردەی فەرەنسییەکان لە ناوچەی ئیمار (گردی مەسکەنە کە لە دووری ٩٠ کم لە رۆژهەلاتی شاری حەلەب دایە) بە سەرپەرشتی مارگۆن لە ماوەکانی (١٩٧٢ ــ ١٩٧٤ ز) بووە هۆی دۆزینەوەی زیاتر لە (١٥٠٠) تابلۆی مێخی کە تێکستەکانی بە زمانەکانی سۆمەری و ئەکەدی وخووری و حیسی لەسەر نووسرابوونەوە، زۆربەی ئەم تێکستە مێخیانە بۆ سەدەی (١٣ پ.ز) دەگەڕێتەوە. بەشی هەرەزۆری ئەم تێکستانە تایبەتن بە کتێبخانەی یەك لە فالچییەکانی ئەو سەردەمە. توێژەر(ئارنۆ ــ Arnaud) هەڵستا بە بلاوکردنەوەی تێکستە سۆمەری و ئەکەدییەکان کە نزیکەی ژمارەیان (٨٠٠) تێکست دەبوو، بەلام تێکستە خووری وحیسییەکان تاکو ئێستا بلاو نەکراوەتەوە.

هەزارەی دووەمی پێش زاین بەکارهاتووە. ئەم جیاوازییەی نێوانیـان بـەجۆرێك بـوو کـە هەنـدێك لـە توێژەرەکان وتیان ئەمەی دوایی بەزارێکی تایبەتی نووسراوەتەوە.

هەروەها لە شاری ئۆغاریت هەندێك پارچەی شکاوی تێکستی نووسراو دۆزراوەتـەوە. کـە تیایـدا بۆمان دەرکەوت کە ئەم پارچە تێکستە شکاوانە لیستی وشەکانیان بەشێوەیەکی تەرتیب کراو لەسـەر نووسرابوو. تەرتیب کردنی وشەکانیش لەم لیستانە لەسەر بنەمای شێوەی هێماکانی نووسینی مێخـی بووە. ئەمانەش بەهەمان شێوەی تێکستەکانی تر بۆ چەند ستوونێك بەشکرابوون.کە ستوونی یەکەم بۆ وشە سۆمەرییەکان و ستوونی دووەم بۆ وشە ئەکەدیەکان و ستوونی سێهەم بۆ وشە خوریەکان وستوونی چوارەم بۆ وشە ئۆغاریتییەکان تەرخانکرابوون. بوونی ستوونی خووری لە پێش ستوونی ئۆغـاریتی بـۆ مان دەردەخات کە ئەم جۆرە لیستانە لەرێگەی قوتابخانە خوریەکانـەوە گواسـتراوەتەوە بـۆ قوتاخانـە ئۆغاریتییەکان.

هەروەها لە ئۆغاریت بەهەمان شـێوە لیـستێك بـەناوی خوداوەنـدەکان هەیـە کـە بەسـێ زمـان نووسراوەتەوە ئەوانیش (سۆمەری ــ خووری ــ ئۆغاریتی). لەسەر هەمان لیستی ناوبراو فەرهەنگێك هەیە کە بە چوار زمان نووسراوەتەوە.لیستی خوداوەندەکان بەم شێوەیەی کـە بەدەسـتمان گەیـشتووە گونجاوە لەگەڵ زنجیرەی خوداوەنـدەکانی (سـۆمەری ـــ ئەکـەدی) (AN = Anum) لەگـەڵ بـوونی هەندێك جیاوازی لە نێوانیان. هەروەها لە نیمار لیستێکی هاوشێوەی لیستەکەی پێـشوو دۆزرایـەوە، بەڵام ئەمەیان بەدوو زمان نووسرابووەوە کە ئەویش زمانەکانی (سۆمەری، خووری) واتە زمانی سێهەم کە ئۆغاریتی بوو لەم تێکستەدا نەبوو.

پێشتر ئاماژەمان بە هەندێك تێکستی شکاو و پارچە پارچـە بـوو کـرد. ئـەم پارچـە تێکـستانە هەندێك لە پێشبینییەکانی بابلیەکان کە بۆ سەر زمانی خووری وەرگێردرابوو لەسـەر تۆمـار کرابـوو. تابلۆیەکی تر هەیە کە پێشبینی ڕوودانی بوومەلەرزە دەکات. ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر بڵاوبوونـەوەی کۆمەڵەی پێشبینییەکانی ئەکەدییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوچە خوریەکان. ئەمەشـیان لـەڕیزی زنجـیرەی پێشبینییە بابلیەکان دەربارەی فەلەك ناسی کە بە (ئینۆما ئانۆ ئیلیش) ناسراوە دادەنرێت.

لە نموونەی ئەو جۆرە ئەدەبەی کە بە ئەدەبی دانایی (أدب الحکمـة) ناسراوە دانەیەکی لە ئۆغاریـت دۆزرایەوە. ئەمەش بریتییە لە تێکستێك کە لە هەشت دێڕ پێکهاتووە کە بە زمانی ئەکەدی نووسـینی مێخی نووسراوەتەوە هەروەها لەپاڵ ئەمـەش لەسەر هەمان تابلۆ ماناکەی بۆ سـەر زمـانی خوریـەکان وەرگێردراوە.

لەنێوان ئەو داستانانەی کە لەبنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی نێوان دوو ڕووبار کە تاکو ئێستا بەدەستمان گەیشتوون، تەنها یەکێکیانە کە بەزمانی خووری نووسراوتەوە، ئەویش داستانی گەلگامێشە کە مەلیکی شاری ئۆرۆك بووە لە سەردەمی بەرەبەیانی بنەماڵەکان. ناتوانین شوێنی نووسین و داڕشتنی ئەم داستانە دیاریبکەین لەبەر زۆری ئەو سەرچاوانەی کە ئەم بابەتەیان گێڕدراوەتەوە. ئەمەش چونکە چیرۆکە جیاوازەکانی سەردەمی بابلی کۆن دەربارەی گەلگامێش لە دەوروبەری هەزارەی دووەمی پێش زایین بەشێوازێکی نوێ نووسراوەتەوە و چاودێری ڕێزمانی تێدا تەواو ڕەچاو کراوە. ئەم چیرۆکەش لەسەر (١٢) تابلۆی قورین نووسراوەتەوە. هەرچی دانە کۆنەکانی ئەم چیرۆکەن بەتایبەتی ئەوانەی کە بۆ سەردەمی بابلی کۆن و سەردەمی بابلی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە ئەوا بەشێوەیەکی ناتەواو بەدەستمان گەیشتووە. هەروەها ئەو تێکستانەی کە ئەم چیرۆکەیان بەزمانی خووری لەسەر نووسراوەتەوە گشتیان لەشاری خاتووشا دۆزراوەتەوە و زۆر بەکورتی نووسراونەتەوە. ئەمەش چونکە تابلۆکان بەشکاوی بەدەستمان گەیشتوون.

بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئاشکرایە کە دوو کۆمەڵە تێکستی جیاواز هەیە کە کارەکانی گەلگامێشی لەخۆگرتووە. کۆمەڵەی یەکەم بەناوی (ئەژدیهای دارستانی ئیرز)ە. ئەم ئەژدیهایە بە (خواوە) ناودەبرێت. لە نێوان (١٢) تابلۆکەی تایبەت بەم داستانە ئەم بەشەیان لە تابلۆی یەکەم تاکو تابلۆی پێنجەم لەخۆ دەگرێت، ئەوەی کە باسی ئەمەیان دەکات کە ڕووداوەکانی زیاتر لەسەر ٤ تابلۆ نووسراوەتەوە. بەڵام کۆمەڵەی دووەم بەگەلگامێش ناوبراوە.

حیسییەکانیش جارێکی تر چیرۆکی گەلگامێشیان نووسیوەتەوە. ئەمەش دوای ئەوەی لە خوریەکانیان وەرگرتووە و پاشان بەزمانی حیسی نووسیویانەتەوە، ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چیرۆکی گەلگامێش لە زمانی خوری نووسراوەتەوە ئەوەیە کە ناوی گەلگامێش تیایدا بەشێوازە کۆنەکەی (بێلگامێش) ئاماژەی پێکراوە. ئەم ناوەش (بێلگامێش) لەسەردەمی ئەکەدی کۆن و لەسەردەمی هەردوو بنەماڵەی ئیسن ولارسە زۆر بەکارهاتووە، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە بەکارهێنانی ناوی بێلگامێش لە چیرۆکە خوریەکان بەڵگەیە لەسەر کۆنی چیرۆکەکە یان بەلایەنی کەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی ئەکەدی دەگەڕێتەوە.

## هونەری شێوەکاری (الفن التشکیلی)

بەشێوەیەکی گشتی ناتوانین لەناوچە خوریەکان وەسفی هونەری شێوەکاری بکەین، چونکە هیچ پەیکەرێکی شوێنەواری لەناوچە خوریەکان نەدۆزراوەتەوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەو بەڵگە هونەریانەی کە تاکو ئێستا لە ناوچە خوریەکان دۆزراونەتەوە دوو جۆرن کە ئەمانەن :

١- هونەری دروستکردنی گلێنە و ڕازاندنەوەی. (سەیری وێنەی ژمارە ١٣- ١٤- ١٥- ١٦ بکە).

٢- هونەری دروستکردنی مۆری لوولەیی. (سەیری وێنەی ژمارە ٧ بکە).

لەم دوو جۆرەدا نموونەی هونەری خوریەکان بۆمان دەردەکەوێت کە یەك پارچەیی مەملەکەتی میتانی ڕێخۆشکەر بووە بۆ خێرایی بڵاوبوونەوەی داهێنانە هوونەریەکانی خووریەکان. هەر بۆیە جێگای خۆیەتی باس لە هونەری مەملەکەتی میتانی بکەین. بەڵام لە بەکارهێنانی زاراوەی هونەری خوری ئەوا تووشی چەند کێشە و زەحمەتییەك دەبینەوە. گرنگترینیان کە پێویشستە تێروانینێکی هونەری یەکگرتوو هەبێت لە سنووری ناوچە خوری نشینەکاندا، لە ماوەیەکی درێژ کە لە کۆتایی هەزارەی سێهەمی پێش زایین تاکو سەدەی ١٤ پێش زایین. ئەمەش شتێکە کە تاکو ئێستا لە نموونە هوونەریەکانی خوریەکان وەك گلێنەکاری و مۆرە لوولەییەکان بەدەست نەهاتووە.لە شاری ئورکیش کە دەکەوێتە باکووری وڵاتی دوو رووبار (کوردستانی عێراق) پەیکەری دوو شێری درووستکراو لەبرۆنز دۆزرایەوە لەسەر هەر یەکێك لەم دوو شێرە نووسینی مێخی هەبوو. لەئەنجامی ئەم نووسینە بۆمان دەرکەوت کە پەیکەری ئەم دوو شێرە وەك بەردی بناغەی تایبەت بە دروستکردنی پەرستگای خوداوەند نەرگال بووە لەسەردەمی مەلیك (تیش ـــ ئەتەل). ئەم دوو پەیکەرەش تاکە بەڵگەن لەسەر داهێنانی هونەری خوریەکان لە ماوەی کۆتایی هەزارەی سێهەمی پێش زایین. (سەیری وێنەی ژمارە ١٠ بکە). پەیکەری ئەم دوو شێرە بەشێوەیەکی زۆر جوان و شارەزایانە دروستکراوە. هەرچەندە کاریگەری شێوازی هونەری وڵاتی دوو رووبار بە پەیکەری ئەم دوو شێرەوە دیارە، بەجۆرێك کە هیچ تایبەتمەندییەکی ناوەخۆیی یان داهێنانێکی بنەڕەتی نوێی تێدا بەدەرنەکەوتووە.

توێژەرەکان سەلماندیان کە کاریگەریەکی هونەری خووری بەهێز هەبووە، کە ڕەنگدانەوەی خۆی هەبووە لە کارە هونەریەکانی وەك (هەڵکۆڵینی دەرپەریو، هەڵکۆڵینی بەرجەستە) (نەحتی بارز، نەحتی مجسسم). بەتایبەتی ئەو کارە هونەریانەی کە لە دەولەتەکانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵاتی ئەنادۆڵ و باکووری سووریا (کوردستانی تورکیا و سووریا) دۆزراونەتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە بۆ کۆتایی سەردەمی مەملەکەتی حیسی گەورە و سەردەمی حیسی کۆتایی دەگەڕێتەوە.لەبەر ئەوەی

ئەو بەڵگانەی کە دەربارەی هونەری خوریەکان هەیە تاکو ئێستا نەناسراون. توێژەرەکان نەناسینی تایبەتمەندییەکانی هونەری خوریەکانیان بۆ کەمی پارچە شوێنەوارییە دۆزراوەکان لە باکووری سووریا گەڕاندەوە.

هەروەك هەندێکی تر لە توێژەرەکان دەڵێن ناوەرۆکی فیکری ئەو کارە هونەریانەی کە بۆ یادگاری دروستکراون و لە ئاسیای بچووك دۆزراونەتەوە، ئەوا هەر لەسەرەتاوە لە ئاسیای بچووك دروستکراون و بۆ هیچ بنەڕەتێکی یان ئەسڵێکی بیانی ناگەڕێتەوە. هەر بۆیەش ئەم کۆمەڵە توێژەرانە چاوەڕێی دۆزینەوەی هیچ بنەڕەتێکی هونەری خوریەکان ناکەن لە سەردەمی مەملەکەتی میتانی.



پەیکەرێك لە پەرستگای نەرگال لە ئورکیش (١٩٧٠ پ.ز)

لە بەناوبانگترین کارەکانی شێوەکاری بەرجەستە (الفن المجسم) لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میتانییەکان لە سەدەی پانزەی پێش زاین بریتییە لە پەیکەری ئیدریمی مەلیکی ئالالاخ. مەلیك ئیدریمی لەم پەیکەرەدا بەشێوەیەکی دانیشتوو لەسەر تەختی دەسەڵاتی خۆی دەردەکەوێت. ئەم پەیکەرەش کاریگەری هوونەری کۆنی سووریای پێوە دیارە.

لەناو یەکێك لە بیرەکـانی پەرستگای خوداوەنـد ئاشـوور لـە شـاری ئاشـوور پارچـەیەکی شوێنەواری دۆزرایەوە کە بریتییە لە وێنەی خوداوەندی چیا کە لەگەڵ دوو بزنـی کێـوی دایـە. بەپشت بەستن بە تایبەتمەندییە مێژوویی و هونەریەکانی ئەم پارچە شـوێنەوارییە مێژوویەکـەی بۆ سەدەی پانزەی پێش زایین دەگەڕێتەوە. ئەم پارچە شـوێنەوارییە بەنموونەیـەکی تایبەتمەنـدی هوونەری خوریەکان دادەنرێت لە ماوەی سەردەمی حوکم کردنی مەملەکەتی میتانیـدا. بـەڵام هەندێك لە توێژەرەکان بەم دواییە دەڵێن کە مێژووی ئـەم پارچـە شـوێنەوارییە بـۆ سـەردەمی ئاشـــووری کـۆن دەگەڕێتـــەوە. هـــەروەك هەنـــدێك نموونـــەی نایـــابی هونـــەری پەیکەرســـازی خوورییەکانمان بەدەست گەیشتووە لەوانەش سەری بزنێکی شاخدار کە لە ئالا لاخ دۆزرووەتـەوەو مێژووەکەی بۆ سەردەمی باڵادەستی دەوڵەتی میتانیەکان دەگەڕێتەوە (سـەیری وێنـەی ژمـارە ١١ بکە). هەروەها لەشاری نوزی لەسـەر دیواری یەکێك لە کۆشـکەکانی مـەلیکێکی خـووری نەناسراو وێنەیەکی رەنگاو رەنگی نایاب دۆزراوەتەوە کە چەندین دیمەنی ئەندازەیی و رووەکی و ئاژەڵی و مرۆیی لە خۆگرتووە، (سەیری وێنەی ژمارە ١٧ بکە)

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە هونەری شێوەکاری خوریەکان لەژێر کاریگەری داب و نەریت و شێوازی ناوەخۆیی بـووە. بـەڵام چـالاکبوونی لایـەنی کـارە هونەریـە رێکوپێکـەکان یارمەتیدەر بووە لە سەر بڵاوبوونەوەی شێوازی هونەری و بابەتی فیکـری نـوێی دیـاریکراو لـە سنووری جوگرافی فراوانی وڵاتەکەدا.

لەماوەی سەدەی ١٥ پ.ز چەند جۆرێکی نوێی گلێنە لە رۆژهەڵاتی کـۆن سـەریان هەڵـدا. ئەم جۆرە نوێیەی گلێنە بەشێوەیەکی فراوان لەناو خاکی مەملەکەتی میتانی بلاوبووەوە. واتـە لە مەڵبەندی مەملەکەت و هەروەها لـەو ناوچـانەی کـە بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ لەلایـەن مەملەکـەتی میتـانی بـەڕێوەدەبران لـە رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا. ئـەم جـۆرە گلێنـە بەشـێوازە تایبەتییەکەی و زەخرەفە جوانەکانیان جیادەکرێنەوە. لەنێوان ئەم گلێنانە بەزۆری کاسەی درێـژ و بنکە بچووك دەبینرێت.کە لەسەر شێوەی دوگمـەی قۆپـچە دەردەکـەون. رووی دەرەوەی ئـەم جۆرە گلێنانە بەرەنگە تۆخەکانی وەك (گەنمـەکی سۆرباو، رەش) رەنگکراون، بـەڵام وێنـەکانی سەریان بەرەنگی سپی وێنەکێشراون. وێنەکانیش بریتی بـوون لـە هەنـدێك وێنـەی ئەنـدازەیی وەك: {حەلەزۆنی، سێگۆشە، شەریتی مەزفوور، هێڵـی خـواروخێچ} ئەمـە سـەرەرای بـوونی وێنەی هەندێك زیندەوەرو رووەکـی وەك :{ باڵنـدە، بـزن، گـەڵای دارخوورمـا} لەسـەر رووی گلێنەکە.

ئەم جۆرە گلێنەیەش بەگلێنەی نووزی ناوبانگی دەرکردووە. ئەمەش چونکە بۆ یەکەم جار لە شاری نوزی (کەرکووك) دۆزرایەوە، پاشان لەچینی چوارەمی شاری ئالالاخ دۆزرایەوە. ئەم جۆرە گلێنەیە تاکو کۆتایی سەدەی ١٣ پ.ز بەردەوام بوو لەبەکارهێناندا واتە دوای کۆتای هاتنی مەملەکەتی میتانی بەماوەیەکی درێژ ئەم جۆرە گلێنەیە هەر باو بووە لەبەکارهێناندا.

لەقۆناغی کۆتایی سەردەمی بلاوبوونەوەی ئەم جۆرە گلێنەیە جۆرێکی تری نوێی تیادا سەری هەلّدا کە ئەمەیان بەگلێنەی عەتشانە ناسراوە. عەتشانە ناوی تازەی ئەو ناوچەیەیە کە لەکۆن بە ئالالاخ ناوبانگی دەرکردبوو. گلێنەی عەتشانە بە زەخرەفە رووەکییە رێکوپێکەکانی دەناسرێتەوە. پێکهاتەی ئەو ڕەنگانەی کە ئەم جۆرە گلێنەی پێ ڕەنگ کراوە تارادەیەك لە ڕەنگی وێنەکانی کۆشکەکانی دورگەی کریت دەچێت. ئەمەشیان مێژووەکەی بۆ سەردەمی پێش سەرهەلّدانی گلێنەی نووزی دەگەڕێتەوە. (سەیری وێنەی ژمارە ١٤ بکە)




A,B,C : نموونەکانی گلێنەی نووزی.(شێواز :گلێنەی نووزی)

D,E,F : نموونەکانی گلێنەی گردی براك (شێواز : گلێنەی نووزی)

G,H,I : نموونەکانی گلێنەی ئالالاخ (شێواز : گلێنەی گردی عەتشانە).

چاپی ئەو مۆرە لوولەییانەی کە لە سەر تابلۆ قورینەکان لە شاری ئاررابخا دۆزراونەتەوە بە شێوازە تایبەتییەکەی خۆیان دەناسرێنەوە. ئەو مۆرە لولەییانەی کە لەشاری ئارابخا دۆزراونەتەوە ئەمڕۆ بە مۆری کەرکووك ناسراون. ئەو مۆرە لوولەییانەی کە لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی مەملەکەتی میتانی و ناوچەکانی تری دەرەوەی دەسەلاتیان دۆزراونەتەوە لە رووی هونەرییەوە هاوشێوەی مۆرە لوولەییەکانی ئارابخان. هەربۆیە ئەوانە هەر بە مۆرە لوولەییەکانی کەرکوك ناودەبرێن. بەشی هەرە زۆری ئەو مۆرە لوولەییانە لە ماددەیەك دروستکراون کە ئەمڕۆ شوشەی لێ دروستدەگرێت.هەروەك پەلەکردن لە دروستکردن و خێرا تەواو کردنی ئەم مۆرە لولەییانە بە شێوەیەکی ئاشکرا بە رووخساری مۆرە لولەییەکە دیارە. هەروەها نەقش و وێنەکانی سەر مۆرەکە بەیارمەتی ئامێرێکی کونکەری نوك تیژ دروستکراوە. ئەم جۆرەی مۆرە لولەییەکان بە (نموونەی سادە) ناسراوون. لەئەنجامی خێرایی تێکچوونی ئەو ماددانەی کە ئەم جۆرە مۆرانەی لێ دروستکراوە ئەوا بۆ چەندین جار ئالوگۆڕیان پێکراوە. هەربۆیەش بەلگەمان هەیە کە لەو سەردەمەدا تەنها تاکە کەسێك نزیکەی پێنج جۆر مۆری لولەیی بەکارهێناوە لەماوەی نزیکەی تەنها ١٠ ساڵدا. (سەیری وێنەی ژمارە ٧ بکە)

لەپاڵ ئەم جۆرە مۆرە لولەییە سادانە کە لەلایەن چینی هەژاری دانیشتوانەوە بەکاردەهات، هەندێك مۆری لولەیی تر دۆزراونەتەوە کە بەشێوەیەکی زۆر جوان ورێکوپێك لەماددەیەکی بەهێز وگرانبەها دروستکراون. وەك بەردی هیماتایت(بەردی سوور)، ئەم جۆرە مۆرە لولەییانە بە جۆری (رێك وپێك و نایاب) ناسراون.لە باشترین مۆرەکانی ئەم چینە ژمارەیەك مۆری مەلەکین کە لە گرنگترینیان مۆری مەلیکی میتانی ساوشتاتار ـ ١٤٢٠ پ.ز (سەیری وێنەی ژمارە ٣ بکە) ـ مۆری مەلیکی ئارابخا ئیتخی ـ تیششووب کە ئەمەشیان بە ماوەیەکی کەم لەدوای ئەمەی پێش خۆی دروستکراوە. (سەیری وێنەی ژمارە ٥ بکە)

مۆرە لوولەییەکانی کەرکوك تارادەیەك لە رووی هونەرییەوە هاوشێوەیە لەگەڵ مۆرەکانی بابلی و سووریەکان. بەڵام ئەوەی کە مۆرە لوولەییەکانی کەرکوك لەمانە جیادەکاتەوە بریتییە لە شێوازی دارشتن و رێکخستنی وێنەکان لەسەر رووبەری دیاریکراوی مۆرەکە. لە گرنگترین بابەتەکانی سەر مۆرە لوولەییەکانی کەرکوك بریتین لە

١- بوونەوەرە ئەفسانەییەکان (ئەمەش هەندێك بونەوەری ئەفسانەیی دەگرێتەوە وەك ئەو زیندەوەرانەی کە بەشێکیان مرۆڤە و بەشەکەی تریشی ئاژەڵییە).

٢- داری ژیان (شجره الحیاه)، ئەمەش جۆرە دارێکە کە زۆر لایان پیرۆز بووه، بەشی سەرەوەی ئەم جۆرە دارە تا رادەیەك بە دار خورما دەچێت.

٣- بازنەی رۆژی باڵدار (قرص الشمش المجنح) کە ئەمەشیان بەزۆری لەلایەن هەندێك لە بوونەوەرە ئەفسانەییەکان بەرز کراوەتەوە.

٤- دەمامکی عاتوور ـــ Hathor[٩٧]، ئەمەش جۆرە دەمامکێکە کە لەلایەن خوداوەندێکی میسرییەکۆنەکان بەکاردەهێنرا.

٥- ئەبی هۆل ـــ Sphinx [٩٨] ئەمەش جۆرە گیانەورێکی ئەفسانەییە کە لەناو مۆرە لولەییەکان زۆر بەکاردەهات. ئەم گیانەوەرەش سەری مرۆڤە، بەڵام لەشی ئاژەڵە. ئەمەشیان لای میسرییە کۆنەکان زۆر بەکرهێنراوە.



(٩٧) عاتور خوداوەندێکی ئافرەتی میسرییە کۆنەکانە، بەرپرسی فەرمانی جۆراوجۆر بووە وەك (حاکمی ئاسمان و رۆحی زیندووی دارەکان و خوداوەندی خۆشی و سەماو مۆسیقا بووە)،ئەم خوداوەندە لەسەر شێوەی جۆراوجۆر بەدەرکەوتووە وەك (چێڵ، پلینگ، ئافرەتێکی گەنجی بەپێکەنین)، ئەم خوداوەندە پەرستگای لە چەندین شاری میسری هەبووە.

(٩٨) ئەمەش بریتییە لە پەیکەرێکی ئەفسانەیی کە لاشەی ئەم پەیکەرە لە هەندێك بەشی ئاژەڵە زیندووەکان پێکهاتووە، وەك : پلنگێکی باڵدار کە سەرێکی ئافرەتی هەیە، ئاژەڵ کە سەری فرعەونی هەیە، پڵنگ کە باڵی بازی هەیە.... هتد.

شێوەکانی سەر مۆرە لوولەییەکان بەزۆری بەسەر رووبەری دیاریکراوی مۆرە لوولەییەکە بلاۆکراوەتەوە بەبێ ئەوەی ریزبەندکرابن. هەروەها تێبینی دەکەین کە رووبەری مۆرەکە بەشێوەیەکی گشتی بە وێنە و نووسین و زەخرەفەکانی پڕکراونەتەوە بێ ئەوەی هیچ مەساحەیەکی بەتاڵی بەجێ هێشتبێت. (سەیری وێنەی ژمارە (٦) بکە) هەندێك جار رووبەری سەر مۆرەکە کراوە بەدوو بەش. مۆرە لوولەیە ئاشوورییەکان بەتایبەتی ئەوانەی بۆ سەدەی (١٤ پ.ز) دەگەڕێتەوە لە رووی شێوەوە زۆر لە مۆرە لوولەییەکانی کەرکوك دەچن. بەجۆرێك کە هەمان وێنە و شێوەکانی سەر مۆرە لوولەیەکانی خوریەکان لەخۆ دەگرێت. بەڵام ئەوەی کە مۆرە لولەییە ئاشوورییەکە لە مۆری خوریەکان جیادەکاتەوە ئەوەیە کە دابەش کردن و تەرتیب کردنی وێنەکان لەسەر مۆری ئاشووری گرنگییەکی زۆری پێدراوە. دوای ئەمەش جۆرێکی تری مۆری ئاشووری سەری هەڵداوە کە بە مۆرە لوولەییەکانی سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست ناسراون. ئەم جۆرە مۆرەی دوایی هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە مۆرە لولەییەکانی کەرکووك نییە چ لەلایەنی شێوازی پێکهاتە و چ لە لایەنی بابەتەکانی سەر مۆرەکە.

